# دیوانی ئیمامی شافیعی

به‌ کوردی

وه‌رگێڕانی
عزیز ئالانی

بسم الله الرحمن الرحیم



دیوانی ئیمامی شافیعی


**ناوی کتێب: دیوانی ئیمامی شافعی به کوردی**

**وەرگێڕان و لێکۆڵینەوەی: عەزیز ئالانی**

**چاپ: چاپخانەی شڤان - سلێمانی**

**نۆبەی چاپ: یەکەم/٢٠١٤**

**تیراژ: ٢٠٠٠**

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**
**ژمارە (١٢٠٩) ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێ دراوە**

## خوێنەری بەڕێز...!

ئەم دیوانە، تەنها کتێبێکی ئاسایی نیە، بەڵکو ژیاننامە و شیکردنەوەیەکی ئەدەبی و پەروەردەیی وزمانەوانی زاناو سەرمەزهەبێکی گەورەیە، کە ئێمەی گەلی کورد زۆربەمان لەسەر پەیڕەوی ئەو شەرعناسە داناو بیرمەندەگەورەیەین و ئاشنابونمان بەناسینی ژیان و ئەدەبیاتی ئەو زاتە هاوسەنگیەکی باشترمان پێدەبەخشێ، لەبیری داناییانەی ئاینزانی و خوداناسیمان، بۆیە لێرەوە بەسەرجەم خوێندەوارانی کورد زمان ڕادەگەیەنم کە بالەم بەرهەمە پیرۆزە بەهرەمەندبن، هەر لەمامۆستایانی زانکۆکان و پسپۆڕان و موفتی و مامۆستایانی مزگەوتەکان و وتارخوێنەکان و تەکیەو خانەقاکان و سەرجەم مامۆستایان و خوێندکاران و رۆشنبیرو هونەرمەندان و زمانناس و ئەدیب و نوسەران و.... هتد، هەریەکەتان لەجێگەی خۆتانەوە ئەم کتێبە بەنرخە بەیەکتری بناسێنن، تاکو هەموومان پێکەوە لەگەڵ زمانی پڕ لەگەوهەری ئیمامەکەمان (شافیعی) ئاشت و ئاشنا ببینەوە، ماندەربین بۆ ئەوەی  زۆرترین خوێنەری هەبێت، بەتایبەتی لە ڕۆشنبیرانی نوێ و لاوان و گەنجانی گەلەکەمان لەهەردوو ڕەگەزەکە، بیکەنە دیاری بۆیەکتری لەبۆنەو جەژنەکاندا، بیکەنە دیاری بۆ ئەوکەسانەی کەتوانای دابینکردنی ئەم کتێبەیان نی یە، بەکۆمەڵ دابینی بکەن بۆ خێرو بەخشینەوەی بەسەرکەسانی شایستە و کتێب دۆستان و سەنتەرو کتێبخانە گشتیەکاندا، تاکو زۆرترین خوێندەوار پێی ئاشنا ببنەوە. نزای خێریش بۆ هەموولایەکمان بکەن.

## چۆن لەم دیوانەدا ئەو هۆنراوەیە بەئاسانی دەدۆزیتەوە کە دەتەوێت؟

بۆ ئەم مەبەستە ڕێگایەکی ئاسانمان داناوە کەلە شێوەی فەهرەستێکی پیت بەند دایە، لەبەشی کۆتایی ئەم کتێبەدا، بفەرموون بەخوێندنەوەی و خۆڕاهێنان لەسەر چۆنیەتی دۆزینەوەی هۆنراوەی مەبەست.

# پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس و ستایشی نەبڕاوە و هەردەمی بۆ خودای بەخشندەی میهرەبان، درووود و سڵاوی ئەو خودا تەنها و دلۆڤانە بۆ سەر گیانی پاك و بێگەردی حەزرەتی محمد (د.خ) و یارو یاوەرانی بە گشتی.

بارانی بەزەیی و سۆز و لێبوردەیی خودای میهرەبان بڕژێت بەسەر گیانی محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی دا.. کە ژینی بۆ دین و دینی بۆ ڕەزامەندی خودا بوو، هۆش و ژیری، قەڵەمی دەست و بیری کردە قوربانی بۆ خزمەتی پەیامی بەرزی یەزدانی، تەمەنی منداڵی و ناسکی خۆی بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکان تەرخان کرد، هەرەتی گەنجی و لاوی دانا بۆ فێربوونی زانست و زانیاری، سەرجەم ئەو تەمەنەی تری لە خزمەتی فیقه و زانست و بانگوازی و خواپەرستی و وانە گوتنەوە و ڕێنمایی دا بەسەر برد، ئەو زاتە منداڵێکی نازداری بێ باوکی زرنگی خێزانێکی هەژار و کەم دەرامەت بوو، لە ڕۆژێکی پیرۆزدا لەدایك بوو، لە شەوێکی پیرۆزدا کۆچی دوایی کرد، گەنجینەو سامانێکی گەورەی بۆ مرۆڤایەتی لەدوای خۆی بەجێهێشت لە فیقه و زانست و ئەحکام و لێکدانەوەو پێوەر و لۆژیك و حیکمەت و زمانەوانی و ئەدەب و گەلێك بابەتی تر، ئەو کەسێك بوو زۆر بە قووڵی لە واتای ژیان و گەردون و ڕۆژگار و سروشتی مرۆڤ و خودا و زانست و پەیام و ژیانداری و ڕۆشنگەریی و ڕابردو و ئێستا و داهاتوو تێگەیشتبوو، بەڵگەشمان ئەوەیە کە تاکو ئێستا ڕاو بۆچوون و ڕاڤەکانی لە چوارچێوەی پەیڕەوەکەیدا (پەیڕەوی شافیعی) لەناو هەموو موسوڵمانان دا لە شەشدانگەی جیهاندا کاریگەری گەورەی هەیە، هاوکات زەین و هزری ئەدەبی و هۆنراوەکانیشی لە هیچ سەردەم و چاخێکدا کۆن نابن و دەڵێی بۆ ئەو سەردەمە نوسراون کە تیایدا دەخوێنرێنەوە، هۆنراوەکانی ئەو زاتە بەرزە چێژی تایبەتی دەبەخشێ بە هەموو جۆرە مرۆڤ و ئاستە جیاوازەکان، هەر کەسەو بەشی خۆی لێیان بەهرەمەند دەبێ، هەر لە کەسانی نەخوێندەوارەوە تا دەگات بە کەسانی زۆر پلە بەرز لە ئاستی

زانسته جۆراوجۆرەکان، هۆنراوەکـانی پـڕن لـه داهێنـانی زمانـەوانی و ڕەوانبێـژی و وشەسـازی و ڕسـتەزانی و حیکمـەت و وردەکـاری کـورت و چـڕ و پوخـت و سـادە، سەرچاوەی هەریەکە لە هۆنراوەکانیشی چەمکی هزری عەقیدەی ئیسلام و قورئـانی پیرۆز و فەرموودەکانی حەزرەتی محمده (د.خ).

ئەو زۆر بە شێوەیەکی زانایانە و هۆش و ژیریەکی کراوەو ئازادانەوە دەڕوانێتـە گـەردون و کـات و پێکنـەرەکانی گـەردون و ڕەوتـی گـوزەران و واتـا قوڵـەکانی خوداناسی و عیرفان و فەلسەفە و بارە دەرونی و لۆژیکیەکانی مرۆڤەکان و ناسـینی ناخی ئادەمیزادەکـان، لـە نـاوەڕۆکی ئیسـلام بەباشـی تێگەیشـتووە و ویسـتویەتی لەوپەڕی باشی و پاکیشدا بیگەیەنێ بە نەوەکانی ئایندە.

بۆ خۆی هـەتا بڵێـی کەسێکی زرنـگ و زیـرەك و بـاش پـەروەردەکراو و دانـا و حەڵاڵ خۆر و هیمەت بەرز و بێ فیـز و خزمـەتکاری ئـەم ئاینـە بـەرزو پـیرۆزە بـوو، هاوکـات بـە تـەواوەتی خـۆی تـەرخان کـرد بـوو بـۆ گۆشـکردنی ڕۆحـی خـۆی و خوداپەرستیەکی دڵسۆزانەی نەپساوە، سەرنجێك لـە ژیـانی ئـەو زاتـە بـدە و بزانـە ئـاخۆ چـۆن کاتـەکانی بەشـی کارەکـانی کـردووە، ئـەو لـەدوای نوێـژی بەکۆمـەڵی بەیانیـەوە نەخـەوتووە و بـە چـەندین گـروپ وانـەی وتووەتـەوە و هەمیشـە کـۆڕی دەرسی پڕ لە خەڵك بووە، تا هەتاو کەوتن و ئینجا تا چێشتەنگا و پاشان تا نزیکی نیوەڕۆ، بە هەمان شێوە عەسر و شەوانیش، کە گەلێك شەو تا بەیانی نەخەوتووە.

هەموو مانگێك شەست جار قورئانی پیرۆزی لە نوێژدا خەتم کردووە، زیکرەکان و سوننەتەکانی وەکو خۆی جێبەجێ کردووە، کتێبی گەورەی (الموطأ)ی هـەمووی لەبەر بووە، هەزاران فەرموودەی پێغەمبەری نازداری د.خ لەبەربووە، ئەمە جگە لـە سەدان پارچە هۆنراوەی جوان، وێڕای ئەمانـەش خـەریکی نوسـینی فیقـه و زانسـت بـووە، سـەردانی زانایـانی کـردووە، نەخۆشـەکانی بەسـەر کردووەتـەوە، سـەرقاڵی کاروکاسبی و بژێوی خۆی بووە، هەزاران گرفت و کێشەی کۆمەڵایـەتی و شـەرعی و یاسایی و میراتی و فەتوای چارەسەر کردووە. ئەمانە و چەندین ئەرك و کاری بەجێ

هێناوە، ئایا چۆن فریاری ئەم هەموو کاروبارانەی کەوتووە، ئەگەر خوای گەورە پیت و بەرەکەتی نەکردبێتە کاتەکانیەوە..؟

لە ڕاستیدا پێشەوا شافیعی (خ.ل) شاعیر نەبووە و پێشی خۆش نەبووە کە وەك شاعیر بناسرێت، ئەویش لەبەرئەوە بووە کە زۆربەی شاعیرانی پێش سەردەمی خۆی و هاوسەردەمی خۆیشی شیعریان بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان و ململانێی ئەدەبی و سنگ دەرپەڕاندن و پیاهەڵدان و ملشکان و شەڕە جنێو و دەمارگیری و ئەوین بەکارهێناوە، واتا جەوهەری شیعری ڕاستەقینەیان شێواند بوو، بەڵام ئەم زاتە وەك کارێکی لاوەکی ناو بەناو شیعری فەرمووە بۆ دوو مەبەست:

یەکەم: تا نیشان بدات کە ئەگەر بیەوێ شاعیر بێ، ئەوا توانایەکی گەورەی ئەدەبی و وەستایی شیعری تێدایە و دۆش دانامێنێ لە ئاست ئەو بلیمەت و شاعیرە گەورانەی کە لە پێشووتر یان لەسەردەمی خۆیدا هەبوون.

دووەم: ئەو زاتە بەرزە هەموو شتێکی وەك هۆکارێك سەیر کردووە بۆ گەیاندنی ئامانجێکی زۆر بەرز و گەورە، کە ئەویش فیکر و فیقه و زانستە بەرزەکانە، بە بەرەی مرۆڤایەتی لە هەموو چاخەکاندا، ئەکرێ ئەدەب و هۆنراوە و زمانپاراوی و ڕەوانبێژی و تێکستی ئەدەبیش هۆکار و ڕێگەیەك بن بۆ گەیاندنی ئەو پەیامە بەو کەسانەی بەو زمانە ئاشنان و لەو ڕێگەیەوە تێدەگەن یان چێژ وەردەگرن، واتا ئەو کەسانەیشی پەراوێز نەکردووە و ویستویەتی هانیان بدات تا ئەوانیش کار بکەن بۆ گێڕانەوەی مانای ڕاستەقینەی هۆنراوەو شێوازی بەکارهێنانێکی ڕاست و دروست و لەوانە نەبن کە هەر قسە بکەن و جێبەجێی نەکەن، لەوانە نەبن کە تەنها لایەنی وشك و فیزیکی شیعر و تەکنیکی هۆنراوە بنوسن و هەر ڕۆژەی لە دۆڵێکدا بن، بەڵکو دەبێ پێش هەموو شتێ شاعیرەکان خۆیان هەڵگری پەیامێکی ڕاستی باوەڕداری بن و بە کردەوەش ئەو بیرە پاك و بێگەردەیان جێبەجێ بکەن کە لە چوارچێوەی هۆنراوەو پەخشان و نوسینە هونەریەکانیاندا وێنایان کردووە.

سەبارەت بەم کارە کەموکورتەیشم کە وەرگێڕانی دیوانی شافیعی یە (خ.ل) بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی، بە پێویستی دەزانم هەندێ زانیاری بخەمە خزمەتی خوێنەران.

لە ساڵی ٢٠٠٦ دا برای شیرینم کاك (ئەندازیار عثمان) پێی وتم کە خەریکی نوسینی کتێبێکە، کە کورتەیەك لە هەڵوێست و ژیاننامە و نمونەی بەرهەمەکانیانی تێدایەو یەکێك لەوانەش پێشەوا شافیعی یە، کە نموونەیەك لە شیعرەکەی دادەنێتەوە، بەڵام نایەوێت کە بە دەقە عەرەبیەکە بێت، بۆیە داوای لێکردم کە ئەگەر بتوانم بیکەمەوە بە کوردی و بە شێوەی هۆنراوەش بێت، منیش داچڵەکیم و لە دڵی خۆمدا بە خۆم گوت جا تۆ بڵێی بەندە لە ئاستی وەرگێڕانی هۆنراوەیەکی ئەو زاتە بەرزەدا بم، کە وشەبەندانی ڕشتەی زێڕینی ئەو چەندین فەرهەنگی دەوێ؟! پێم گوت: بە پشتیوانی خوا هەوڵی تەواو دەدەم، بەڵام ئەگەر نەمتوانی ئەوا نەتوانین بۆ منە و لێبوردن بۆ تۆ، سوپاس بۆ خوا بە ماوەیەکی کەم ئەوەی لێ دەرچوو، کە ئێستا زۆربەی خەڵکی لەبەریەتی:

تێشووی سبەینێت هەڵگرە

کە ڕێبواری سەر سەفەری

بەس دنیا بدە بە کۆڵــــتا

کە نازانی بۆ کوێی بەری.... هتد

پاشان کاك عثمان کتێبەکەی خۆی چاپ کرد و پەخشکرا، دوای دوو ساڵ وڵاتی ئێران لە هەرێمی کوردستان پێشانگایەکی کتێبی هەمە بابەتی نێودەوڵەتی کردەوە، ئەو کەسانەی کە کتێبی زۆریان کڕیبوو، بە دیاری تابلۆیەکی جوانی ئەو هۆنراوەیەی شافیعیان (خ.ل) پێشکەش کردبوون، کە لە بنەڕەتدا ئەو کتێبە نوسخەی دوای پەخش گەیشتبووە ئێران و لەوێ ئەو هۆنراوەیەیان لێ دەرهێنا بوو، کردبوویانە ئەو تابلۆیە، ئەگەرچی بەداخەوە هەندێ دەستکاری کرابوو، خودا پاداشتیان بداتەوە، لەبەرئەوە لە ساڵی ٢٠١٣ جارێکی تر هەمان تابلۆمان بە شێوە ڕاستەکەی چاپ کردەوە، چونکە زۆربەی خەڵکی و مامۆستایان و ئەدەب دۆستان و

ڕووناکبیران لەبەریانکردبوو. جگە لەوەش کراوەتە سرودیش، بەمە بۆم دەرکەوت کە خوشـک و برایـانی کـوردم، تامـەزرۆی هۆنراوەکـانی پێشـەوا شـافیعین (خ.ل). لەبەرئـەوە بڕیارمـدا هـەوڵ بـدەم بـە پشـتیوانی خـودا دیوانەکـەی بەتـەواوەتی وەربگێڕمـە سـەر زمـانی کـوردی و لـە لاپـەڕەی بەرانبەریشـدا دەقـە عەرەبیەکـەی دیوانی یەکـەمیان وەکـو خـۆی بنووسمـەوە، تـاکو کەسـانی شـارەزاو خوێنـدەوار و زمـانزان لـەو کەموکورتیانـەم ئاگـادارم بکەنـەوەو لـە چـاپەکانی داهـاتوودا ڕاسـتی بکەمەوە.

لێرەوە سوپاسی بـرای ئـازیزم مامۆسـتا (عبـدالله نجـم الـدین طـه) دەکـەم کـە نوسخەیەکی عەرەبی دێرینی دیوانی شافیعی پێدام کە لـە سـاڵی ١٩٧١ چاپکراوەو لەلایەن (محمد عفیف الزعبي) کۆکراوەتەوەو لە هەموو دیوانەکانی تر زیاتر جێگـەی متمانەیە، بەندەش ئەو دیوانەیم کردووە بە کـوردی، بـەڵام هاوکـات کۆمـەڵێکی زۆر هـۆنراوەی تریشـم لـە دیـوانی دووەم داناوەتـەوە کـە لـە سـاڵی ٢٠٠٤ لـە دیمەشـق چاپکراوە و مامۆستا (مختار فوزي) کـۆی کردووەتـەوە و پێشـەکی و پـەراوێزی بـۆ داناوە، شایانی باسە هەندێ هـۆنراوە لـەم دیـوانی دووەمـەدا هەیـە کـە هـەرگیز لـە هـۆنراوەی ئیمـامی شـافیعی ناچـن و دراونەتـە پـاڵی، هـەروەکو مامۆسـتا (مختـار) خۆیشی دیاری کردوون و حاشایشی لێ کردون و دایشیناونەوە، بەڵام بەندە ئەوانـەم دانەناون کە گومانیان تێدا بەدی دەکەم ئەگەرچی وەکو دەق جوانیشن.

سەبارەت بە وەرگێڕانی تەواوی دیوانی شافیعی یان تـاکو تـەرای هۆنراوەکـانی بـۆ سـەر زمـانی کـوردی، دوور نیـە نـاو بـەناو مامۆسـتایان، وەرگێڕەکـان، وتارخوێنەکان، نوسەران... هتد یەك یـەك و دوو دووی هۆنراوەکانیـان وەرگێڕابێتـە سەر زمانی کوردی و لە مەبەستەکانی خۆیاندا بەکاریان هێنابن، بەڵام ئەوەی کە بە شـێوەیەکی دیـار و ئاشـکرا لـە چوارچـێوەی کتێبێکـدا بـەناوی (دیـوانی ئیمـامی شافیعی) چاپکراوە و مـن دیتومـە، تـەنها وەرگێڕانەکـەی (مامۆسـتا مـەلا ڕەسـوڵی عەتوفی سەردەشتی بیشاسپی بریاجی)یە، کە نازناوەکەی (تـۆراو)ەو ئـەو کتێبـەی لە دوو توێی (١٧٠) لاپەڕەی مامناوەندی دایەو لە ساڵی ١٣٧٨ی هەتاوی بە تیراژی

(١٠٠٠) دانـه لـه چـاپخانەی (ئایـنـدە) چـاپكراوە لـه (انتشـاراتی كوردسـتان)ی خۆرهـەلات، كـه لـەدوای دانـانی دوو (قصـیدة)ی خـۆی وتبێنـی و پێشـەكیەك و كورتەیەكی ژیاننامە و ناساندنی شافیعی و دیسانەوە دانانی (قصیدة)یەكی تـری خۆی هۆنراوەكانی ئیمامی شافیعی (خ.ل) وەرگێڕاوەتە سەر زمانی كوردی، شێوە زمانی سەردەشتی، كه پێویسته ئەم زانیاریانە دەربارەی وەرگێڕانەكەی مامۆستا (عەتوفی) بزانین، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە:

١- وەك خۆی لە پێشەكیەكەیدا، ئاماژەی پێداوە، تەنها ئەو دیوانەی وەرگێڕاوە كە مامۆستا (محمد عفیف الزعبی) كۆی كردووەتـەوە بـه عـەرەبی و لـه سـاڵی ١٩٧١ چاپكراوە و سودی وەرنەگرتووە لە دیوانە چاپكراوە و كۆكراوەكانی تر.

٢- وەك خۆی نوسیویەتی، شێوەی وەرگێڕانەكەی، وەرگێڕانـی چـەمكی یـە، نـەك دەقـاو دەق، واتــه دەقــه عەرەبیەكـەی خوێندووەتــەوە و چــی و چــۆن لێــی تێگەیشتووە، ئەو لێكتێگەیشتنەی لەلایەن خۆیەوە كردووە بە هاوتای عەرەبیەكە، ڕاستە دێڕ بە دێڕی دەقە عەرەبیەكەی داناوەتەوەو لەژێریدا كوردییەكەی نوسیوە، (وەك تێكهەڵكێشی ڕووبەڕووی هەردووك زمانەكە)، بـەڵام مـەرج نیـە ژمـارەی دێـڕە كوردیەكان بە هێندەی ژمارەی عەرەبیەكان، یان كوت و مت هاو وشە بێت، بـەڵكو هەمیشە ژمارەی دێڕە كوردیەكان زۆر زیاترە لە عەرەبیەكان، هەر بەڕێزی ئامـاژەی بەوەش داوە كە ویستویەتی واتای بگەیەنێ نەك تێكستە عەرەبیە وشەییەكە.

٣- پـەراوێز و فەرهـەنگۆكی بـۆ وشـە نامۆكـان دانـەناوە و لـەبری ئـەوە هـۆنراوە كوردیەكەی درێژ كردووەتەوە، تاڕادەیەك دانـەنانی ئـەو پـەراوێزە، هەنـدێ نـامۆیی داوە بـە كتێبەكـە، بەتایبـەتیش لـەو ڕووەوە كـە تـەنها شـێوەزاری سەردەشـتی (ئالان)ی تێدا بەكار هێنـاوە، كـە ڕەنگـە بـەلای منـەوە، یـان خـەڵكی ئـەو دەڤـەرە ئاسایی بن، بەڵام بۆ كۆی گشتی خوێندەوارانی كورد، یان خوێنـەوارانی ئـەو كتێبـە هەندێ گران بێت.

٤- ژیاننامـەی ئیمـامی شـافیعی (خ.ل) زۆر بـە كـورتی هێنـاوە، كـە تەنانـەت لـە سەرچـاوە عەرەبیەكەیشـی كـورت كردووەتـەوە، ڕەنگـە وەك وەرگێـڕان لای كـەم

پێویست بوو، وەرگێڕانی تەواوەتی دەقە عەرەبیەکەی بهێنایە، باشتر بوو کە بە ناوهێنانی لە سەرچاوەی ترەوە ژیاننامەیەکی ڕوونتری کۆبکردایەتەوە، وە ئەگەر نا، تەنها تێکستە عەرەبیەکە.

بەهەرحاڵ (إنشاءالله) پاداشتی گەورەی خۆی لەلای پەروەردگار وەردەگرێتەوە، گرنگ ئەوەیە بە نیازی پاك و ناخی پاکی خۆیەوە هەوڵی داوەو بووەتە خاوەنی یەکەمین وەرگێڕانی دیوانی شافیعی بۆ سەر زمانی کوردی، خوای گەورە پاداشتی بەرێزیان و ئێمەش بداتەوە.

دەربارەی وەرگێڕانەکەی بەندەش، کە کەم و کورتیی تێدایە، ڕەچاوی ئەم خاڵانەم کردووە:

١- سەرچاوەکەم دوو دیوان بووە، دیوانی یەکەمیان لە کۆکردنەوەی (محمد عفیف الزعبی)یەو ئەوی تر هی (مختار فوزی النعال)ە، بەلآم بەتایبەتی پشتم بە یەکەم بەستووە، کە لە گومان دوورترە.

٢- هەریەکە لە هۆنراوەکان ژمارەیەکی تایبەتی بە خۆیم داوەتێ، بەلآم مەرج نیە هەمان زنجیرەی ڕیزبەندی عەرەبیەکە بێت.

٣- لەلاپەڕەی لای ڕاست دەقە عەرەبیەکەم بە ڕێنوسی ڕاستی عەرەبی و سەروبۆری خۆیەوە داناوەتەوەو لەلاپەڕەی بەرانبەریشی وەرگێڕانەکەیم داناوە، بۆ دیوانی یەکەمیان. بەلآم بۆ دیوانی دووەم ئەوەم بە پێویست نەزانی، لەبەر گەورەبوونی قەبارەی دیوانەکە و تێچوونی نرخەکەی. خوێنەران دەتوانن لەگەڵ دەقە عەرەبیەکە بەراورد بکەنەوە.

٤- بەر لە نمایشی دەقە کوردیەکە، سەرەتایەکم بۆ چوونە ناو هۆنراوەکە و ڕاڤەی نوسیوە.

٥- بۆ وشە نامۆ عەرەبی و کوردیەکان لە پەراوێزی لاپەڕەکەدا ڕاڤە و فەرهەنگۆك هەیە، کە بۆ دانانی ئەوەش سوودم لە دەیان فەرهەنگی عەرەبی و کوردی و فارسی وەرگرتووە.

٦- لـه هونـەری وەرگێڕانەکـەدا هـەوڵم داوە کـە وشـە بەرانبـەری وشـە و دێـڕ بـە قەدەری دێڕ بێ، مەگەر هەر دەرفەت نەبوو بێ کەم و زیادێك هەبێ، ئـەوەش لەبـەر خاتری گەیاندنی واتاکەیە.

٧- هۆنراوەکانی شـافیعی (خ.ل) وشـەکاری و ڕەگـەزدۆزی و لێچـوون و لێکچـوونی ڕەوانبێژی تێدایە، هەوڵم داوە کەم تا زۆر بە جۆرێك لە جۆرەکان لە وەرگێڕانەکـەدا ئەوانەش بپارێزم و یان هاوتا، هاوشێوەیەکیان بۆ دابنێم.

٨- مەرج نیە قافیەی کوردیەکە، یان بڕگەکانی کوت و مت وەکو عەرەبیەکـە بێـت، بەڵکو ویسـتومە لایـەنی سـپاردەی زمانەکـە و واتـا و وشـەبەندی و ڕەوانبێژیەکـەی بەپێی توانا بپارێزم، جا ئەگەر بەوە هەندەسـەی شـێوەی شـێوا بـێ، زیـانی نیـە و کردوومە.

٩- هەوڵم داوە شێوە زمانێکی تایبەتی کوردی بەکارنەهێنم، بـەڵکو کـام وشـەم بـە شیاوی هاو واتا عەرەبیەکە زانیبێ دامناوە و گـوێم نەداوەتـە سـنووری دیالەکتیکـە کوردیەکە، بەڵام لە باری پێویستتدا ڕوونکردنەوەم لە پەراوێزدا داوە.

بەهەرحاڵ ئەم وەرگێڕانەی بەندەش بێ کەم و کورتی نیە و سوپاسی هـەر بـەڕێزێك دەکەم کە لە باری ڕاستی هەڵەکانم ئاگادارم بکاتەوە تاکو لە چاپەکانی داهـاتوودا، بە پشتیوانی خوای گەورە، ڕاست و ڕەوانتر پێشکەشی خوێنەرانی بکەین، سـوپاس بۆ خوا کە لە دوای سێ ساڵ توانیم ئەم بەرهەمە پێشکەش بـە کتێبخانـەی کـوردی بکەم، خوای گـەورە لێمـان وەربگرێـت و چـاوەڕوانی نـزای خێرتـانین. سـوپاس بـۆ سـەرجەم ئەوکـەس و لایەنانـەی کـە هانـدەرو هاوکـارم بـوون بۆتـەواو کردنـی ئـەم پرۆژەیـە، بەتایبـەتی ناوەنـدی ڕاگەیانـدنی ئـارا، چـاپخانەی شـڤان کـە ئـەرکی لـە چـاپدانی ئـەم بەرهەمـەیان گرتەئەسـتۆ، کـاك محمـد سـپیدارەیی ، کـاك ئـازاد شانەخسێیی، هیوادارین نمونەیان زۆربێت.

عزیز ئالانی

٢٠١٣/١١/٢٣

# پێشەکی الزعبی

الحمدلله رب العالمین، والصلاة والسلام علی سید المرسلین محمد، أفصح العرب لساناً، وأبلغهم بیاناً، وعلی آله و اصحابه، وأتباعه الی یوم الدین.

له پاشان، ئەم کتێبە ڕاسترینی هۆنراوەکانی (ئەبی عەبدوڵڵا محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی) یە (خوای گەورە لێی ڕازی بێت)، ئەم زاتە نەتەوەیەکە پڕیەتی لە کۆی جۆرەها زانست و ئەدگاری چاك و چاکەکاریی، کە ئەمانە لە کەسانی دیکەدا کەم و دەگمەن بەدی دەکرێن، زمانە پاراوەکەیشی وای لێکردووە کە بووەتە جێی ڕەزامەندی خەڵکی، بە باس و خواستە سەنگینەکانی توانیویەتی دەرگای بەڵگەداریی و بروبیانوی نەیارانی کڵۆم بکات، زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی بەڵگە نایابەکانی خۆی لە بەرانبەر ڕکابەرانیدا نمایش کردووە، بەڕاوبۆچوونەکانیشی دەرگا داخراوەکانی (ژیری و ئەدەب)ی فراوان والآتر کردووە.

لە زەین و یادگەیدا (بە شێوازێکی سەرکەوتووانە) هەڵبەست و هۆنراوەی گاڵتەجاڕانی (بەناو شاعیران)ی ڕاست کردوەتەوە، لە تەرازوویەکی هاوسەنگی ئەو زەینە بێگەردەیەوە هۆنراوەی داڕشتووە، لە چەشنایەتی دەربڕینەکەیشیدا (هێندە تۆکمەیە) کە زمانزانەکان زمانپاراویی و لۆژیك و شێوازی ئەو دەکەنە بناغە و پشتی پێ دەبەستن.

کاتێك هۆنراوەیەکی دەنوسی، ئەفسونی جوانیگەرایی دەڕژایە جەوهەر و ناخی یەوە، چۆن تێڕژانێك..! لەوپەڕی ڕاست و دروستیدا..، لە کانی ڕوونی زمانیەوە سەراسیمەی ڕەوانبێژی هەڵدەقوڵا، حیکمەتی لێ دەهاتە گۆ، وشەکانی شیرین، نەرم، سازگار بوون، وەکو دوڕ وشەبەندانی واتاکانی پەخشان .. پەخشان.. دەدرەوشانەوە، بە پلوسکی قەڵەمەکەیدا هەڵدەچۆڕان، ئیرەییان بە پێشبڕکێی یەکتری دەبرد لە نیگا بەندی ئەندێشەکانیدا، (ئەندێشە و بیرۆکەکانیشی) تاجێك بوون لە دوڕ بۆ ڕێکخەرەکەیان، سەرەنجام بە کۆی ئەوانە ئەم دیوانە هۆنراوەیەی لێ بەرهەم هات، کە دیوانی پەیمانی ڕەوانبێژی و هەنگوینی دەربڕین و داهێنی حیکمە و لاپەڕەی ئامۆژگاری و ڕێنمایی.

## کارکردنم لەم دیوانەدا:

کاری سەرەکیم بریتی بوو لە کۆکردنەوەی ئەو هۆنراوە پەرش و بڵاوانەی کە بە هۆنراوەی (ئیمامی شافیعی) ناسراون لەناو جەرگەی کتێبە هەمە جۆرەکاندا، بەتایبەتیش ئەم کتێبانە:

(المحمدون من الشعراء)ی (القفطي).

(حلية الأولياء و طبقات الأصفياء)ی (الأصفهاني).

(معجم الأدباء)ی (ابن خلكان).

(البداية و النهاية)ی (ابن كثير)، هەروەها گەلێك کتێبی تری دانراو و وەرگێڕاو.

ڕاگیرە (اسناد)ی زنجیرەی زارەوزار گێڕانەوەی هەندێ لە هۆنراوەکانم لابردووە (کە پێویست نەبوون) و ئەوانەیشم هێشتوونەتەوە کە بە پێویستم زانیون، چیم بەردەست کەوتووە لەسەر ڕیزبەندیەکەی ئەو دیوانەی کە (مامۆستا زوهدی یکن) کۆی کردووەتەوە دامەزراندون، دواتر بەراوردم کردووەتەوە لەگەڵ دیوانەکەی پێشووتردا، بە کەمێك دەستکاریەوە، کورتەیەك لە ژیاننامەی (شافیعی)م بۆ نوسیوە و سەرو بۆر و لایەنی ڕێنووسەکەیشم بە وردەکاریەوە داناوە بۆ سەر ناو و هۆنراوەکان، بەو نیازەی کە ئەم دیوانە هاوتای نایابیانەی خۆی بێ لە ڕووی چەشن و ڕوکار و ناوەڕۆکی ڕستەسازی و وشە بەندی یەوە.

## لێکۆڵینەوەیەکی خێرای ئەم هۆنراوانە:

ئێمە دوای ئەم وتانە، ئەگەر سەرنجێکی خێرای هۆنراوەکان بدەین، دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە ناکرێت هەموویان هۆنراوەی شافیعی بن، هەرگیز شتی وا بە زمانماندا نایات، خۆی دەفەرموێ لە ناخی دڵمەوە حەز دەکەم ئەو زانیاریانەم بە هی من لەقەڵەم نەدرێت، هەر زانیاریەکیش لە دڵمدا بووە دەخوازم کە لەناخی هەریەکە لە ئێوە دابێ و بەتەنها نەدرێتە پاڵ من وماڵی من نەبێ، هونەری حیکمەت و خۆدانەدەست قەدەری خوایی لە شافیعی دا (خوا لێی ڕازی بێت) بەهاو متمانەیەکی گەورەی هەیە، ماندانەکەیشی بۆ کرانەوەو فێربوونی زانستەکان و

بەخشینی بەتایبەتیش لە کەسێکی وەکو (شافیعی)یەوە کە ئەزموونی لەگەڵ دنیادا فراوانە و تاڵ و شیرینیەکانیشی چەشتووە، لەو دنیا پڕ لە گرفت و کێشانەدا بە سەرکەوتوویی دەرباز بوو، تیشکێکن بۆ زۆربەی گرفت و کێشە هاوچەرخەکانی ئێستای ئێمە، بەتایبەتی دەمانخاتە ناو ئەوانەوە کە نەخوازەڵا مەبەستمانن، یان ئازارمان دەدەن.

لە هۆنراوەکانیدا هەست بە دوورییەکی (جیاوازیەکی) زۆر دەکەین لەنێوان هۆنراوەکانی و هۆنراوە پڕ لە کەم و کورپییەکانی زۆرێك لە شاعیرانی تر لە ڕووی بێ بەها کردنی هۆنراوە بەو شتانەی کە شایستەی بەهۆنراوە کردن نین.

لە دیارترین خەسڵەتەکانی هۆنراوەی شافیعی ئەمانەن: هاندان و گەشتپێکردنی هزر و دەروونی مرۆڤ بەرەو زانست و زانیاری، پەند وەرگرتن لە ڕۆژگار و چاخ و سەردەم و بەدوایەکدا هاتنی شەوو ڕۆژ و واژبوونەوەی ڕووداوەکانیان و بەرزبوونەوەی بەرەو بڵندیی ڕەوشتە بەرزەکان و پلەکانی تەواوکاریی کەسێتی مرۆڤ.

سا خوایە گیان ئەم کارەم وەربگرە، وەك کارێکی تایبەت بە ڕەزامەندی خۆت و لای خۆتەوە (لە هەردوو دنیادا) شاد و بەختەوەرم بکە، ببێتە مایەی سوود پێگەیاندنم لەو ڕۆژەدا کە دەگەڕێمەوە بۆ لای خۆت، کە لەو ڕۆژەدا ﴿لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ، إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾.

محمد عفيف الزعبی

٢٤/محرم/١٣٩١ك

٢١/ئازار/١٩٧١ز

# کورتەیەك لە ژیاننامەی
# پێشەوا شافیعی (خوا لێی ڕازی بێت)

## ناوی تەواوی:

ناوی (محمد)ی کوڕی (ئیدریس) کوڕی (عباس) کوڕی (عثمان) کوڕی (شافع) کوڕی (سائب) کوڕی (عبید) کوڕی (عبد یزید) کوڕی (هاشم)[1] کوڕی (عبدالمطلب) کوڕی (عبدمناف) کوڕی (قصی) کوڕی (کیلاب) کوڕی (مرّة) کوڕی (کعب) کوڕی (لؤي) کوڕی (غالب)ی کوڕی (فهر)ی کوڕی (مالك)ی کوڕی (نضر) کوڕی (کنانة)ی کوڕی (خزیمة)ی کوڕی (مدرکة)ی کوڕی (الیاس)ی کوڕی (مضر)ی کوڕی (نزار)ی کوڕی (مَعدّ)ی کوڕی (عدنان)ی کوڕی (أُدّ)ی کوڕی (أُدَدْ)ە.

## هاتنە دنیای:

ئەم زاتە بەرزو پایەدارە، بۆ خۆی ئاوا باسی لەدایکبوونی خۆی دەفەرموێت: "لە (غەززە)[2] لەدایك بووم، ساڵی (١٥٠)[3] کە هەر ئەو ڕۆژە (أبی حنیفة) کۆچی دوایی کرد، خەڵکی دەڵێن: پێشەوایەك کۆچی دوایی کرد و پێشەوایەك لەدایك بوو. لە تەمەنی شەش ساڵیمدا دایکم بردمی بۆ شاری مەککە، دایکم لە (أزد)ەکانە".

---

(١) ئەم (هاشم)ە، ئەو هاشمە نیە کە باپیرە گەورەی پێغەمبەرە ﷺ، ئەویان (هاشم) کوڕی (عبد مناف)ە ئەم هاشمەیان برازای ئەویانە.

(٢) غەززە، شارێکی فەلەستینە، ئەوسا گوندێك بووە.

(٣) واتە ساڵی (٧٣٠)ی زاینی.

## گەشەکردنی و گەڕانی بەدوای زانستدا:

(زبیر)ی کوڕی (بکار) لە (مصعب)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (زبیر)ەوە کە مامی خۆیەتی دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: چووم بۆ یەمەن، لەوێ (محمد)ی کوڕی (ادریس)ی (شافیعی)م بینی کە سەرقاڵی هۆنراوەو ڕێزمانی عەرەبی و ڕەوانبێژی بوو، دەڵێت: منیش پێم گوت: تاکو کەی خەریکی ئەو بابەتانە دەبیت؟ ئەگەر خەریکی زانستەکانی فەرموودەو فیقهی ئیسلامی بویتایە، بە نمونە دەهێنرایتەوە، لەگەڵ خۆمدا بردم بۆ شاری مەدینە و ناساندم بە پێشەوا (مالك کوڕی ئەنەس) و پێم ڕاگەیاند کە فێری زانستی بکات و چاودێری بکات، مامم دەڵێ: ماوەیەکی کەم لەلای (مالك) مایەوە و لە خزمەتیدا گەلێ زانست و زانیاری فێر بوو، هەر لەو ماوە کەمەدا هەموو شێخەکانی شاری مەدینەی ناسی و لەگەڵیاندا دانیشت، دوای ئەوە بەرەو (عێراق) بەڕێ کەوت و هاتە خزمەتی (محمد)ی کوڕی (الحسن)و دوای دوو ساڵ گەڕایەوە بۆ مەدینە، دەڵێت: لەگەڵیدا چووم بۆ شاری (مەککە) و لەلای (ابن داود) قسەی خێرم بۆ کرد و باری گوزەرانیشیم بۆ ڕوون کردەوە، فرمانی کرد کە هەزار درهەمی بدرێتێ.

هەروەها (ئابری) کە (أبو الحسن)ی کوڕی (ابراهیم)ی کوڕی (عاصم)ی ئابری (سەجزی)[1] ناسراوە، دەڵێت: گوێم لێ بوو کە (أبا اسحاق ابراهیم)ی کوڕی (محمد)ی کوڕی (المولد الشرقي) لە زمانی (زکریا بن یحی البصري) دەگێڕێتەوە، ئەویش لە (زکریا النیسابوري)یەوە، هەردووکیان لە (ربیع)ی کوڕی (سلیمان)ەوە ئەم بەسەرهاتە دەگێڕنەوە، کەلە هەندێ گێڕانەوەدا شتی تریشی بۆ زیاد کراوە، دەڵێت: گوێم لێ بوو کە (شافیعی) فەرمووی: من لە حوجرە بووم، گوێم لێ بوو کە مامۆستاکە ئایەتێکی بە منداڵێك دەگوتەوە، من لەلای خۆمەوە لەبەرم کرد، بەر

---

(١) ئابری: واتە خەڵکی شاری (ئابر)، سەجزی واتە خەڵکی هەرێمی سەجستان.

لەوەی مامۆستاکەم نوسینەوەی وانەکە [1] تەواو بکات من لەدوای ئەوەوە سەیری دەستیم دەکرد و لەبەرم دەکرد، ڕۆژێکیان مامۆستاکەم پێی گوتم: پێم حەلاڵ نیە ئەگەر شتێك کرێت لێوەربگرم (بەرانبەری بەوەی کە وانەت پێ دەڵێمەوە، چونکە هیچ بە فێرکردنی تۆوە ماندوو نابم و خۆت زیرەکیت)، دەڵێت: ئیتر لە حوجرە هاتمە دەرەوەو دەستم کرد بە کۆکردنەوەی فەخفوری [2] و چەرمی دەف و چیلکەی لەپی پەلە دارخورما و پانە ئێسکی سەرشانی وشتر، لەسەر ئەوانە فەرموودەکانم دەنوسیەوە (چونکە ئەوسا کاغەزی نوسین زۆر کەم بووە، یان هەر نەبووە) و دوایی دەمهێنان بۆ دیوانەکان[3] و لەوێدا دەمنوسینەوە، لەسەر هەموو شتێك دەمنوسی (کە شیاوی نوسین بووایە)، تەنانەت دایکم تەشتێکی گلێنەی[4] هەبوو، پڕم کردبوو لە پانە ئێسکی شانی وشتر و لە پەلقی دارخورما، هەمووشیان فەرموودەم لەسەر نوسیبوون، دوای ئەوە شاری (مەککە)م بەجێ هێشت و ڕووم کردە دێهاتەکان، فێری زمانی پاراوی کۆچەریەکانیان و نەریتەکانیان بووم، بە ڕاستی ئەوان ڕەوانترین زمانی عەرەبیان هەیە.

(شافیعی) خوا لێی ڕازی بێ، خۆی دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: ماوەی حەڤدە ساڵ لەناو ئەواندا ژیام بۆ کوێ کۆچ و ڕەویان بکردایا لەگەڵیاندا بووم، لەکوێ لایاندایا منیش لام دەدا، کاتێ گەڕامەوە بۆ (مەککە) بینیم کە توانای نوسینی هۆنراوەم هەیە و دەتوانم باسی ئەدەب و گوزارشتەکان بکەم، دەتوانم هەواڵ و بەسەرهاتی ڕابردووی عەرەبەکان بگێڕمەوە، یەکێك لە ئامۆزاکانم کە لە بەرەی زوبەیرەکانە، بەلامدا تێپەڕی و پێی گوتم: ئەی باوکی عبداللە، چەند بەلامەوە ئازیزتر دەبووی کە لەگەڵ ئەم زمانپاراوی و قسە ڕەوانی و زیرەکیەتدا فیقهیشت

---

(١) ئەوسا دەبوایە مامۆستا خۆی بە دەست وانەکەی بۆ فەقێکە بنوسێتەوەو ئینجا بیداتێ، تا سەعی تێدا بکات و لەبەری بکات.

(٢) فەخفوری: شتی دروستکراو لە قوڕی سورەوەکراو.

(٣) دیوانەکان وەکو کتێبخانەی گشتی ئێستا وابووە.

(٤) تەشتی فەخفوری و سوێنە.

بزانيبا، دەبوويتە مايەی سوود و بێر بۆ خەڵكی سەردەمی خۆت. منيش پێم گوت: كێ و كام زانا هەيە كە نەچووبمە خزمەتی؟ وتی: (مالك)ی كوڕی (ئەنەس)، كە لەو ڕۆژەدا زانای هەرە گەورەی موسوڵمانان بوو، (شافيعی) دەفەرموێت: قسەی ئامۆزاكەم كاری تێكردم و دڵی جولاندم، كە گەيشتمە شاری (مەككە) كتێبی (الموطأ)ەكەی پێشەوا (مالك)م لە پياوێك خواست و لەو ماوەی (نۆ شەو)دا بە تەواوەتی هەمووبم لەبەركرد، دوای ئەوە چووم بۆ لای (والی مەككە)و نوسراوێكم لێ وەرگرت تا بيبەم بۆ لای (والی مەدينە)و (مالك) ی كوڕی (ئەنەس)، بەرەو مەدينە ڕۆيشتم، نامەكەم گەياندە (والی مەدينە)، كاتێك خوێنديەوە وتی: ئەی كوڕە گەنجەكە، من لەناوجەرگەی مەدينەوە بەپێی پەتی و بە پيادەيی بڕۆم بۆ ناوجەرگەی شاری مەككە زۆر بەلامەوە خۆشترە وەك لەوەی بچمە بەردەرگای (مالك)ی كوڕی (ئەنەس) (واتا شەرم دەكەم داواكارييەكی لێ بكەم بۆ تۆ)، بەڕاستی خۆم بە زەليل دەبينم كە لەبەردەرگای ئەودا ڕاوەستم، شافيعی (خوا لێی ڕازی بێ) دەفەرموێ: پێم گوت: خوای گەورە ميرچاك بكات، ئەگەر نامەيەكيشی ئاراستەكرا بايەخی پێبدات و داواكەی جێبەجێ بكات، وتی: هەيهو.. وا ئەبينم من و ياوەرانم سواری وڵاخ بين و تەپ و تۆزی (عەقيق)[1] مان بەسەردا بڕژێ، هەندێ لە پێويستيەكانمان ئامادە كرد، دەمەو عەسرمان دياريكرد بۆ بەڕێكەوتن، هەموومان سواری وڵاخەكانمان بووين، بەخوا ئەو چۆنی گوت، وابوو، تەپ و تۆزی عەقيقمان بەركەوت، گەيشتين، پياوێكمان لە پێشەوە ڕۆيشتە بەر ديوانی و لە دەرگای دا، كەنيزەكێكی ئەسمەر ڕەنگ دەرگای لێكردينەوە، مير بە كەنيزەكەكەی وت: بە گەورەكەت بڵێ كە من لەبەردەرگام و هاتووم بۆ لای، چووە ژوورەوەو منيش چاوەڕێم كرد، هاتەوە دەرەوە، وتی: گەورەم سەلامت لێ دەكات و دەڵێت: ئەگەر پرسيارێكيان هەيە با بۆم بنوسن و بۆم ڕەوانە بكەن، وەڵاميان دەدەمەوە، ئەگەر

---

(١) عەقيق: كەند و شيوێكە لە مەدينە، وە هەر كەندێك كە ئاو دايدڕيبێ و شيوێكی دروست كردبێ پێی دەوترێت (عەقيق).

بۆ گفتوگۆیشە ئەوا خۆی دەزانێ ڕۆژەکەی و کاتەکەی تێپەڕیوە، میر بە کەنیزەکەکەی گوت: پێی بڵێ نوسراو و نامەیەکی والی مەککەی بۆ هێناویت و پێویستیەکی گرنگی تێدایە، چووە ژوورەوە و دیسانەوە هاتەوە دەرەوە و کورسیەکیشی بە دەستەوە بوو، داینا، ئینجا (مالك) خوا لێی ڕازی بێت هاتە دەرەوە، ئەوپەڕی ئەدەب و ویقار و خواناسی لێ دەباری، شێخێمی باڵابەرز و ریشێکی درێژی جوانی هەبوو، کراسێکی سەوزی ئاودامانی لەبەردا بوو، لەسەر کورسیەکە دانیشت و والیەکەش نامەکەی خستە خزمەتی، دەستی کرد بە خوێندنەوەی تا گەیشتە ئەو دێڕەی کە نوسرا بوو (قسە لەگەڵ ئەم پیاوەدا بکەو بزانە حاڵ و گوزەرانی چۆنە و خۆت هەرچی بڕیار دەدەیت بیکە).

نوسراوەکەی لە دەستی ڕاپسکاند و ئینجا گوتی: سبحان الله..! ئەوە زانستی پێغەمبەری خودا ﷺ وای لێهات کە بە واسیتە وەربگیرێت، والیەکە شڵەژاو ڕووی نەبوو لە خزمەتیدا قسە بکات، ئیتر خۆم لێی چوومە پێشەوە و پێم گوت: خوا چاکت بۆ بکات، من پیاوێکی بەرەی موتتەلیبیم و ئەوە بەسەرهاتی خۆم پێ وتی، کاتێك گوێی لە قسەکانم بوو، ماوەیەك لێم ورد بووەوە، (مالك) (خوا لێی ڕازی بێ) توانایەکی گەورەی هەبوو لە کەسناسیدا، لێی پرسیم: ناوت چییە؟

وتم: محمد

فەرمووی: ئەی محمد، لەخوابترسە و لە تاوان و گوناه دوور بکەوەرەوە[1] وا دەبینم شکۆ و پایەیەکت دەبێ، پاشان فەرمووی: نیعمەت و ڕێزیش بزانە، سبەینێ وەرەوە، ئەو کەسەش دێت کە پێت دەخوێنێت، دەفەرموێت: پێمگوت: من خوێندەواریم هەیە.

نوسراوەکە بە دەستمەوە بوو، دەستم کرد بە خوێندنەوەی ئەوەی لەبەرم بوو، هەرچەند جارێك تەماشای (مالك)م دەکرد تا بزانم کەی پێم دەڵێت: بەسە،

---

(١) وا دەبینم ئەمە ئەوەیە کە شافیعی دەفەرموێت سکالآم بردە لای وەکیع، چونکە ناشێ زانایەکی وەکو شافیعی خەریکی نەزەر بوبێ.

دەمبینی هەر زیاتر سەرسامە بە شێواز و ڕەوانی خوێندنەوەکەم و دەیفەرموو: ئەی کوڕی گەنج بەردەوامبە، تا لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا لەبەر سەرجەم کتێبی (الموطأ)ەکەیم بۆ خوێندەوە، ئیتر لە مەدینەدا مامەوەو نیشتەجێ بووم، هەتا (مالك) خوا لێی ڕازی بێ کۆچی دوایی کرد، ئیتر بەرەو یەمەن چووم، شکۆو پایەم تێدا دەستکەوت، لەلایەن (هارون الرشید)ەوە (والی)یەکی ستەمکار و خراپ بۆ یەمەن دانرا بوو، من بۆ ئەوە چووم کە بەڵکو دەستی بگرم و نەهێڵم ئەو ستەم و بەدکاریە بکات، لەو کاتەدا نۆ کەسی عەلەوی هەبوون کە دژی دەجوڵانەوە، (والی) بۆی نوسیبوو: دەترسم ئەو نۆ کەسە نەگیرێن و دەرباز بن، لەناو ئەوانەشدا پیاوێك هەیە کە (شافیعی موطەلبی)یەو دەستی ئەوم پێ نیەو فرمانی گرتنی یا نەگرتنیشیم پێ نیە، (هارون الرشید)یش لە وەڵامی (والی)یەکەدا نوسیبووی ئەو عەلەویانە و ئەو شافیعیەشم بۆ بنێرە، ئیتر منیش خرامە پاڵ ئەوان، کاتێ براین بۆ لای (هارون الرشید) چووینە ژورەوە، (محمد)ی کوڕی (الحسن) لەلای بوو، (هارون الرشید) فەرمانی کرد کە قامچی و شمشێری بۆ بێنن، عەلەویەکانی لەناوبرد، ئینجا (محمد بن الحسن) ئاوڕێکی دایەوەو ئاماژەی بۆ من کرد و بە (هارون الرشید)ی گوت: ئەی میری باوەڕداران، وریابە ئەم پیاوە موتەلیبە بەهۆی لێزانی و زمانزانیەوە بەسەرتا زاڵ نەبێت، چونکە پیاوێکی زمانزان و قسەزانە.

گوتم: ئەهلەن ئەی میری باوەڕداران، تۆ بانگکاری و من بانگکراو، تۆ هەرچیت بوێ دەتوانیت بەرانبەر بە من بیکەیت، بەڵام من ناتوانم ئەوە بکەم کە لە تۆم دەوێ.

ئەی میر، چی دەڵێیت دەربارەی دوو کەس، کە یەکێکیان وەك برایەکی خۆی بمبینێ و ئەوی تریان وەك کۆیلەی خۆی بمبینێ؟ ئایا من کامیانم زیاتر خۆش بوێت؟

ئێوە لە ڕۆڵەی (عباس)ن، وەك برای خۆتان تەماشای ئێمەتان کردووە، بەڵام ئەوان وەکو کۆیلەی خۆیان تەماشای ئێمە دەکەن، (شافیعی) خوا لێی ڕازی بێ-

دەفەرموێت: میر بەم قسانە سەرسام بوو، ئیتر دانیشت و گوتی: ئەی کوڕی ئیدریس زانستی تۆ دەربارەی قورئان چۆنە؟

وتم: لەبارەی کام جۆرە زانستەی قورئانەوە پرسیارم لێ دەکەی؟ لەبارەی لەبەرکردنیەوە، لەبەرمە، هۆشیارم بەرانبەر واتاکانی، دەزانم چۆن دەست پێبکەم و لە کوێدا بوەستم، دەربارەی ناسخ و مەنسوخ و شەوی و ڕۆژی و لێدابڕانی و هۆگربوونی دەزانم، وە دەزانم ئەو ئایەتانەی کە گشتین و مەبەستی لە تاکە کامانەیە، هەروەها بە پێچەوانەیشەوە، ئیتر پێی گوتم: بەخوا ئەی کوڕی ئیدریس، زانستت پێیە، ئەی لەبارەی ئەستێرەناسیەوە چی دەزانیت؟ گوتم: لەبارەی وشکایی و دەریایی و دەشتایی و چیایی و فەیلەقەوە[1] دەزانم، هەروەها دەربارەی چراوگ، ئەوەی کە حەزبکەم بیزانم، ئینجا گوتی: ئەی زانستت چۆنە دەربارەی ڕەچەڵەك و تیرەزانی عەرەبەکان؟ منیش وتم: من ڕەچەڵەکی خراپەکانیان و چاکەکانیان دەزانم، گوتی: بەڕاستی زانستت پێیە، ئەی چ ئامۆژگاریەکت هەیە بۆ میری موسوڵمانان؟ دەفەرموێت لەوێدا ئامۆژگاریەکی (طاوس)ی یەمانیم کەوتەوە بیر و ئەوەم پێ گوت، میر گریا، پاشان فرمانی کرد کە پێنج سەد هەزار دینارم بدرێتێ، لەگەڵ خۆی و لەپێش خۆیەوە لەنێوان باوەشی خۆی سواری ئەسپەکەی خۆی کردم، لە دیوان هاتمە دەرەوە، نەگەیشتمە دەرگاکە، بەبێ ئەوەی میر چاوی لێم بێت، پێنج هەزار دینارەکەم فڕێ دایە سەر زەوی و تیژ ڕۆیشتم، (پاسەوانەکە) کە هاودەمی (هارون الرشید) بوو بە دوامەوە بوو، پێم گەیشتەوەو پارەکەی بۆ ڕاگرتم و گوتی: ئەمە لە من وەربگرە، منیش وتم: من لە کەسێکی وەرناگرم کە لە خوارووی خۆمەوەیە، لە کەسێکی وەردەگرم کە لە سەرووی خۆمەوەیە، ئەم قسەیە کاری تێکرد، (شافیعی) خوا لێی ڕازی بێت– دەفەرموێ ئیتر بەردەوام بووم لە ڕۆیشتم تا گەیشتمە ماڵەوە، لەوێ سەد دینارم برد و ڕۆیشتم بۆ لای نوسەر (محمد)ی کوڕی (الحسن) و پێم گوت: ئەمشەو هەموو نوسەرەکان[2] کۆبکەرەوە لەسەر کتێبەکانت و با هەموویانم بۆ بنوسنەوە و بۆم بنێرە، ئەویش هەموویانی بۆ نوسیمەوەو بۆی ناردم.

---

(١) ئەمانە چەند بەش و زاراوەیەکی باوی زانستی ئەستێرەناسی ئەو سەردەمە بوون، کە وشەی کۆتایی (فەیلەق) لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانی یە.

(٢) ئەوسا ئامێری چاپ و ڕوونوسکردن و کاربۆن نەبوو، کاغەز و قەڵەم و مەرەکەبیش زۆر کەم بووە، لەبەرئەوە کتێب بە دەست دەنوسرایەوە، یەکێك لە پیشەی خوێندەوارە خەتخۆشەکان نوسینەوەی کتێب بووە بە کرێ، جا یان بۆ فەقێکان یان بۆ میر و پاشاکان کە بە دیوان دەناسران.

## گەلاڵەکردنی زانستە هەمەجۆرەکان:

(ڕەبیع) کوڕی (سلیمان) گێڕایەوە و گوتی: (شافیعی) خوا لێی ڕازی بێ، بەیانیان لە دوای نوێژ بازنەی وانە وتنەوەی بەردەوام دەبوو تایبەت بە قورئان و زانستە قورئانیەکان، تا کاتی خۆرهەلاتن، ئیتر ئەو کۆڕە هەڵدەستان و ئەهلی فەرموودە دادەنیشتن و پرسیاریان لەبارەی فەرموودەو زانستی فەرموودەوە ئاراستە دەکرد تا خۆر بە تەواوەتی بەرزدەبووەوە، ئینجا ئەوان هەڵدەستان و کۆڕێکی تر دادەنیشتن بۆ خوێندنەوە و کۆشش و وەبیرخستنەوە تاکو چێشتەنگاو، ئینجا بڵاوەیان لێ دەکرد، ئینجا زمانەوان و شاعیران و نوسەران دەهاتن و تا نزیکی نیوەڕۆ لەگەڵ ئەوانیشدا دادەنیشت بۆ گفتوگۆ و زانیاری دەربارەی بەحرەکانی هۆنراوە و نەحو و عەروز، ئەوسا هەڵدەستا و کۆتایی بە وانە و کۆڕەکانی دانیشتنی ئەو ڕۆژەی دەهێنا.

(محمد عبدالحكم) دەڵێت: هیچ کەسێکم نەدیتوە کە وەکو شافیعی وابێت — خوا لێی خۆش بێت— ئەوانەی کە عەودالی فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) و زانستی فەرموودەناسی بوون دەهاتنە خزمەتی و چەندین پرسیاریان دەربارەی لایەنە ئاڵۆزەکانی فەرموودە لێ دەپرسی، ئەویش بۆی ڕاڤە دەکردن و ڕایدەگرتن بۆ تێگەیشتن لە نهێنی زۆر گەورەی ئەوتۆدا کە ئەوان لێیان یاخی ببوو، تێیدەگەیاندن و ڕایی دەکردن، ئەوانیش زۆر سەرسام دەبوون، هەروەها ئەهلی فیقە و شەریعەتی ئیسلامیش بە هەمان چەشن سەرسام دەمان جا هاوڕابووین یان ڕاپێچەوانە، هەروەها ئەدەب دۆست و شاعران دەهاتنە خزمەتی چەندین زانیاری دەربارەی هۆنراوەو واتا ئاڵۆزەکان فێر دەبوون، پێشەوا شافیعی —خوا لێی ڕازی بێت— خۆیشی (دە هەزار) هۆنراوەی بەرەو سەردەمی (هوذەیل)ی لەبەر بوو، بە ئیعراب و واتاکانیانەوە، زاناترین کەس بووە لە مێژووناسیدا و کاتی ڕووداوەکان، نهێنی ئەم کارانەیشی ئەوە بووە کە نیازی لە هەموو کارو هەنگاوێکیدا ڕەزامەندی خودای گەورە بووە.

(محمـد عبـدالرحمن)ی کـوڕی (أبـی حـاتم الـرازی) دەڵێـت: (أبـو الحسـن) لـە (عبدالرحمن)و ئەویش لە (أبی محمد)ی کوڕی کچەکەی شافیعی یەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گوێم لێ بوو کە (جارودی)[1] یان مامم یان باوکم یان هەموویان لە (مسلم)ی کوڕی (خالد)ەوە دەڵێت: بە محمدی کوڕی ئیدریسی شـافیعی وتـراوە "فـەتوا بـدە ئەی باوکی عبداللە، ئێسـتا کـاتی فـەتوادانت هـاتووە" لـە کاتێکدا هێشـتا تەمـەنی (هەژدە ساڵ) بووە.

(حمیدی) دەڵێت: دەمانەویست وەڵامی خاوەن ڕاوبۆچوونەکانی بـواری فیقـە و شەریعەت بدەینەوە، بەڵام بەباشی ئەوەمان نەدەزانی هەتا شـافیعی هـات و ڕچـەی بۆ شکاندین.

(ئەبو ئیسماعیلی تورموزی) دەڵێت: گوێم لێ بـوو کـە ئیسـحاقی کـوڕی ڕاهویـە گوتی: ئێمە لە شاری مەککە بووین، شافیعی و ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەلیش لـەوێ بوون، ئیمام ئەحمەد پێی گوتم: ئەی باوکی یەعقوب، بـڕۆ لـە کـۆڕی وانـەکانی ئـەو پیاوەدا (واتە شافیعی) دابنیشە، وتم: جا چی لـێ بکـەم؟ خـۆ تەمـەنی لـە تەمـەنی خۆمانەوە نزیکە؟ ئایا لەبەرخاتری کۆڕی ئەو وازبێـنم لـە (ابـن عینـە) و (المقـریّ)؟ فەرمووی: داماو، ئەم پیاوە دەڕوات، بەڵام ئەوانی تر دەمێنن‌ـەوەو لەکیسـت ناچـن، ئەڵێ: منیش چوومە کۆڕەکانیەوە.

(أبوبکر) کوڕی (ادریس الحمیدی) دەڵێت: لەگەڵ شافیعی چـووم بـۆ (میصـر)، ئەو لەسەری سەرەوە بوو، ئێمـەش لـە ناوەڕاسـتدا، لـەو ژوورەی لێـی دەخـەوتین، زۆربەی شەوەکان لەخەو هەڵدەسـتایەوە چـراکەی دەئایسـا، بـانگی بەردەسـتەکەم دەکـرد، کـە گـوێی لـە دەنگـم دەبـوو، دەیگـوت: لـەبری هەقەکـەم شـەو بێداربـە و مەخـەوەرەوە، ئـەویش وای دەکـرد، قەڵـەم ئـوچ و کاغەزەکـەی بـۆ دەهێنایـەوە پێشەوە، منـیش دەمگـوت: چـیەی ئـەی بـاوکی عبـداللە؟ ئـەویش دەیگـوت: واتـای فەرموودەیـەکم بـیر لێـدەکردەوە، یـان بیرکەوتـەوە، یـان بـاس و بابـەتێك، ترسـام لەبیرم بچێتەوە تا بەیانی، لەبەرئەوە داوای فتیلە (چرا)م کرد تاکو بینوسمەوە.

---

(١) جارودی: موسای کوڕی ئەبی الجارود المکیەیە کە قوتابی شافیعی و مامۆستا تورموزی بووە.

(محمد)ی کوڕی (یحي) کوڕی (حسان) دەڵێت: گوێم لێ بوو کە (احمد)ی کوڕی (حنبل) فەرمووی: (محمد)ی کوڕی (ادریس)ی شافیعی شارەزاترین کەسە لە فیقهی کتێبی خوادا –واتە قورئان و ئیسلام– وە لە سوننەتەکانی پێغەمبەریش دا (ﷺ) کە زۆر شارەزایەو بە کەم ڕازی نابێ لە فەرموودە زانیدا.

(محمد)ی کوڕی (فضل البزّار) گوێم لێبوو، باوکم دەیگوت: لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی حەنبەل چووین بۆ حەج، پێکەوە بووین لە یەك ماڵی ناو مەککەدا بەیانی زوو (أبوعبدالله) واتە (احمدی کوڕی حەنبەل) لەخەو هەستا، منیش دواتر لەخەو هەستام، دوای ئەوەی نوێژی بەیانیم کرد، بە دەوری مزگەوتەکەدا خولێکمدا[1] تا چووم لە کۆڕی وانەبێژی (سوفیان)ی کوڕی (عەینە)دا دانیشتم، یەکە یەکە کۆڕەکان دەگەڕام بە دوای کۆڕی أحمدی کوڕی حەنبەل دا، تاکو دۆزیمەوە، بینیم کە لە کۆڕی کوڕێکی گەنجی عەرەبیدایە، بەرگێکی ڕەنگکراوی لەبەرەو کڵاوێکی (یان فێستێك)ی لەسەردایە، زۆر قەرەباڵغ بوو، بەزۆر جێگەیەکم بۆ خۆم کردەوەو دانیشتم لەتەنیشت ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە، پێم گوت: ئەی باوکی عبدالله وازم لە کۆڕەکانی (کوڕی عەینە)[2] هێنا کە کەسانی وەکو (الزهری) و (عومەری کوڕی دینار) و (زیادی کوڕی عەلاقە) و (تابیعیەکان)ی لەلا دانیشتبوون، تۆ بڵێی ئەم کوڕە گەنجە لەوانە بەتواناتر و گرنگتر بێ؟ پێشەوا ئەحمەد فەرمووی: بێدەنگ بە، ئەگەر قسەیەك (یان فەرموودەیەك)ت لە بەرزاییدا لەدەست چووبێت، لێرەداکە نیشتویتەوە دەیدۆزیەوە، هیچ زیانێك بە ئاین و ژیریت ناگات کە لای ئەم گەنجە دانیشی، بەڵام ئەگەر قسەکانی (وانەکانی) ئەم گەنجەت لەکیس بچێ، هەتا ڕۆژی قیامەت دەستت ناکەوێتەوە، هیچ کەسێکم نەدیوە بە هێندەی ئەم گەنجە قوڕەیشی یە زانا بێ لە فیقهی کتێبی خوادا، دەڵێت: منیش پرسیم جا ئەوە کێیە؟ فەرمووی: محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی یە.

---

(١) لەو سەردەمەدا دوای نوێژی بەیانی حەلقەی زانست و وانە خوێندن لە مزگەوتەکاندا دادەنرا و فەقێ و خەڵك بۆیان هەبوو دانیشن.

(٢) کوڕی عەینە یەکێك بووە لە وانەبێژە بەناوبانگەکان.

## بێ فیزی و ملکەچکردنی بۆ هەق:

(الحسن) ی کوڕی (عبدالعزیز)ی جەرەوی، کە شێخ و مامۆستای (بوخاری) بووە دەفەرموێت، شافیعی فەرمووی: (هەرگیز حەزم نەکردووە هاوتاکەم بکەوێتە هەڵەوە، کە لێکدوانمان کردبێ، وە هەر زانستێکم هەبووبێ، مەگەر هەر حەزم کردووە کە هەموو کەسێك (وەکو من) بیزانێت و (بەتەنها) نەدرێتە پاڵ من.

{واتە: لەگەڵ هەر کەسێك مونازەرەم کردبێ، حەزم نەکردووە ئەو کەسە بکەوێتە هەڵەوەو حەزم کردووە هەمیشە خەڵکانی تر خۆیان زانا بن و زانست نەدرێتە پاڵ من و من بە خاوەنی نەزانرێم}.

(الربیع) دەڵێ: شافیعی نەخۆش کەوت، منیش چووم بۆ سەردانی، باسی ئەو کتێبانەی کرا کە دایناون، فەرمووی: خوازیارم خەڵکی ئەم کتێبانە فێر بن و بیزانن و هەرگیز هیچی نەدرێتە پاڵ من (واتا گرنگ نیە ناوی من ببرێ یان نا، گرنگ ئەوەیە خەڵکی فێریان بن).

هەر خۆیشی پێشەوا شافیعی (خ.ل) گەلێك وتەی شیرین و جوانی هەیە، لەوانە، دەفەرموێت: "خوازیارم هەر زانستێك کە دەیزانم، فێری خەڵکیشی بکەم و پاداشتی لەسەر وەربگرم و کەسیش لە بەرانبەردا سوپاسم نەکات". (واتە پاداشتم لەلای خوا دەوێ، نەك سوپاسی خەڵکی).

هەروەها دەفەرموێت: "هەرچی شتێك کە من پێم گوتون، ئەگەر ژیریتان شایەتی لەسەر نەدا و قەبوڵی نەکرد، ئێوەش قەبوڵی مەکەن، چونکە ژیری ناچارە مل بدات بۆ هەق، هەرگیز لەگەڵ هیچ کەسێك مونازەرەم نەکردووە، مەگەر هەر مەبەستم ڕێنمایی کردنی بووە، وە هەرگیز مونازەرەم لەگەڵ هیچ کەسێ نەکردووە، مەگەر هەر حەزم کردووە کە نەکەوێتە هەڵەوە".

## وەرع و خواپەرستی:

(ربیع المرادی)ی میصری دەڵێت: شافیعی لە هەموو مانگێکی ڕەمەزاندا شەست جار قورئانی خەتم دەکرد، هەموویشی لە نوێژدا دەخوێند.

(ربیع)ی کوڕی (سلیمان)یش دەڵێت: شافیعی فەرمووی: ماوەی شازدە ساڵە نەمهێشتووە کە تێر بخۆم، چونکە تێر خواردن ئەبێتە هۆی قورس بوونی لەش و ڕەقبوونی دڵ و کەمکردنەوەی زیرەکی و خەو هاتن و مرۆڤ لە خواپەرستی لاواز دەکات.

## بەخشندەیی شافیعی:

(محمد عبدالله)ی میصری، دەڵێت: شافیعی کەسێکی زۆر بەخشندە بوو، هاوتای ئەوم لەناو خەڵکدا نەدیوە.

(عەمروی سەرجی) دەڵێت: شافیعی بەخشندەترین کەسە لەڕووی بەخشینی دینارو درهەم و خۆراکەوە. شافیعی پێی گوتم: لە تەمەنی خۆمدا سێ جار مایە پووت بووم و ناچار بووم هەرچیم هەیە لە زۆر و کەم بیفرۆشم، تەنانەت خشڵی کچەکەم و هاوسەرەکەیشم، وە هەرگیز ڕەهنم نەکردووە.

(محمد البستی) سەجستانی دەڵێت: دەچووین بۆ شاری مەککە، شافیعی لە کەمترین بەخشینیش درێغی نەدەکرد.

## زمانپاراویی و ڕەوانبێژیی و شایەتدانی زانایان بۆی:

(ربیع) کوڕی (سلیمان) دەڵێت: گوێم لێ بوو کە (عبدالملك)ی کوڕی هشام)ی نەحەوی، خاوەنی (المغازي) دەیگوت: (شافیعی لەو کەسانەیە کە زمانی لێ وەردەگیرێت)، هەروەها ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرموێت: (شافیعی لە زمانڕەوانترینی کەسەکانە) (مالك) خ.ل سەرسام بوو بە خوێندنەوەکەی چونکە زۆر زمانی ڕەوان بوو.

(أبو عبيد القاسم)ی کوڕی (سەلام) دەڵێت: شافیعی لەو کەسانەیە کە زمانی لێ وەردەگیرێت، یان یەکێکە لە کەسە شارەزاکانی زمان.

(ربیع)ی کوڕی (سلیمان) دەڵێت: (شافیعی نمونەی کەسێتی عەرەبی و زمانی عەرەبی یە) واتا (دەرون عەرەبی و زمان عەرەبیە).

(أحمد)ی کوڕی (سورەیج) دەڵێت: (هیچ کەسێکم نەدیوە کە بە هێندەی شافیعی بە دەمو دوو زمانپاراو بێت).

(أبو نعيم الأسترابادي) دەڵێت: گوێم لێ بوو (ربیع) دەیگوت: ئەگەر شافیعیت دەبینی سەرسام دەبوویت لە زمانپاراوی و ڕەوانبێژییەکەی، خۆ ئەگەر ئەم کتێبانەی کە دایناون بە زمانی تایبەتی و ناوازەکەی خۆی بینوسینایە –واتا بە شێواز و ئەدەبیات و زمانەکەی کە لە مونازەرەکانیدا لەگەڵمان بەکاری دێنێ– کەس نەیدەتوانی کتێبەکانی ئەو بخوێنێتەوە، بەهۆی ئەو زمان ڕەوانی و وشەسازیەی کە تیایاندایە، بەڵام بەوە باشە کە کتێبەکانی لەسەر ئاستی گشتی و بە زمانی زۆرینە نووسیون.

(جاحظ) دەڵێت: (ئەو کتێبانەم تەماشا کرد کە کەسانی هەڵکەوتەو دەگمەن دەربارەی زانستەکان نوسیویانن، نەمبینی هیچ کەسێك لە موطەلیبی (شافیعی) باشتر بێ، قسەکانی ئەو ڕیزکردنی دوڕە بە دوای دوڕدا)، {واتە وشەکان وەك دەنکۆڵەی دوڕ و مرواری بەدوای یەکدا جۆشداون}.

پێشەوا (أحمد) خ.ل دەفەرموێت: هیچ کەسێك نیە کە دەستی بە قەڵەم و کاغەز گرتبێت (واتە خوێندەوار بێت) و تا ئاستی گەردنی منەتباری شافیعی نەبێت.

(الذهبي) دەڵێت: شافیعی فەرموودەکانی پێغەمبەری لەبەر بوو (د.خ) بینا بوو بەوان (واتا زۆر شارەزای فەرموودەناسی بوو) هیچ فەرموودەیەکی وەرنەدەگرت تا بەتەواوەتی لەلای خۆیەوە لێی دڵنیا نەبووایەو ساخی نەکردایەتەوە، خۆ ئەگەر تەمەنی درێژتر بووایە، سوودی زیاتری لێ دەکرا.

## کۆچی دوایی:

(المزني) دەڵێت: چوومە خزمەتی شافیعی و سەردانیم کرد لەو نەخۆشیەیدا کە کۆچی دوایی تێدا کرد، لێم پرسی: چۆن دنیات گوزەر کرد؟ فەرمووی: لە دنیادا کۆچ دەکەم، لە یاوەرانم دادەبڕێم، شەرابی مەرگم دەنۆشم، بۆ لای خودای گەورە دەگەڕێمەوە، سوێند بە خوا نازانم ئایا ڕۆحم بەرەو بەهەشت دەچێت یان بەرەو دۆزەخ، ئینجا گریا و ئەم هۆنراوەیەی فەرموو:

که دڵم وشك هەڵات، هەست و پەلم بەرتەنگ بوو[1]
خودا، بۆ لێبووردنم تکام پلەی پەیژەم بوو

(ربیع)ی کوڕی (سلیمان) دەڵێت: شافیعی خ.ل لە شەوی هەینی، دواهەمین ڕۆژی مانگی ڕەجەبی ساڵی (٢٠٤)ی کۆچی، لە (فسطاط)ی (میصر) لە دوای نوێژی خەوتنان کۆچی دوایی کرد، هەر ڕۆژی هەینی ئەسپەردەی خاکمان کرد، کە گەڕاینەوە هیلالی مانگی شەعبانی ساڵی (٢٠٤)مان بینی.

هەروەها (ربیع) دەڵێت: لەدوای کۆچی دوایی لە حەلقەی دانیشتنی شافیعیدا، وەك جاری جاران دانیشتبووین، عەرەبێکی دەشتەکی بە سەرمانەوە هەڵوێستا بوو، سەلامی کرد و ئینجا گوتی: ئەی کوا مانگ و ئەستێرەی ئەم حەڵقەیە لە کوێیە؟

---

(١) دواهەمین هۆنراوەی شافیعی لە ژیانیدا هۆنراوەی ژمارە (١١٣)یە.

وتمان: كۆچی دوایی كرد، خودا لێی خۆش بێت، ئەو پیاوە زۆر بە كوڵ گریا، ئینجا نزای كرد و گوتی: ڕەحمەت و لێخۆشبوونی خودای بەسەردا ببارێت، بەڕاستی بە زمانە ڕوونەكەی بەڵگە داخراوەكان دەكرانەوە، نەیارانی لە ڕوویدا دادەخران، كەسێكی بەڵگە ڕوون بوو، ڕووە ڕەشەكان لە بەرانبەریدا بە شەرمەزاری دادەشۆران، بە ڕاوبۆچوونە فراوانەكانی دەرگا داخراوەكان دەكرانەوە، ئینجا پیاوەكە ڕۆیشت.

(ابن خەلەكان)ی خاوەنی كتێبی (وفیات الأعیان) دەڵێت: هەموو زانایان لە دەوری ئەو جەمن هەر لە فەرموودەناسان و فیقە و ئوصول و زمان و نەحو و ئەوانی تریش، هەموویان لەسەر متمانەی ئەون، وە لە سپاردەو دادپەروەری و زوهد و وەرع و ژیاننامەو هیمەت بەرزی و بەخشندەیی ئەو بەهرەمەندن.كەواتە ساڵی (٢٠٤)ی كۆچی بەرانبەرە لەگەڵ (٧٨٤)ی زایینی.

كاتێك ئەم زانا و خواناسە گەورەیە كۆچی دوایی كرد، چەندین كەس لە نوسەر و ئەدیب و شاعیر و زانایانی جیهانی ئیسلامی پەخشان و هۆنراوەی شیوەنیان بۆ نووسی، یەكێك لەوانە هۆنراوەیەكی (محمد)ی كوڕی (درید)ە، بە پێویست نەزانرا لێرەدا دابنرێ، چونكە خودی شافیعی حەزی لە پیاهەڵدان نەكردووە و هەمیشە ویستویەتی ئەو زانستەی كە هی خۆیشی بووە، نەدرێتە پاڵی، بەڵكو سوود بگەیەنێ بە خەڵكی و پاداشتی لای خودای گەورە دەست بكەوێت.[1]

---

(١) هۆیەكی تر ئەوەیە كە پاڵی پێوەنام بۆ نەنوسینی ئەو هۆنراوەیە تێكەڵ نەبوونە بە هۆنراوەكانی شافیعی، هاوكات هەركەسێك دەیەوێت ئەو پیاهەڵدانەی (محمد)ی كوڕی (درید) بخوێنێتەوە دەتوانێت لەم سێ سەرچاوانەدا ببیینێ (دیوان الأمام الشافعي) جمعة (محمد عفیف الزعبي) طبعة الأولى، سنة ١٩٧١، (وفیات الأعیان) ل (ابن خلكان) ج٣ ص٣٠٩. (تأریخ بغداد) ل (الخطیب البغدادي).

## هەندێ زانیاری دەربارەی شافیعی

## لەو دیوانەدا کە (مختار فوزی النعال) کۆی کردووەتەوە

ئەو دیوانەی کە من کردوومە بە بنەمای سەرەکی بۆ ئەوەی هۆنراوەکانی پێشەوا شافیعی (خ.ل) لێوە وەربگێڕمە سەر زمانی شیرینی کوردی ئەو دیوانەیەتی کە (محمد عفیف الزعبی) لە ساڵی ١٩٧١ چاپی کردووە لە بەغداد، کە بە چاپی چوارەم ناسراوە و پێکهاتووە لە (١٠٣) لاپەڕەی مامناوەندی، پێشەکی و کورتەیەك لە ژیاننامەی شافیعی و پێڕست و بەحری شیعرەکان و سەرچاوەکانی تێدایە، بۆ ڕاڤە و وشە نامۆکانیش پەراوێزی لە دامێنی لاپەڕەکاندا داناوە، بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٤ی زایینی دا (مختار فوزی النعال) سەر لەنوێ دیوانەکەی شافیعی کۆکردووەتەوەو چاپی کردووەتەوە لە توێی (١١٢) لاپەڕەدا لە (حەڵەبی سوریا) و (دار الرضوان) بۆی چاپ کردووە، تەنها کورتە ژیانێکی شافیعی و کەمێك لە خەسڵەتەکانی شیعری شافیعی باس کردووە و هۆنراوەکانی داناوەتەوە، لە شوێنی پێویست پەراوێزی داناوە، بەڵام گەلێك هۆنراوەی تێدایە کە لە دیوانە چاپکراوەکەی (الزعبی)دا نیە، تەنانەت خۆیشی گومانی لە هەندێکیان هەیە و ئاماژەیشی پێداون کە دراونەتە پاڵی و ساخ نەبوونەتەوە، منیش لێرەدا ئەوانەم داناوەتەوە کە زۆر گوماناوی نین، واتە بە دوو دیوان (عێراقی یەك) و (سوریەك) دیوانە کوردیەکەم پێکهێناوە، لێرەشدا هەندێ زانیاری زیاتر دەربارەی شافیعی دەخەمەڕوو کە لە کۆکراوەکەی (مختار فوزي)دا هەنە و لە هی (الزعبي)دا نین:

ئیمامی شافیعی دەفەرموێت: (ماوەی دە ساڵ تێر زگی خۆم نانی جۆم نەخوارد، چونکە تێربوون دڵ ڕەق دەکات، زرنگی لەناو دەبات، خەو دەهێنێ، خاوەنەکەی سست دەکات لە هەستانەوەی شەوانە بۆ خواپەرستی).

دایکی شافیعی (فاطمة)ی کچی (عبدالله)ی کوڕی (الحسن)ی کوڕی (الحسین)ی (علی کوڕی ئەبی طالب)ە، هێشتا شافیعی تەمەنی دوو ساڵ نەدەبوو، کە (ادریس)ی باوکی کۆچی دوایی کرد، دایکی بردی بۆ شاری مەککە، ژیانێکی زۆر

هەزارانە دەژیان، خستیە بەر خوێندنی قورئان و زانستەکانی ئەو سەردەمە لە فەرموودە و فیقه، منداڵ بوو کە قورئانی پیرۆزی بە تەواوەتی لەبەرکرد، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری فەرموودەکانی پێغەمبەری نازدار (د.خ)، چووە خزمەتی پێشەوا (مالك) خ.ل بەرلەوەی لەلای ئەو زاتە دەست بکات بە خوێندن، کتێبی (الموطأ)ەکەی بە تەواوەتی لەبەر کردبوو، دواتر رووی کردە (شاری نەجران)ی وڵاتی (یەمەن) بۆ خوێندن، شافیعی کۆڵ و بارێکی گەورەی کتێبی پێ بوو، بەڵام ئەم رووداوە سەیرەی بەسەرهات، شافیعی (خ.ل) دەفەرموێت:

لە (یەمەن) بەرێ کەوتم، رێم کەوتە لای پیاوێکی چاو شینی تەوێڵ پانی کۆسە و بێ ریش، ئەم جۆرە سیمایانە لە زانستی کەس ناسیدا پیسترین جۆرە سروشتن، بە پیاوەکەم وت ئەرێ شوێنێك هەیە لێی لابدەم و پشوویەك بدەین، گوتی: بەڵێ، بردمیەوە بۆ ماڵی خۆی، وامزانی بەرێزترین کەسە، خۆراکێکی زۆر نایابی بۆ ئێوارە بۆ ناردین، ئالیکی دا بە وڵاخەکەم، راخەر و پێخەفی دامێ، شەو لەناو جێگاکەمدا تەپاو تلم دەکرد، بیرم دەکردەوە و بە خۆم دەگوت: باشە من چی بڵێم بەرانبەر ئەم پیاوە و کتێبەکانم؟ (واتە بە پێی نیشانەکانی دەبووایە پیاوێکی وا چاك نەبووایە، وەك من لەو بارە کتێبەدا خوێندومە)، ئەمە بەرێزترین پیاوە و زۆر بەخشندەیە..! لە کۆتاییدا بە خۆم گوت وا باشە ئەو کتێبانە فرێدەم، کە رۆژ بووەوە بە پیاوەکەم گوت: ئەگەر هاتیت بۆ مەککە هەواڵی ماڵی محمدی کوری ئیدریسی شافیعی بپرسە، پیاوەکە بە گاڵتەپێکردنەوە گوتی: چیە دەمسپێری بە باوکت؟ بۆچی لەجیاتی باوکت بەخێوت دەکەم؟، نا.. دەزانی خەرجی دوێنێی تۆ گەیشتۆتە چەند؟ گوتم: چەند؟ گوتی: خۆراك و پێخۆرم بۆ کریت بە دوو درهەم، بۆنێك بە سێ درهەم، ئالیك بۆ وڵاخەکەت، وە کرێی راخەر و پێخەفەکەت..! شافیعی دەفەرموێ: بە بەردەستەکەمم گوت: بیدەرێ، ئینجا پرسیارم لێکرد هیچی تر ماوە؟ گوتی: کرێی خانووەکە، من جێی خۆم تەنگەبەر کرد لەبەر خاتری فراوانکردنی جێگەی ئێوە، شافیعی دەڵێ: کتێبەکانم لەلا زیاتر خۆشەویست بوو،

بەرلەوەی بڕۆم بە پیاوەکەم گوت: هیچی تر ماوە؟ گوتی: بڕۆ خوا ڕیسوات کات، هیچ کەسێکم نەدیوە کە لە تۆ خراپتر بێ..!

لە تەمەنی سی و چوارساڵیدا شافیعی سەردانی بەغدای کردوەو ماوەی دوو ساڵ لەوێ ماوەتەوەو لەو ماوەیەدا فیقهی خەڵکی عێراقیشی خوێند و کە گەڕایەوە بۆ مەدینە کتێبی (علم اصول الفقه)ی دانا، لە (میصر) کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانێکی ئەوێ ئەسپەردەی خاك کرا کە ئێستا پێی دەگوترێ (گۆڕستانی شافیعی)، (صلاح الدینی ئەیوبی) کاتی خۆی فرمانی کرد کە خوێندنگەیەك لە نزیکی گۆڕەکەی دروست بکرێ بۆ خوێندنی فیقهی ئیسلامی و پێڕەوی شافیعی کە ئێستا بە خوێندنگەی (صلاحیة) ناسراوە.

کاتی خۆی تۆمەتبار کراوە بەوەی کە (ڕافزی)یەو تەنها لایەنگری (علی کوڕی ئەبی طالب)ە بووەتە مایەی ئاژاوە لە بنەماڵەکەی پێغەمبەردا (د.خ)، لەبەر ڕەواندنەوەی ئەو گومانە هۆنراوەی بەسەر هەموو جێنشینەکاندا گوتووە، کاتێ ئەو قسەیەی بیستەوە.

دەربارەی هۆنراوەکانیشی، هەمیشە ئامانجی نوسینی هۆنراوە لەلای شافیعی بریتی بووە لە ئاراستەکردن و وەك بەشێك لە شێوازی بانگخوازی بەکاری هێناوە، هۆنراوەکانیشی بەوە دەناسرێنەوە کە چەند خەسڵەتێکی تایبەتییان تێدایە، لەوانەش: زانینی فیقهی ئیسلامی، حیکمەت، ڕێنمایی، پەند، هۆنراوەکانی دورن لەو ئامانجە هۆنراوەییانەی کە لە هۆنراوەی کلاسیکی ئەو سەردەمەدا باو بوون و ڕەواجیان هەبووە، کە پڕ بوون لە پیاهەڵدانی بێ هودە و غەزەل و دنیا داریی، خۆیشی هەرگیز حەزی نەکردووە کە بە شاعیر بناسرێت، هەروەکو لە هۆنراوەیەکی دا دەفەرموێت:

ئەگەر هۆنراوە لای زانـــــا، بەهایەکـــی ئەوتۆی دەبـــوو
ئەوا هۆنراوەی ئەمڕۆی من، باشتر لە هی (لەبید) دەبوو

کە (لەبید) شاعیرێکی بەتوانا و لێهاتووی سەردەمی پێش خۆی بووە.

زۆرێك له ئەدیب و نوسەران هۆنراوەكانی ئەو زاتە بەرزەیان لەبەر بووەو بە نمونە لە وانە و بابەتەكانیاندا هێناویاننەوە، جگە لەوەش گەلێك كەس هاتوون هۆنراوەكانی ئەویان كۆكردوونەتەوە، تەنانەت دیوانەكەی بە چەندین چەشن و جۆر پازدە جار كۆكراوەتەوە، هەریەكە لەو نوسخانەش كەم تا زۆر لە یەكتری جیاواز بوون، ئەمیان كۆمەڵێ هۆنراوەی تێدا بووە كە هی ئەو بووەو هەندێكی تریشی تێدا بووە كە دراوەتە پاڵی، یان هەندێ هۆنراوەی هەر تێدا نەبووە، دیسانەوە لە نوسخەیەكی تردا ئەوەیان هەبووە و ئەوەی تریان نەبووە، هۆنراوەكانیشی لەناو جەرگەی چەندین كتێب و نوسراودا تەخشان و پەخشان بوون و بە تەواوەتی لە یەك دیوان دا كۆنەكراونەتەوە، لەو كتێبانەش كە هۆنراوەكانی شافیعیان تێدایە، وەكو كتێبی (حلية الأولياء و معجم الأدباء) و (وفيات الأعيان) و (البداية والنهاية) و (بهجة المجالس) و (المستطرف) و (الكشكول) و (المخلاة) و گەلێك كتێبی تر، منیش ئەم هۆنراوانەم هەمووی كۆكردەوە و بەراوردم كردن، لەم كارەشمدا ئەو دیوانەم كردە بنەما كە مامۆستا (سليمان البوطي) كۆی كردووەتەوەو ئەوانەشم بۆ زیاد كردووە كە لەئەودا نین و لەملاولاوە دۆزیومنەتەوە.

كەسانی تریش جگە لە (البوطي) هەن كە هۆنراوەكانی پێشەوا شافیعیان كۆكردەوەتەوە و ڕاڤەیان كردون و لێكدانەوەی تایبەتی خۆیان بۆ كردون بەتایبەتی دەربارەی هەندێ وشە و زاراوەی نامۆ، سەركەوتوترینیان كە وردەكاری باشی تێدا كردووە ئەو دیوانەیە كە مامۆستا (زهدی یكن) پێكی هێناوە و لەلایەن (دار الثقافة)ەوە لە ساڵی ١٩٦١ لە بەیروت چاپكراوە، هەروەها مامۆستا (محمد عفيف الزعبي) لە ساڵی ١٩٧١ دیوانێكی بەچاپ گەیاند لەلایەن (دامەزراوەی زەعبی)یەوەو ئەوانەیشی بۆ زیاد كردبوو كە (زهدی یكن) تێپەڕاند بوو، یان بەسەریاندا هەڵبورابوو، لەدوای ئەویش (دار القلم العربي)ی دیوانەكەی كە لەلایەن (عبدالقادر مايو) كۆكرابووەوە چاپكرد، لە دیمەشقیش لەلایەن (دار البشائر)ەوە دیوانەكەی چاپكرا كە مامۆستا (عبدالمجيد همو) كۆی كردبووەوە، مامۆستا (أميل يعقوب)یش نوسخەیەكی تری چاپكرد لە (دار الكتاب العربي) بە لێكدانەوەی وردەوە، كە زۆر

وردەکاری باشتری تێدابوو بە بەراورد لەگەڵ چاپکراوەکانی پێشووتر، لە کۆتاییدا ئەو نوسخەیانم کردووەتەوە بنەما کە مامۆستا (سليمان البوطي) چاپی کردووە لەلایەن دامەزراوەی (الرّيان)ی دیمەشقەوە، چونکە زۆرینەی هۆنراوەکانی و ئەوانەیشی تێدایە کە دراونەتە پاڵی، ناشمەوێ ئاماژە بەو وردە نامیلکانە بکەم کە بە ناوی (دیوانی شافیعی)یەوە چاپکراون و لێرەو لەوێ چاپ و پەخش کراون، چونکە لەو باوەڕەدا نیم کە ئەوانە پێویست بە هەڵوێستە لەسەرکردن بکەن، یان لەبارەیانەوە بدوێین، ئەوەیان و بەهاکانیان بەجێ دەهێڵم بۆ خوێنەرانی بەڕێز خۆیان.

دوای ئەوەی من شتێکی نوێم نەهێناوە، بەڵکو ئەو هۆنراوانەم کۆکردوەتەوە کە خودی شافیعی وتویەتی یان دراونەتە پاڵی و هەردوو جۆرەکەیشم جیاکردونەتەوەو ئاماژەم پێداون، هەروەها سەرناوم داناوە بۆ هۆنراوەکان بەپێی گونجاندنی ناوەڕۆکەکەیان، ئومێدەوارم کە خوێنەران بەدڵیان بێت و خوای گەورەش بەئاگایە لە ڕاز و نیازەکانی دڵان.[1]

مختار فوزي النعال

شاری حەڵەب

٢٠٠٣/١٠/١

---

(١) وا باس دەکەن کە پێشەوا شافیعی سەردانی عێراق و بەسرەی کردووە، هاتووەتە کوردستان و لە (سید صادق) ماوەتەوە، کاتی خۆی پاڵی دابوو بە دارێکەوە، کە تاکو ساڵانی هەشتاکانیش ئەو درەختە مابوو، پێیان دەگووت (درەختی شافیعی).

## توێشوو

توێشوو سبەینێت هەڵگرە
کەڕێبواری سەرسەفەری
بەس دنیا بدە بەکۆڵتا
کەنازانی بۆکوێی بەری
کۆکردنەوەت بۆ خەڵکیە
بۆ ئەوانیشتە کۆڵبەری
جێی تێشوودارانت دەوێ و
بەتەماش نیت تێشووبەری
پڕکە تێشوو کە (ئێستا)ت لەبەردەمدایە
شەوی تاریکت لەپێشە
ڕێگەت ئیحتاجی چرایە
بەسبەینێ وە مەنازە
خوادەزانێ، چەندی دوێنێ
وائەمڕۆ لەژێر خاکایە
زۆر جار تەرمت بۆ گۆڕستان
لەگەڵ خەڵکیدا بردووە
دڵنیابە ئەوڕۆژەش دێ
تەرمەکەت تۆی
کەخەڵکی هەڵیان گرتوە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١)

ڕاستە ددان ئێشە، زۆر بە ئازار و بێزارکەرە، بەڵام هەڵکێشانی ددان، بە تایبەتی خوێ، زۆر بە ئێشە، نەخوازەڵا لەو سەردەمەدا کە پێشەوا شافیعی تیایدا ژیاوە، نە داو و دەرمانی پزیشکی ددان و نە بەنج هەبووە، بەڵکو بە نوکی خەنجەر یان بە گازی بزمار هەڵکێشان ددانیان دەردەهێنا، ئەوە کارێکی زۆر بەئازار بووە، هەروەها زۆر ناخۆشە مرۆڤ لە زیندان و بەندیخانەدا دەست بەسەر بێت، لەوەش ناخۆشتر ئەوەیە کە لەناو ئەو بەندیخانەیەدا ئەشکەنجەو ئازار بدرێ و دەنگی هاواریشی بە کەس نەگات، لەم دوو شتە گرانتر بریتیە لەو کاتەی کە ڕۆحمان دەردەهێنرێت و لە سەرە مەرگی تەزو و ئازارەکانی گیانەڵادابن، هەموو لایەکمان حەز دەکەین تەمەن درێژ بین، بەڵام کە دەچینە ساڵەوە و تەمەن دەگوزەرێنین، ئینجا خۆزگە و بریا بۆ تەمەنی ڕابردوومان دەخوازین و (ساڵ بۆ ساڵ خۆزگە بە پار)، خۆ ئەگەر تەمەنیشمان بگەڕێتەوە بۆ دواوە زۆر ناخۆشە بەلامانەوە (وەکو یارانی ئەشکەوت، خۆمان مەرگ بە ئاوات دەخوازین)، لەبەرئەوە دوێنێ ئەگەر خۆش بوو، یان ناخۆش، ئەوە چاکە کە ڕابورد، زۆر ناخۆشە سەر لەنوێ بگەڕێتەوە (خێر لەوەدایە کە ڕوویدا) کەواتە دوا کشانەوەی کات (کە مەحاڵە) زۆر ناخۆشە، یان گەڕانەوەی ڕۆژ و هەڵاتنی لە خۆراواوە.

گەرما ناخۆشە و لەو کاتەدا ئارەزووی فێنکبوونەوە دەکەین، بەڵام کاتێ فێنکایەتیەکە لە سنور دەردەچێ و دەگاتە بەفر و کڕێوە و سەرما و تەزین، ئەوا دیسانەوە گران و سەخڵەتە لەسەر مرۆڤ.

تۆڵەسەندنەوە خۆشە، بەڵام ناخۆشیەکە لەوەدایە، کە خۆزگە هەڵە و تاوان ڕوی نەداباو ئەو تۆڵەیەشی بەدوای خۆیدا نەهێنایە، جا ئەگەر کەسەکە تۆ بیت کە تۆڵەت لێ دەسەنرێتەوە، ئەوا زۆر لەسەر شانت گرانە.

کەوڵکردن و داماڵینی پێست زۆر سەختە، خۆ ئەگەر لە شوێنێکی سێبەر و نسێدا بێ سەخت ترە و خاوبوونەوە ڕوونادات.

خواردنی گۆشتی کاڵ ئەگەر حەڵاڵیش بێ ناخۆشە، ئینجا ئەگەر ئەو گۆشتە گۆشتی قۆڕیلە و مارمێلکە و شەوگەردی زیندوو بێت و زۆرت لێ بکرێت کە بە تۆبزی دەست بکەیت بە خواردنی و لەلای سەریەوە دایکرۆژیت، چ دیمەنێکی قێزەون و بێزراوە !

ڕاوکردنی سنوردار خۆشە، بەڵام ئەگەر بەزۆر بتنێرن بۆ ڕاوکردنی ورچ، بە چەکێکی لاواز، چ زەحمەتێکی گەورەو ترسناکە، ڕەنگە لەوە ناخۆشتر ئەوە بێ کە تۆوێکی گرانبەهای دانەوێڵە بەسەر زەویەکدا دابچێنیت کە زۆر چاك دڵنیابیت هیچ ڕووەکێك لەو زەویە چەقەن و مردەڵەیەدا ناڕوێت، ئەمە مەگەر خەونیش بێ بەلاتەوە ناخۆشە، ئەی ئەگەر ڕاستی بێ؟

ئاگرێکی دارت لەسەر خۆڵەمێشێکی زۆر کردوەتەوە، هەر داری دەخەیتە سەر و گڕ ناگرێت، ناچار خێرا خێرا فووی پیا دەکەیت و تەپ و تۆزی خۆڵەکە ڕوخسارت دادەپۆشێ و چاوت پڕ دەکاتەوەو تووشی سەر ئێشەیەکی توندت دەکات، بەڵام ستەمکارێك بەسەرتەوە ڕاوەستاوە زۆرت لێ دەکات کە هەر دەبێ ئاگرەکە دابگیرسێنی ئەوە کارێکی گرانە.

هەژارو بێ بەرگ بیت، لەڕووت و ڕەجاڵیدا شەرمەزاری داتبگرێ، لەبەردەست کورتی و قەرزاریت خانوەکەت بە نرخێکی زۆر کەم، وەك چارەکە نرخی خۆی (چارە فلس) هەرزان فرۆش بکەیت، تەنانەت خوف و پێڵاوی پێی خۆشت بفرۆشیت، بەهۆی ئەمانەوە یان نەتوانیت یان ڕووت نەیەت سەردانی خزم و خۆیش و دۆستانت بکەیت و لێیان دابڕێیت، کە دابڕانی خزم و ئازیزان بارێکی بێ نەوایی و بێکەسی و تەنهاییت بۆ دروست دەکات، سەرەڕای ئەو هەموو گرفت و کێشانە بە گوش و گوریسی بەستنەوە و ڕاکێشانی کەشتیەکان دەست و پات ببەستن و ڕاتکێشن، ئەم هەموو شتانەی کە باسمانکردن یەك لە یەکتری ناخۆشترە، بەڵام شافیعی خ.ل لە دێڕی کۆتایی هۆنراوەکەیدا دەفەرموێت، هێشتا ئەمانە سادە و ئاسانە بە بەراورد لەگەڵ شتێکی تردا کە لە هەموویان سەختتر و گرانترە لەسەر دڵی مرۆڤێکی بەڕێز و نەجیب و خانەدان و ئازاد کە پێویستی بە هاوکاری و

یارمەتی کەسێکی خراپ و نادان و نانەجیب بووە و ناچار بووە لە دەرگای بدات و داوای یارمەتی لێ بکات، جا ئەو نانەجیبە یارمەتی بدات یان یارمەتی نەدات تا ڕادەیەك وەکو یەك وایە، چونکە ئەگەر یارمەتی بدات ئەوا منەتێکی زۆری لەسەر دەکات و لە هەموو شوێنێ باسی دەکات، ئەگەر یارمەتیشی نەدات ئەوا هەر ئەو کارە بۆ خۆی مردنێکە بۆ کەسە نەجیبەکە و سەرەڕای ئەوەش کەسەکانی تر هەر ناوی دەهێنێ و باسی دەکات بەوەی کە ئەو کەسە داوای یارمەتی لەم کردووە(١).

## عزة النفس

لَقَلْـــعُ ضِـــرْسٍ وَضَـــرْبُ حَـــبْسٍ   وَنَـــزْعُ نَـــفْـــسٍ وَرَدُّ أَمْـــسِ
رَقَـــرٌّ بَـــرْدٍ وَقَـــوْدُ فَـــرْدٍ   وَدَبْـــغُ جِلْـــدٍ بِغَيْـــرِ شَـــمْسِ
وَأَكَـــلُ ضَـــبٍّ وَصَـــيْدُ دُبٍّ   وَصَـــرْفُ حُـــبٍّ بِـــأَرْضِ خَـــرْسِ
وَنَـــفْخُ نَـــارٍ وَحَمْـــلُ عَـــارٍ   وَبَيْـــعُ دَارٍ بِـــرُبْـــعِ فِلْـــسِ
وَبَيْـــعُ خُـــفٍّ وعـــدمُ إِلْـــفٍ   وَضَـــرْبُ إِلـــفٍ بِحَبْـــلِ قَلْـــسِ
أَهْـــوَنُ مِـــنْ وَقْفَـــةِ الْحُـــرِّ   يَرْجُـــو نَـــوَالاً بِبَـــابِ نَحْـــسِ

(١) ص٥٢، عزة النفس/ لقلع ضرس و ضرب حبس

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١):

### (دەروون بەرزی)

خـــرێ کێشان[1]، لە زیندانا پیـاتـاکـێشان
گیانـدەرکـێشان، کـات دواکشـان[2]
لـەبـەر کرێوە[3] دا مردن، تـۆڵـەسـەندن
لـە نسـێ[4] دا کـەوڵـکردن، تـا گیانـکێشان
ڕاوی ورچ، داکـرمانی گۆشـت مارمێلکـە کرچـە کـرچ
تـۆو وەشـانـدن، بـە چەقەنی[5] پڕ ئاریشـان
فوولێـکردن لـە ئـاگردان، لـەبێ بـەرگیت شـەرم تـکان
تاڵانفرۆشـی مـاڵ و لان، بـە چـارەکە فلسـی هـەرزان
دابـڕاوی خـزم و خـۆیش بـی، فرۆشـی پـێڵاوی (پـێ)ش بـی
پەلـکێشتـەکەن بـە گوشـی[6] کـەشتی ڕاکێشـان
هێشـتا گـەلێ ساناتـرە[7] لـە ڕاوەسـتانی خـانەدان
لـە بـەردەرگای کەسـێکی سـوک و پێنـەزان

---

(١) خرێ: خریە: جۆرێکە لە ددان: ضرس کۆیەکەی (أضراس)ە
(٢) کات دوا کشان: کشانە دواوەی کات و پێچەوانە بوونەوەی.
(٣) کرێوە: سەرمایەکی توند و بەفربارین بە باوە.
(٤) نسێ: نسا: سا: سایە: سێبەر لە وەرزی زستاندا، ئەو جێیەی هەتاو نایگرێتەوە، یان کەم بیگرێتەوە.
(٥) چەقەن: ڕەقەن، زەوی بێ پیت و تۆو نەخواز و ئاریش و ئاڵۆزە.
(٦) گوش: پەت، گوریس، حەبل.
(٧) ساناتر: ئاسانتر، ئاسایی ترە.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٢)

زۆربەمان وا هەست دەکەین کە ئەو ڕوداوانەی بەسەرمان دێن بەتایبەتی ناخۆشیەکان گوایە خەتای ڕۆژگار و کاتە، بۆیە زۆرێك لە ئێمە و بگرە شاعیرانیش گلەیی لە کات و زەمانە دەکەن[١]، بەڵام لەڕاستیدا ڕۆژگاریش یەکێکە لەو دروستکراوانەی کە بەفەرمانی خودا دێت و دەچێ و هیچ دەسەڵاتێکی نیە، شافیعی خ.ل دەزانێت کە ئەو هەڵەیەی خەڵکی وا بە ئاسانی ڕاست ناکرێتەوە، بۆیە لەسەر زمانی ئەوانە دەفەرموێت، تۆ واز لە ڕۆژگار بێنە، هەرچی دەکات با بیکات (چونکە هیچی بەدەست نیە)، تۆ سروشت و کاری خۆت تێك مەدەو لەجێی خۆتەوە دەرونت پاك ڕابگرە، مادام قەزاو قەدەری خوایی لەکاردایەو باوەڕهێنانیشت بە ئیسلام بەشێکی بریتیە لە باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر بە هەردووك بارەکەیدا.

ئارام لە خۆت مەبڕە، بەرانبەر کۆست و کۆسپ و ڕووداوەکانی شەو (واتە دنیا) چونکە ئەم دنیایە شەوەو لە قیامەتدا ڕۆژی ڕاستەقینەو نەبڕاوە هەڵدێت و ڕوداوە دنیاییەکان خەسڵەتی بەردەوامییان تێدا نیە، کەسێکی بێ وورەو ترساو مەبە، بە دلێری و خۆڕاگریەوە زاڵ بە بەسەر کۆسپەکانداو، با تۆی باوەڕدار ڕەوشتی لێبوردەیی و لەخۆبوردن و ئەمەکداریت تێدا بێ، کە ئەوانە ڕەوشتی باوەڕدارانن، لە کاتی ناخۆشیەکاندا بەوەفا بەو خۆشیەکانی ڕابردووت لەیاد بێت، جا ئەگەر ئەو ڕەوشتانەت تێدا چەسپ بوو، ئەوا هەرچەندە بە ڕوکەش نەنگی و کەموکوڕیت لەناو خەڵکیدا هەبێ، ئەو خووانە دەبنە سەر قەپاغی داپۆشینی ئەو کەم و کوڕی و نهێنیانەت.

بەخشندەیی و ڕێزداری دەبێتە هۆی داپۆشینی نەنگی و کەچی و عەیبەکان، هەروەها سەخاوەتمەندان وایان گوتووە.

---

(١) شاعیرانی کوردیش هەیە وەك هی گەلانی تر هاوشێوەی ئەو هۆنراوانەیان هەیە کە گلەیی لەسەردەم و ڕۆژگار دەکەن و بە چەرخی چەپگەرد ناویان بردووە، وریا بن خوای گەورە دەفەرموێ (جوێن بە کات مەدەن، کە من کاتم).

زەلیل و کەسیف و بێ دەرەتان و داماو خۆت نیشانی دوژمنانت مەدە، چونکە هەمیشە دوژمنان لە دەرفەت دەگەڕێن بۆ ئەوەی گێچەڵ و بەلآت بۆ دروست بکەن، تکاو داوای لێبوردن و بەخشندەیی لە مرۆڤی چروك و دەست تەنگ مەکە، خۆت دەزانیت کە مرۆڤی تینوو ئاوی لە ئاگرەوە دەست ناکەوێت، کەواتە تۆش لە چروکەوە ئەوەت دەست ناکەوێت کە لێی دەخوازیت و پێویستتە، وا مەزانە کە حەوانەوەو پشوو بەخۆدانت لەسەر کارکردن تەمەڵیەو گوایە دەبێتە مایەی کەمکردنەوەی ڕۆزی و بژێویت، دیسانەوە بێتەوە بیرت کە خودای گەورە بەپێی قەدەری خۆت بڕی ڕۆزیشی بۆ دیاریکردویت، ئەوەش وەك بەخاو خلیچکیت کەم ناکات، بە هەڵپەو خۆماندوکردنی زیادەشت زیاتر نابێ، پێویست ناکات خەم داتگرێت بۆ هەژاریت و دڵیشت بە دەوڵەمەندیت خۆش مەکە، نە لە شتی ماددی و نە لە مەعنەویەکاندا، چونکە هیچ شتێ لە دنیادا تا سەرو بەردەوام نابێ، گرنگ ئەوەیە تۆ سەرەداوی دڵخۆشی خۆت بدۆزیتەوە، ئەویش ئەوەیە کە دڵت پڕ لە قەناعەت و ڕازی بوون بێت، ئەوسا تۆ و پادشای سەرزەوی جیاوازیتان نابێ، چونکە ئەو پارەو پایەکەی دڵخۆشە کە هەیەتی، تۆش بەو قەناعەتە دڵت خۆشە کە هەیتە، بەلآم قەناعەت مانای ڕازی بوونە بەو بەشەی کە هەیتە دوای هەوڵ و کۆشش، نەك پێش ئەوانە.

ئەگەر پێت وایە پاشایی و پارەوپایە لە مەرگ دەتپارێزن، ئەوا هەر کە نۆرە مەرگت هات و مردن هاتە کایەو گۆڕەپانی ژینی تۆوە، ئەوا هەموو شوێنێکت پێ تەنگ دەبێ و هیچ کەس و جێگەیەك نابنە سوپەر و قەڵغانت نە زەوی و نە ئاسمان، گەرچی زەوی و ئاسمانی خودا فراوانە بەلآم بۆ تەواوکردنی کاری مەرگت هەردوولایان دەبنە چەرمە چۆلەکە، لەبەرئەوە لێگەرێ با غەدرەکانی ڕۆژگارت بەسەر بێن (کە دەسەلآتت بەسەریاندا نیە)، دڵنیاش بە کە دەرمانی چارەسەری مەرگت دەستناکەوێ، مەرگ دەردی بێ دەرمانە، بۆ هەمووانە، دنیای پێش مەرگت وێران بوو، دە هەوڵدە دنیای دوای مەرگت ئاوەدانکەرەوە.[1]

(١) ص١٥/ الرضا بقضاء الله و قدره/ {دَعِ الأيام، تفعل ما تَشاء}

# الرضا بقضاء الله و قدره

دَعِ ٱلأَيَّــامَ، تَفْعَــلُ مَــا تَشَــاءُ وَطِــبْ نَفْســاً إِذَا حَكَــمَ القَضَــاءُ
وَ لا تَجْــزَعْ لِحادِثَــةِ اللّيــالي فَمَــا لِحَــوادِثِ الــدُّنْيا بَقَــاءُ
وَكُــنْ رَجُــلاً علــى الأَهْــوالِ جَلْــداً وَشِــيمَتُكَ الســمَاحَةُ وَالْوَفَــاءُ
وَإِنْ كَثُــرَتْ عُيُوبُــكَ فِي البَرَايَــا وَسَــرْكَ أَنْ يَكُــونَ لَهــا غِطَــاءُ
تَسَــتَّرْ بِالسَّــخاءِ فَكُــلُّ عَيْــبٍ يُغَطِّيــهِ كَمَــا قِيــلَ السَّــخَاءُ
وَلا تُــرِ لِلأَعَــادِي قَــطُّ ذلاً فَــإِنَّ شَــمَاتَةَ ٱلأَعَــدا بَــلاءُ
وَلا تَــرْجُ السَّــماحَةَ مِــنْ بَخِيــلِ فَمَــا فِــي النَّــارِ لِلظَّمْــآنِ مَــاءُ
وَرِزْقُــكَ لَــيْسَ يُنقِصُــهُ التَــأَنِّي وَلَــيْسَ يَزِيــدُ فِي الــرِّزْقِ ٱلعَنــاءُ
وَلا حُــزْنٌ يَــدُومُ وَ لا سُــرورٌ وَ لا بُــؤْسٌ عَلَيْــكَ وَ لا رَخَــاءُ
إِذَا مَــا كُنْــتَ ذَا قَلْــبٍ قَنُــوعٍ فَأَنْــتَ وَ مَالِــكُ ٱلــدُّنْيا سَــوَاءُ
وَمَــنْ نَزَلَــتْ بِسَــاحَتِهِ ٱلمَنَايَــا فَــلا أَرْضٌ يَقِيــهِ وَلا سَــمَاءُ
وَأَرْضُ اللهِ وَاسِــعَةٌ وَلَكِــنْ إِذَا نَــزَلَ ٱلقَضَــا ضَــاقَ الْفَضــاءُ
دَعِ الْأَيَّــامَ تَغْــدِرُ كَــلَّ حِــينٍ فَمَــا يُغْــني عَــنِ الْمَــوْتِ الــدَّوَاءُ

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٢):

## (ڕازی بوون بە قەزا و قەدەری خوایی)

لێگەڕێ، ڕۆژگار چی دەوێ بیکا     دەرونپاکبە تۆ، قەزا کار ئەکا
بێ ئارام مەبە، لە کۆستی شەوگار     ڕووداوی دنیا زۆر دەوام ناکا
مەردێك بە، بەهێز بەسەر زەحمەتا     لێبوردیی و ئەمەك[1] سەربەرزت ئەکا
ئەنگیشت[2] زۆر بێ لەناو خەڵکیدا     ڕاز و نهێنیت پەردەپۆش ئەکا
دەهەندەیی[3] تۆ، ئەنگیت دەپۆشێ     وا دەڵێن ئەوی[4] دەهەندەیی کا
بۆ دوژمن هەرگیز خۆت کەسیف نەکەی     خووی وایە نەیار بەلآت زۆر ئەکا
تکای لێبوردن نەکەی لە چرووك[5]     ئاگر بۆ تینوو ئاو پەیدا ناکا
ڕۆزیت کەم نابێ بە سستی جوڵەت     ماندوبونیشت زیاتری ناکا
شادی و دڵتەنگی هەتا سەر نابن     دەستکورتی و تێریش وا زۆر بڕ ناکا
کە تۆ دڵەکەت پڕ قەناعەت بێ     تۆ و پاشای دنیا وەك یەك لێدەکا
کەسێ کە مەرگ بێتە ناو کایەی[6]     ئاسمان و زەویش بەرگری ناکا
زەمینی خودا، بەرینە گەرچی     قەزا دابەزێ بەرتەنگی دەکا
لێگەڕێ، ڕۆژگار با هەر غەدرکا     دەرمانێك نیە چارەی مەرگ کا

---

(١) لێبوردی: لێبوردەیی، ئەمەك: وەفاداریی، دژی سپڵەیی.

(٢) ئەنگی: کەچیی، خواروخێچی، لارولەوێریی: العیب.

(٣) دەهەندەیی: بەخشندەیی، دژی چروکی: الجود.

(٤) ئەوی: واتە ئەوەی: ئەو کەسەی.

(٥) چرووك: دەست تەنگ، ڕەزیل، بەخیل، پێچەوانەی دەهەندە.

(٦) کایە: ئەو ناوەندەیە کە دەوری شتێك دەدات و شتەکە بووەتە چەق بۆی.

# دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٣)

دوور نیە کە هەندێ کەس تەنها لە تەمەنی پیری خۆیاندا، حاڵ و گوزەرانی پیربوونیان بێتەوە یاد، ئەو دەمانەی کە نیشانەکانی پیربوونیان تێدا دەرکەوت ئەوسا بە خۆیان بزانن کە تەمەن زۆری لێ ڕۆیشت و کەمی ماوە، بەڵام پێشەوا شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا ئەگەرچی خۆیشی پیر نەبووە، وێنەیەکی جوانی پیربوونی کێشاوە، سەرەتا باس لەوە دەکات کە گرو کفی دەروونە سەرکەشە گەنجیەکەی جارانی نەماوەو خامۆش بووە، لە دوخی سەریدا تاڵە مووی سپی هێرشیان هێناوە بۆ پانتایی سەر، مووە ڕەشەکانیان سپی کردەوە، تەمەنی ڕەش کردەوەو بەرەو شەو بردی، مووە سپییەکان دەدرەوشێنەوە، شەوق دەدەن، بە ئاشکرا لە بەرزترین لوتکەی کەللە سەرەوە بانگەوازی پیری بوونی خاوەنەکەی ڕادەگەیەنن، ئەو مووە ڕەشەکانی وێچواندووە بە قەلە ڕەش و کونە بەبویشی بە بایەقوشی بەدخوێن، کە مەبەستی لە (پیریی)یە و هاتووە هێلانەی قەلە ڕەشەکانی کە وێرانەیەو خۆی هێلانەی تێدا کردووە، سروشتی بایەقوشیش وایە کە هەمیشە حەزی لە شوێنی کاول و کەلاوە و وێرانەیە تا هێلانەی تێدا بکات، ئەمەش بەوەی کە زانیویەتی ماڵی جەستەم وێرانەو شەل و شکست بووە و تەمەنم کەوتووەتە سەر هات و نەهات و چاوەڕوانی مەرگم، دیسانەوە یادی ڕووناڵی و تەمەنی گەنجێتی خۆی دەکاتەوە و دەڵێت: ئەوە ژیان بوو، ئێستاکە وزە و بڕشتم نەماوە چ چێژێك لە ژیاندا ماوە؟ لەم پیریەمدا چەندین خۆراکی خۆشم لێ قەدەغەیەو تینی پشت و ئەژنۆکانم لاوازە، کۆڵمە ئاڵەکانی جارانم زەرد و سپی هەڵگەڕاون، مووەکانم بوونە چەرموو، سپی بوون، چرچ و لۆچ ڕوخساری داگرتووم، وا دەبینم کە ئیتر کانی چێژەکان گەیشتە دوا چۆڕ و دوا دڵۆپ، ئینجا چاوەڕوانی ئەوەم کە لافاو و سێڵاوی مەرگ تەمەنم ڕامالێ.

سەرلەنوێ شافیعی خ.ل دەگەڕێتەوە سەر سەرکۆنەکردنی دەرون و حەزەکانی خۆی و بە خۆی دەڵێ: ئەی دەرونە تێر نەخۆرەکەم ئیتر بەسە، واز لە کرداری بەد

و خراپ بێنه و مەمكەرە قوربانی چێژ و حەزە بێ سنورەكانت، خۆ تۆ تەمەنێكت بڕیوەن ئەزموونێكت دیوە، زۆر نەگونجاوە بەم تەمەنەتەوە خۆت بخەیتە بەر لافاوی حەز و ئارەزووە سەرشێتەكانت، لە كاتێكدا لافاوێكی تر وا ڕووی تێكردووی و بەرەو رووت دێت، كە لافاوی مەرگە، دەبێ ئێستا تۆ تەوبە بكەیت و لە هەڵەو كەموكوڕیەكانی تەمەنی ڕابردووت پەشیمان بیتەوەو بە كردەوەی چاك و خواپەرستی زۆرت زەكاتی ئەو تەمەنەیشت دەركەی، چونكە تەمەنیش وەك سامان و پارەو پول زەكاتی هەیە و فەرموو بڕۆ زەكاتەكەی بدە، پاشان دێتە سەر باسی هەندێ لەو كارانەی كە دەبێ وەك زەكات بیانكەیت، لەوانەش چاكەكاریی، بەخشندەیی، بێ فیزی و سادەیی، ئەمانەش ئەو بازرگانی و كاسبیەیە كە دەبێ لە ئێستاوە كاریان تێدا بكەی، قازانج كۆبكەیتەوە بۆ قیامەتی خۆت، ئەم ئامۆژگاری و قسانەی منت لەسەر دڵ گران نەبێ، لەخۆت بایی مەبە و مەڵێ جا خۆیشم ئەوانە دەزانم...! ڕاستە دەیانزانی، بەڵام ئایا جێبەجێشیان دەكەیت؟ چونكە قازانجی بازرگانیەكەت لەلای خودا لەسەر زانینی ئەوانە نیە، بەڵكو لەسەر بڕ و چۆنێتی جێبەجێ كردنەكەیانە، بێ فیزانە گوێم بۆ بگرە، منیش و تۆش لە تۆزی خاك دروستكراوین و دەشبینەوە بە تۆزێك خاك و تەپوتۆزو (با) دەمانبات، كەواتە با سادە و خاكی بین بەر لەوەی بە خاك بین.

ئەفەرموێت: ڕاستە دنیا خۆش و لە دڵا شیرینە، وا دروست كراوە كە نەفسی مرۆڤ ئارەزووی بكات و هۆگری بێت و تامەزرۆی بێت، بەڵام دەفەرموێت: من تام و چێژی ئەم دنیایەم كرد، وەرن لە منی پیر بپرسن كامەیە چێژ و تامی؟ ئەوەی من دیم لەدنیادا تامێكی دوو چێژ بوو (تاڵ و شیرین، خۆشی و ناخۆشی) بەڵام هەردووكیشیان ماوەیان كەم و كورت بوو، زۆر زوو تەواو بوو، وەكو سەراب و تراویلكە بوو كە لە بیابانا دەبریسكایەوە و بە ئاوی تێگەیشتین و ئاو نەبوو، بەزۆری تێگەیشتین و وانە بوو، بە ئاوای تێگەیشتین و وێرانە بوو، هەروەكو خوای گەورە لە فەرموودەیەكی قودسیدا دەفەرموێت: (دنیا كەلاكی مردووەو سەگەلە برسیەكان لێی كۆدەبنەوە) كە گۆشتی پێوە نەما ئیتر لێی دوور دەكەونەوەو پشتی

تێدەکەن، ئەم دنیایەش سروشتی وایە، چونکە پێچەوانەی ژیانی هەتا هەتایە، کە ڕووی تێکەی پشتت تێدەکا، کە پشتی تێکەی بە دواتا ڕادەکا، بەم جۆرە شافیعی خ.ل لە کۆتایی هۆنراوەکەیدا نزای خێر بۆ ئەو کەسانە دەکات کە سەربەرزانە دەرگا و دەروازەی حەزە بۆگەنەکانی دەرونی خۆیان داخستووە و پەردەکانیان داداوەتەوە، تاکو نە بۆنی پیسیان بەسەردا بێ و نە دیمەنە دزێو و قێزەونەکانی ئارەزووە بەد و گڵاوەکان ببینن، وا دیارە کردەوە بەدەکان بۆن و بەرامەیان هەیە و تەنها ئارەزووە بەدەکەی دەروونە پیسەکان پەی بەو بۆنە دەکەن و بەدوایدا دەچن و لێی کۆدەبنەوە، ڕۆژانە بە چاوی خۆمان ئەوە دەبینین کە کەسە خراپەکان لە دەوری کەسە هاو خوەکانی خۆیان کۆدەبنەوە، گەرچی یەکتریش نەناسن، دەڵێی یەك بۆن کۆی کردونەتەوە..![1]

## مظاهر الشيب و محاسن الأعمال

خَبَتْ نَارُ نَفْسِي بِاْشتِعالِ مَفَارِقِي ... وَأَظْلَمَ لَيْلِي إِذْ أَضَاءَ شِهَابُها
أَيَا بومَةً قَدْ عَشَّشَتْ فَوْقَ هَامَتِي ... عَلَى ٱلرَّغمِ مِنِّي حِيْنَ طَارَ غُرَابُها
رَأَيْتِ خَرَابَ ٱلعُمْرِ مِنِّي فَزُرْتِني ... وَمَأْوَاكِ مِن كُلِّ الدِّيَارِ خَرَابُها
أَأَنْعَمُ عَيْشاً بَعْدَ ما حَلَّ عَارِضِي ... طَلاَئِعُ شَيْبٍ لَيْسَ يُغْنِي خِضابُهَا؟
إِذَا اْصْفَرَّ لَوْنُ ٱلمَرْءِ وَٱبْيَضَّ شَعْرُهُ ... تَنَغَّصَ مِنْ أَيَّامِهِ مُسْتَطَابُهَا
فَدَعْ عَنْكَ سَوءَاتِ ٱلأُمُورِ فَإِنَّها ... حَرَامٌ عَلَى نَفْسِ ٱلتَّقِيِّ ٱرْتِكابُها
وَأَدِّ زَكَاةَ ٱلجَاهِ وَٱعْلَمْ بِأَنَّها ... كَمِثْلِ زَكاةِ ٱلمَالِ تَمَّ نِصَابُها
وأَحْسِنْ إِلَى ٱلأَحرَارِ تَمْلِكْ رِقَابَهُمْ ... فَخَيْرُ تِجَارَاتِ ٱلكِرَامِ اكْتِسابُهَا
وَلا تَمْشِيَنْ فِي مَنْكِبِ ٱلأَرْضِ فَاخِراً ... فَعَمَّا قَلِيلٍ يَحْتَوِيكَ تُرَابُهَا
وَمَنْ يَذُقِ ٱلدُّنْيا فَإِنِّي طَعِمْتُها ... وَسِيقَ إِلَيْنَا عَذْبُهَا وَعَذَابُهَا

---

(١) ص٢٠/ مظاهر الشيب و محاسن الأعمال

{خبت نار نفسي، بأشتعال مفارقي..}

فَلَـــمْ أرَهَـــا إلاّ غُـــرُورا وَ بـــاطِلاً كـــمالاَحَ فِي ظَهْـــرِ اَلْفَـلاَةِ سَرَابُـــها

وَمَـا هِـــيَ إلاّ جِيفَـــةٌ مُسْتَحِيلَـــةٌ عَلَيـــها كِـــلاَبٌ هَمُّـــهُنَّ اجتِـــذَابُهَا

فَـإنْ تَجْتَنِبْهـا كُنْـــتَ سِـلْماً لِأهْلِهـا وَإنْ تَجْتَذِبْـــهَا نَـــازَعَتْـــكَ كِلاَبُهَـا

فَطُـوبى لِـنَفْسٍ أُولِعَـتْ قَعْـرَ دَارِهـا مُغَلَّقَـةَ الأبْـوَابِ مُـرْخَـــىً حِجَابُهَـا

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٣):

### (نیشانەکانی پیری و کردەوە چاکیی)

گــڕی دەروونــم خــامۆش بــوو، کــە ســـەرم مـوی سـپی لێهـات

شەوی تەمەنم تاریك بوو، کە موی چەرموم پرشکی پیری هەڵئەدات

کــام بـایەقـــوش لـــە ســـەر ســـەرم هێـــلانەی کـــرد؟

قـــەلە ڕەشـەکـانـــی دەرکـــرد، ئـــاوا بـە فرکانـێ[١] خـۆی هـات؟

لانـەتـــان کـــرد! بـایەقـوشـــان[٢] لـەســـــەر ســـــەرم

دەزانـــن ئـــیتر تەمـــەنم کەوتـۆتـــە ســـەر هـــات و نـــەهات

سروشتـــــی وایـــــە بـایەقـــــوش، هـــــەتا مـــــاوە

تـــامـەزرۆیـــە بـــۆ وێرانـــە و بۆ حەوش و ماڵی تورەهـات[٣]

چێــژی چـــی لـــەم ژینـــەدا بـــێ؟ گەشـــی کـــوڵمانم نـەماوە

بـــێ ســـوودە بـۆیـاخـی قـــژم[٤]، سوپای سپی لەسەردا هـات

کـــە ڕوخســـارم زەرد هـــەڵـــگەڕاو مـــووەکـانم بوونـە چـەرموو

چێـــــژ داچـــــۆڕا، وا سێـــــڵاوی مـــــەرگ دەمبـــــات

---

(١) فرکانێ: بە خێرایی، لەپڕ، لەناکاو، بە تیژی.

(٢) بایەقوش: کونە بەبوو، هێمایەك بووە، بۆ شەڕ و بەدبەختی و وێرانە خوازی.

(٣) تورەهات: پڕوپوچ و بێ نرخ و بەها، بێ سەرەو بەرە.

(٤) مرۆڤی سەر سپی، چەند بۆیاخی قژی بکات، کوڵم و ڕوخساری هەر پیرانەیە.

دەی دەست لە کاری بەد، بەردە، دەرونەکەم
نارەوایە کە تەقوا کار لافاوی ئارەزوو بیبات
زەکاتی پایەی خۆت دەرکە، بێگومان و دڵنیابە
تەمەنیشت سامانێکە، گەیشتۆتە ئاستی زەکات
لەگەڵ خەڵکی چاکەکار بە، بەوە دەبیتە خاوەنیان
بەخشندەبە، کە بەو کارە، چاکە خوازان ڕووت تێ دەکات
بە فیزەوە بە چوار دانگەی ئەم زەمینەدا ڕەت مەبە
کەمێکی ترهەر خاکی ئەم زەمینەیە لە باوەشی خۆیت دەکات
هەرکەس تامەزرۆی دنیایە، من چەشتومە
ساز و ناسازیمان بینی، گەلێ زوو بوو بەکۆتا هات
وای دەبینم، ئەم دنیایە، بەتاڵێکە بایت دەکا
وەك چۆن، پانتایی بیابان، تراویلکە نیشان دەدات
هیچ شتێ نیە، مەگەر کەلاکێکی مردار
خۆی لێ لادەی لەو گۆڵمەزە، بێ وەی دەبی
بشتەوێ بۆ خۆتی بێنی، سەگەل پەلامارت دەدات
کە سەگەل تێی وروکاوە، بەملاولا ڕەکێشی دەکا
سەربەرز بێ ئەو دەروونەی لە ماڵی خۆی نیشتەجێیە
دەرگاکانی کڵۆم[1] دەدا و پەردەکانیشی داوەدات

(١) کلۆم دراوە: داخراوە، کلیل دراوە.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٤)

پێویستە مرۆڤ تەنها خۆی لەگەڵ یەک ژینگە و وڵات ڕانەهێنێ، بەڵکو هەموو زەوی موڵکی خوایە، مرۆڤەکان مافی خۆیانە کە لە کوێ بیانەوێ بژین، بژین، گەشت و گەڕیان مرۆڤ فێری گەلێ زانیاری نوێ و نەریت و ڕەوشتی جوان و کرانەوەی ژیری دەکات، بۆیە گەڕان بە مەبەستی دیتنی دروستکراوەکان و شارەزابوون و گەشت و فێربوون جگە لە دەستکەوتی دنیایی، پاداشتی لای خوای گەورەش زۆرە، هەر لەبەر ئەو هۆکارانەشە کە زانا و ژیر و داناییان بەردەوام لە گەڕان و گەڕیدەیی دان، نیشتەجێ بوون لە بوونەوە تا مردن لە تەنها یەک شوێن و شار و گوند و وڵاتێک باش نیە، ئیمامی شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەیدا هانمان دەدات بۆ گەشت و گەڕان و دنیا دیدەیی، تا بزانین ژیان و گوزەرانی خەڵکانی تر چیە و چۆنە، ئەزموونی لێوە فێر بین، نامۆیی ببینین، مەترسە، وا مەزانە ئەوەی هەیتە لە شوێنی تر دەستت ناکەوێ، بگرە خوای گەورە چاکتر لەوەت پێ دەبەخشێ بە مەرجێ بەو ئامانجانە و لەبەر خودای گەورە کۆچ بکەیت.

دەفەرموێت: تەماشای کانی و گۆم و چەم و ئاوەکان بکەن، تەنانەت ئاویش کە پاکەرەوەیە، ئەگەر ڕاوەستاو بێت و نەجوڵێ، ئەوا کرم لێی دەدات و بۆگەن دەکات، بۆیە بەردەوام لە دەورو خول و جوڵەو هاژەدایە، ئەو ڕەوت و چوونەیەتی کە بەهای پێ دراوەو پاکی کردووەتەوە، هەروەها نمونەی ترمان دەخاتە بەر نیگاو دەفەرموێت: گیانەوەرێکی ئازای وەکو (شێر)یش ئەگەر لە بێشەکەیدا پاڵ بکەوێ و نەگەڕێ و نەجوڵێ، بژێوی و نێچیری دەست ناکەوێت، یان خۆراکی تازەو شایستە بە خۆی نابێت، بگرە تیروکەوان و چەکەکەت چەندە چاک و تۆکمە و مۆدێل بەرزبن، هیچ سودێکی نیە، ئەگەر بەکاری نەهێنی، (تیر) چەند تیژ و قایم بێ هەتا لە کەوان بەرەو نیشان دەرنەپەڕێ و نەجوڵێ، سودی نیەو بەهاو نرخ پەیدا ناکات.

(خۆر)یش بەو هەموو گەورەیی و گەرمیەی خۆیەوە هەرگیز ڕاناوەستێ و جۆرەها جوڵە لە خولگەی خۆیدا بەرپا دەکات، چونکە بە ڕاوەستانی خۆر ژیانیش

ڕادەوەستێ، جگە لەوەش خەڵکی بێزار دەبن لە شتێك كە هەمیشە لەژوور سەریانەوە بێ كە خۆرە، بۆیە خۆریش بە ڕەوت و چوونی، هەڵاتن و ئاوابوونی ڕێز پەیدا دەكاتەوە، بە ونبوونی شەوانەی ڕۆژ بەها پەیدا دەكات، بە ونبوونی ڕۆژانەی تریفەی مانگەشەومان لەلا جوانتر دەبێ.

ئەگەر سەیری خاك و خۆڵی زەوی بكەین، پێكهاتەیە لە جۆرەها ڕەگەز و تۆخمی هەمە چەشن، لەو شوێن و خاكەی كە تیایەتی تێكەڵە لەگەڵ كانزا هەرزانەكان و بەهایەكی ئەوتۆی نیە، بەڵام كە دەردەهێنرێ و پوختە دەكرێ و بەرەو شوێنی تر دەبرێت و كۆچ دەكات ئەوسا بەهاو نرخی خۆی دەست دەكەوێت.

زۆرجار كەسێك لە گوند و شار و وڵاتی خۆی بەهاو نرخێكی زۆری نیە و قەدری خۆی نابێ، كە ڕوو دەكاتە ناو گەل و وڵاتی تر ئەوسا دەناسرێ و نرخی خۆی دەدۆزێتەوە.

هەروەها نمونەی (داری بوخورد) دەهێنێتەوە كە لە زێد و جێی خۆی دارو دەوەنێكی ئاسایی یە، وەكو هەموو دارو دەوەنی تر، بەڵام كە دەبڕدرێت و دەكرێت بە شووڵی بۆن و بەرامەدار و دەبرێت بۆ وڵاتانی تر، ئینجا نرخ و بەهای پێویستی دەست دەكەوێت.

كەواتە گەڕان و ڕەوت و ڕۆ، كۆچ كردن و سەیران و گەڕیدەیی، كاروانكردن و وڵاتگەڕان زۆر سوودی هەیە بۆ مرۆڤ، بە تەنها بێ، یان لەگەڵ خێزان.(١)

## الحض على التَّرحال

مَــا فِي الْمُقَــامِ لِــذِي عَقْــلٍ وَذِي أَدَبِ ... مِــنْ رَاحَــةٍ فَـدَعِ الأَوْطَـانَ وَاغْتَـرِبِ

سَافِرْ تَجِدْ عِوَضاً عَمَّنْ تُفَــارِقُهُ ... وَانْصَبْ فَإِنَّ لَذِيذَ الْعَيْشِ فِي النَّصَبِ

إِنِّـي رَأَيْـتُ وُقُـوفَ الْمَـاءِ يُفْسِــدُهُ ... إِنْ سَـاحَ طَابَ وَإِنْ لَمْ يَجْرِ لَـمْ يَطِبِ

وَالأُسدُ لَوْلا فِرَاقُ الأَرْضِ مَا افْتَرَسَتْ ... وَالسَّهْمُ لَــوْلا فِرَاقُ الْقَوْسِ لَـمْ يُصِبِ

---

(١) ص٢٦/ الحض على الترحال

وَالشَّمْسُ لَوْ وَقَفَتْ في الفُلْكِ دَائِمَةً لَمَلَّهَا النَّاسُ مِنْ عُجْمٍ وَمِنْ عَرَبِ
وَالتِّبْرُ كَالتُّرْبِ مُلْقَىً في أَمَاكِنِهِ وَالعُودُ في أرضِهِ نَوْعٌ مِنَ الْحَطَبِ
فَإِنْ تَغَرَّبَ هذَا عَزَّ مَطْلَبُهُ وَإِنْ تَغَربَ ذَاكَ عَزَّ كَالذَّهَبِ

دەقی هۆنراوەی ژمارە (٤):

## (هاندان بۆ گەڕان)

نیشتەجێ بوون، بۆ خاوەن ژیری و ئەدیبان
ئاسودەیی تێدا نیە، برۆ، نامۆیی وڵاتان
دەی بگەڕێ، قەرەبووی دابڕانیشت، دەدۆزیەوە
دەست بەکار بە، چێژی ژیان، وا لە کۆشش و لە گەڕیان
وا دەبینم، وەستانی ئاو، دەبێتە مایەی تێکچوونی
کە دەگەڕێ، پاکژ دەبێ، کە وەستاوە، بۆگەناوێکی بێ پایان
(شێر)یش ئەگەر لە زەوی قاچی دانەبڕێ، ڕاوی نابێ
(تیر) لە (کەوان) دەرباز نەبێ، ناتوانێ (بدا) لە نیشان
بەردەوام (ڕۆژ)، لە خولگەیدا، ڕاوەستاو بێ
خەڵکی هەموو بێزار دەبن، لە عەرەب و لە بیانیەکان
لە زێدی خۆی، زێڕ، خۆڵ ئاسا، لە خاکایە
(بوخورد) لە وڵاتی خۆیا، جۆرێکە لە داری سووتان
ئەمیان بڕوا، گرانتر دەبێ، خواستەکەی
ئەویان ڕەوکا، ئازیز دەبێ، هەروەکو ئاڵتونی گران

# دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٥)

## فێڵبازیی خەڵکی:

(محمد)ی کوری (ئیبراهیم) گێڕایەوە کە (شوعەیب)ی کوڕی (محمد)ی دوبەیلی گوتی: شافیعی فەرمووی[(١)]:

خۆزگە ئەو سەگەلانەی لە دەوروبەرمان دەژین و دراوسێمانن، دراوسێمان نەبوونایە، خۆزگە هیچ کامێك لە ئێمەی مرۆڤ ئەوەی لەو سەگانە دەیبینین نەماندەبینی، چونکە ئەوان لە شێوازی ژیان و گوزەران و ڕۆزی خۆیان پازین و نۆر بە چاکی دایانمەزراندووەو پەیڕەوی یاساکانی سروشت و ڕێنماییە خواییەکان دەکەن، شەڕ بە یەکتری نافرۆشن و یەکتری ناخۆن، بەرگری لە یەکتری دەکەن، خۆراك و کەلاك و ڕۆزی لەنێوان خۆیاندا دابەش دەکەن، ئاسوودەن بە ژیانی سەگەلیی خۆیان، کەچی کۆمەڵگەی خەڵکی و مرۆڤەکان پەندێك لەو دراوسێیانە وەرناگرن، هەڵوێستەیەك ناکەن، لە شەڕ و ناکۆکی و دژایەتی یەکتری واز ناهێنن، ڕێی ڕێنمایی و هیدایەت ناگرنە بەر، کەواتە ئەی مرۆڤ، واز لە تێکەڵاوی ئەو جۆرە کەسانە بێنە، تێکەڵاو بوون و هۆگر بوونی خەڵکی ئەگەر خێر و خۆشی و ئاسودەیی دنیا و قیامەتی تێدا نەبێ، واز لەو تێکەڵاویە بێنە و تەنها هۆگری خۆت بە، بۆ خۆت مشوری خۆت بخۆ، لە نەفسی خۆت بپرسەوە، دیارە بەوەیان سەرکەوتوو تر دەبی و بەختەوەرتر و دڵشاد دەبی.

کەواتە مەرجی سەرەکی دەستکەوتنی خێر و بێرە، ئەگەر لە تێکەڵاوی و هۆگری خەڵکیدا بەدیت کرد، بەردەوام بە، ئەگەر وانەبوو بەخۆتا بچۆرەوە، لەوان وازبێنە و هۆگر و فریاکەوتەی خۆت بە.[(٢)]

---

(١)

(٢) ص٣٦/ مکر الناس/ لیت الکلاب لنا کانت

## مكر الناس

لَيْتَ الْكِلابَ لَنَــا كَانَتْ مُجَــاوِرَةً / وَلَيْتَنَـا لا نَـرَى مِمَّـا نَــرَى أَحَـدَا

إِنَّ الكِــلابَ لَتَهْـدِي فـي مَوَاطِنِهَـا / وَالخَلْـقُ لَـيْسَ بِهَـادٍ شَــرُّهُمْ أَبَــدَا

فَـاهْرُبْ بِنَفسِـكَ واسْـتَأْنِسْ بِوَحْـدَتِهَا / تَبْقَـى سَـعِيداً إِذَا مَـا كُنْـتَ مُنْفَـرِدَا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٥)

### (فرت و فێڵی خەڵکی)

خۆزیـــا، ئـــەو ســـەگەلانە[1]، دراوســـێمان بوونایـــا

بـــریا هیـــچ کـــام لـــە ئێمـــە، مرۆڤمـــان نـــەدیبایا

ســـەگەل لـــە ژینگـــەی[2] خـــۆیان پابەنـــدی ڕێنمـــایین

کەچـــی بـــۆ ڕێنومـــایی، خەڵـــکی هـــەر شـــەڕیان لایـــە

ڕاکـــە، ســـەرت هەڵگـــەر، هۆگـــری تـــەنـــهایی بـــە

بـــە دڵشـــادانە دەژی، کـــە ئـــەو خـــێری تێدایـــە

### دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٦)

(شێر) کە هێمای دلێری و گەورەیی و دەسەڵات و سەرکردایەتی و ئازایەتی و دادپەروەریە، شایستەی خۆیەتی کە پاشای دارستان بێ و شکۆی خۆی هەبێ، دەبێ گیانەوەرانیش بەها و نرخی ئەو بزانن و بە سووك تەماشای نەکەن، مرۆڤی خانەدان و نەجیب و دەروون بەرزیش وێ دەچێ بەشێر، پێشەوا شافیعی لەم کورتە هۆنراوەیەیدا باس لەوە دەکات، کە بە داخەوە هەندێ گەل و کۆمەڵی خەڵك هەیە کە ڕێز و قەدری سەردار و نەجیب زادە و بە قەدرەکانی خۆی ناگرێ، بە

---

(١) لە نوسخەیەکی تردا (شێر) و (شێرگەل) هاتووە لەجیاتی (سەگەل).

(٢) لە نوسخەیەکی تردا (شێر) و (شێرگەل) هاتووە لەجیاتی (سەگەل)

پێچەوانەوە نانەجیب و کەسانی سووك و دەست و داوێن پیسیان لەلا باشترە لەو کەسە پاکانە، کەسە پاکەکانیش حورمەت و شکۆی خۆیان دەپارێزن و قەناعەت بە هەژاری خۆیان دەکەن، ئەوەتا شێری چاپوك لە بێشەو دارستان و هێلانەکەی خۆیدا لە برسانا دەمرێ، کەچی سەگەل و هەرچی و پەرچی و ناخانەدانان و ماستاوچیەکان، تێر و تەسەلن و لەسەر هیچ پەکیان ناکەوێ. خەڵکیان گەمژە کردووە و بە زمانی لوس فریویانی داوە، وردە.. وردە ئەو خەڵکە لەگەڵ ئەو بارەدا ڕاهاتوون، گوێڕایەڵی ئەو گەمژە و نانەجیبە دەکەن، درۆی ئەو بەباشتر دەزانن، لە ڕاستیەکانی نەجیب زادە و دیندارەکە، سەرەنجام شێرەکە بە نەفس بەرزی خۆیەوە لە برسانا دەمرێت و سەگەلەکەش بە تێر و تەسەلی ژیان دەگوزەرێنن، شێرەکە لەسەر زەوی ڕووت دادەنیشێ و دەخەوێ، هەرچی و پەرچیەکانیش جلوبەرگی ئاوریشم لەبەر دەکەن و پێڵاویان لە زێڕە، ئەمە ئەو بارودۆخە ترسناکەیە کە ڕوو بکاتە هەر گەل و میللەتێك ڕیسوا دەبن، هەروەکو چۆن دەسەلاتی فیرعەون ئیشی لەسەر گەمژەکردنی خەڵکی دەکرد، ئەنجامەکەشیان چەشت.[1]

**الحظوظ**

تَمُـــوتُ الأسْـــدُ فِي الْغَابَـــاتِ جُوعـــاً
وَلَحْـــمُ الضَّـــأنِ تَأكُلُـــهُ الْكِـــلابُ
وَعَبْـــدٌ قَـــدْ يَنَـــامُ عَلَـــى حَرِيـــرٍ
وَذُو نَسَـــبٍ مَفارِشُـــهُ التُّـــرَابُ

---

(١) ص١٩/الحظوظ/ تموت الأُسُدُ في الغابات جوعاً

**دەقی هۆنراوەی ژمارە (٦):**

**(بەختەوەر)**

شـــێری بێشـــە، لـــە برســـانا، گیـــان ئەبەخشـــێ
ســـەگەلیش لـــە گۆشتـــــی بـــەران، تێـــر و تۆڵـــە
ناکـــەس بەچـــە، لەســـەر ئاوریشـــم دەخـــەوێ
خانـــەدانیش، ڕاخەرەکـــەی خـــاك و خۆڵـــە[1]

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٧)

هەرکەسە و ڕێز و شکۆیەکی خۆی هەیە لە کۆمەڵدا، بەڵام هەندێ کەس بە ڕووکەش ڕێز و شکۆیان هەیە، جا یان بەهۆی دەسەڵات و پلەوپایەیانەوەیە یان بەهۆی پول و پارەو سامانەوە، یان بەهەر هۆیەکی تری دنیایی یەوە، جا ئەم کەسانە هەرکات هۆکاری ئەو شکۆمەندیەیان لەدەستدا، ئەوا حورمەت و شکۆشیان نامێنێ، بەڵام شکۆی ڕاستەقینە کە پەیوەندی بە ڕەوشت و ڕاستگۆیی و خواپەرستیەوە هەیە، هەمیشە بەردەوامە، گەرچی کەسەکە بێ کەس و پارەو پایەش بێ، جا ئەگەر کەسێك خۆی بەڕێز نەبێ، ڕێزداری بەترس و تێڵا لە دڵی خەڵکدا دروست ناکرێ، خۆ ئەگەر کەسەکە خۆیشی بەڕێز بوو، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ شکۆ و گەورەیی خۆی، شکۆداری ڕاستەقینە لە کەسە دڵ مەزن و خواناسەکاندا دروست دەبێ و دەردەکەوێ، جا ئەگەر کەسێکتان بینی کە خەڵکی لە دەوری کۆببوونەوەو بە ڕووکەش ڕێزی دەگرن و لە ڕاستیشدا شایانی ئەو ڕێزە نیە، ئەوا لەناکاو دەکەوێ و کەسی بە دەورەوە نامێنێ، ئەم دیمەنەش وەکو ئەوە وایە کە منداڵێك لەو سەرجادە و کۆڵانانە یاری بکات و هیچ بایەخێکی (جدّی) نیە.[2]

---

(١) یان بە شێوەی وەرگێڕانی وشەیی نوسیومە:

شـــێری بێشـــە لەبرســـانا گیـــان ئەبەخشـــن
گۆشـــتی مـــەڕیش، خـــۆراکی ســـەگەلەکانە
ناکـــەس بەچـــە لەســـەر ئاوریشـــم دەخـــەوێ
نـــەجیب زادان، خـــاك و خۆڵـــە ڕاخەریانـــە

(٢) ص٢٦/ غرور المظهر/ أری العزّ في الدنیا اذا کان فاضلاً

**غرور المظهر**

أرى الغِـرَّ في الـدُّنْيَا إذَا كـانَ فَاضِـلاً     تَرَقَّـى عَلَـى رُوس الرِّجَـالِ وَيَخْطُـبُ

وَإنْ كـانَ مِثْلـي لا فَضـيلَةَ عِنْـــدَهُ     يُـــقَاسُ بِطِــفْلٍ في الشَّوَارِعِ يَلْعَبُ

## دەقی هۆنراوە ژمارە (٧):

وادەبیـنم شـکۆداری لـە دنیـادا بـۆ کەسێـکە خـۆی بـەڕێزە

لەسـەر سـەری گـەورە پیـاوان دەردەکـەوێ و گەشـە دەکـا

خـۆ ئەگـەر ئـەویش وەکـو مـن، نەبیـێ ئـەو گـەورەیی و ڕێـزە

بـەراوردە بـە منـدالێك لـە ڕێ و کـۆلان یـاری دەکـا

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٨)

یـەکێك لـە هۆیـەکانی بێـزاری و خـەمباری خـەڵکی و دەرونپەستییان، بریتیـە لەوەی کە زۆر خۆیان بە خەڵکەوە سەرقاڵ دەکەن و خۆیان هەڵدەدەنە ناو گێژاوی ململانێ و دژ وەستانەوەیان، بـەڵام ئەگـەر مـرۆڤ لێبوردەبـێ لـە خـەڵکی و نەفسـی خـۆی بـە کـەم و تـەنگ نـەبینێ، ڕق لـەم و لـەو هەڵنـەگرێ، ئـەوا دەرونـی خـۆی دەحەوێتەوەو سەرقاڵ نابـێ بـە شـەڕی لابـەلاوە، چـونکە دوژمنـداریی خـۆی چـەند ناخۆشە، خەم و پەژارەو ترس و دوودڵی و قینە قینەکەی لەوە ناخۆشترە، ئەو زاتە بـەرزە دەفـەرموێت: مـن خـۆم کـەس بـە دوژمـن نـاگرم و دروسـتی ناکـەم، ئەگـەر کەسێکیش خۆی دوژمنایەتیم بکات، ئەوا من حیسابی بۆ ناکەم و دانابەزمـە ئاسـتی ئەوەوە بۆ دوژمنایـەتی کردنـی، بـەڵکو زۆر بـە ئاسـایی وەکـو هـەموو کەسـانی تـر سڵاوی لێ دەکـەم، چـونکە سـڵاوکردن کلیلـی دروسـتکردنی ئاشـتی یـە، لەلایـەکی تـرەوە بـەو سـڵاوە شـەرمەزاری دەکـەم و گومانـە خراپـەکانی دەسـڕمەوەو لـە شەڕەکەیشی خۆم دەپارێزم ڕووی گەش و بێ کینەی خۆمی نیشان دەدەم، چونکە لە بنەڕەتدا منی موسڵمان دڵم پاکەو جێی شتی پیسی تێدا نابێتـەوە، دیـارە مـرۆڤ

چی لە دڵیدا بێ، ئەوەشی لێ دەردەکەوێ، من کاسەی دڵم پڕە لە خۆشەویستی، لە ڕاستیشدا خەڵك بۆ خۆیان دەرد و نەخۆشن، نەخۆش و دەردەداریشن، نزیکبوونەوەی زۆر و بێ سنوریان لە یەکتری دەردە کوشندەکەیە، کەچی دابڕانی تەواوەتیش هەر خراپە و دەبێتە مایەی بێ ئاگایی لە یەکتری و پچڕانی پەتی خزمایەتی و سۆز و خۆشەویستی بۆیە پێویستە کە پەیوەندی مرۆڤەکان سنوردار بێ و دابڕانیش نەکرێتە نەریت. ئیسلام بەوەوە جوانە کە هێڵی ناوەڕاست و مامناوەندی یە لە هەموو شتێکدا، تەنانەت خوای گەورە هەندێ گەل و نەتەوەی پوکاندەوە و دەسەڵاتی لێ سەندنەوە، چونکە زێدەڕەویان کرد لە ئاینی خوادا و سەرەنجام دینەکەیان وا ناشرین کرد کە خەڵکی لێی دوورکەوتنەوە و کەسە بەناو دیندار و ملۆزمەکانیش بوونە مشەخۆر بەسەر ئاینەکەوەو کەوتنە بازرگانی پێوەکردنی، لە کاتێکدا دینی خودا بۆ ڕزگاری هەموو مرۆڤەکان و بەختەوەری و ئاسودەیی هەردوو دنیایە.

دەبێ مرۆڤ بە چاوی مرۆڤانە بڕوانێتە هەموو کەسەکان و ماف و هەقی ئەوان بپارێزێت و بە حیکمەت و زانست و لۆژیکەوە پەیامی ڕاستەقینەی خوایان بۆ ڕوون بکاتەوە، جا ئەگەر کەسێك بەوەش هەر باوەڕی نەکرد و ئیسلامی قەبوڵ نەکرد، ئەوا ئازادەو نابێ بەرەبەرەکانێ و دوژمنایەتی بکرێت، تا ئەو کاتەی کە ئەو ڕێگەی شەڕ دەگرێتەبەر، ئەوسا باوەڕداران ڕێگەگریی دەکەن و بەرگری دەکەن.[1]

---

(١) ص٢٨/مكارم الأخلاق/ لمّا عفوت ولم احقد على أحدِ

## مكارم الأخلاق

لَمَّا عَفَوْتُ وَلَمْ أحْقِدْ عَلى أحَدٍ أرَحْتُ نَفْسِي مِنْ هَمِّ الْعَدَاواتِ
إنِّي أُحَيِّ عَدُوِّي عِنْدَ رُؤْيَتِهِ لأدْفَعَ الشَّرَّ عَنِّي بِالتَّحِيَّاتِ
وأُظْهِرُ الْبِشْرَ لِلإنْسَانِ أبْغضهُ كما إنْ قَ حَشَى قَلْبي مَحَبَّاتِ
النَّاسُ دَاءُ وداء النَّا س قُرْبُهُم وَفي اعْتِزَالِهِمُ قَطْعُ المَوَدَّاتِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٨):

### (ڕەوشت بەرزیی)

کاتێ کە لێبوردە بووم و ڕقم لە هیچ کەس هەڵنەگرت
دەروونی خۆم ئاسودە کرد، لە پەژارەی دوژمنداریی
تاکو لادەم لە شەڕخوازی دوژمنەکەم
کە دەیبینم، سڵاو دەکەم لە دیداری
من ڕووخۆشی خۆم دەنوێنم بۆ نەیارم
هەروەك دڵم پڕ خۆشەویستیە باری
ئەو خەڵکانە خۆیان دەردن، لێکنزیکبوونە، دەرمانی
دورکەوتنەوەش دابڕانە لە خۆشەویستی سۆزداری

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٩)

مرۆڤ مرۆڤەکانی تری خۆش دەوێ، بەڵام خۆشەویستیەکەیشی پلەپلەیە، شافیعی خ.ل دەفەرموێت: من هەموو هاوڕێ و برایانی دینیم خۆش دەوێن، بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە بە شکستی من شاد نابن و لە کەوتنمدا دەستم دەگرن و ناهێڵن بکەومە خراپەوە، خۆشم دەوێ ئەوەیان کە لە کاروبارە چاکەکاندا پشتیوانم دەکات، ئەوە دەکات کە دەمەوێ، کە چاکە خوازیە، خۆم و نهێنییەکانم،

ناموس و ئابڕووم، کەسێتی و بەهام دەپارێزێ، جا من لە ژیاندا مابم، یان مردبم ئەو هەر پارێزەرمە، بەڵام بەو جۆرە وەسفانە، بەڕاستی تا ئێستا کەسم نەدۆزیوەتەوە بەو چەشنە بێ، خۆ ئەگەر هەبێ و هاوڕێم بێ ئەوا حیسابی برای بۆ دەکەم و دەیکەمە هاوبەش لە خێری هەموو چاکەکانمدا، چونکە دڵنیام لەلایەکەوە ئەویش من دەکاتە هاوبەشی چاکەکانی خۆی لەلایەکی تریشەوە ئەو چاکانەی منیش دەیانکەم زۆربەیان بە هاریکاری و هاندانی ئەوە، هیچ نەبێ دنەم نادات بۆ کاری خراپ.

ئەفەرموێ: یەکە یەکە ئەو هاوڕێ و برادەرانەم خوێندەوە، هەڵسەنگاندن، لەناو ئەو کەسە زۆرانەدا، کە بە ژمارە زۆر بوون، کەمێکیان متمانەدار بوون، یان جێی متمانەی تێکەڵاوی و هاوڕێیەتی بوون.

لەم هۆنراوەیەدا ئاماژە بەوە دەکات کە هاوڕێیەتی بەپێی جۆرایەتیە نەک چەندایەتی، هاوڕێ تاکو لە سەنگ و سوژنی نەدەی و هەڵی نەسەنگێنی نابێ بیکەیتە هاوڕێ، چونکە هاوڕێ وێنەیەکی تری خۆتە.[1]

## خيرة الأصحاب

أحِـبُّ مِـــنَ الإخْـوانِ كُـلَّ مُـوَاتي ... وَكـلَّ غضـيض الطَّـرْفِ عَـنْ عَثَرَاتـي
يُـوَافِقُني فِي كُـلِّ أمْـــرٍ أُرِيــــدُهُ ... وَيَحْفَـظنيـ حَيًّــا وَبَعْـدَ مَمَــاتي
فَمَـنْ لـي بِهـذا؟ لَيْـتَ أنّـي أصَـبْتُهُ ... لَقَاسَـمْتُهُ مَـا لـي مِــنَ الْحَسَـنَاتِ
تَصَـفَّحْتُ إخْــواني فكَــانَ أقَلَّهُــمْ ... عَلـى كَثْـرَةِ الإخْـوانِ أهْـلُ ثِقَـاتي

(١) ص٢٩/خيرة الأصحاب/ أحب من الأخوان كل مواتي

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٩):

## (باشترین هاوڕێ)

برایـــانم گشـــت خـــۆش دەوێـــن، لــــەناویانا بەتایبـــەتی
ئـــەوەیان چـــاوی دەپۆشـــێ کاتــــێ دەکەومــــە نشوســـتی
لــــە هــــەموو کــــارێکی چــــاکا، پشـــتیوانە، لەگەڵمایــــە
دەمپـــارێزێ لــــە ئێســـتاما و کاتــــێ نــــەشمام لــــەم دنیایــــە
دەبـــــێ کـــــێ بـــــێ؟ ئــــەو هاوڕێیــــەی کــــە ئاوابــــێ؟
تـــاکو ئێســـتا مـــن نەمـــدیوە، ئـــەو خەســـڵەتانەی تێـــدابێ
هـــەڤاڵێك لــە ئــەو چەشــنە بــێ، گــەر بێتــە یــاوەری ژیــانم
دەیـــــکەمە هاوبەشــــی هــــەموو کـــارو کــــــردەوە چــــاکانم
کەســــــانم هەڵسەنگانـــــــد هـــــــەموو، کــــــەس وانـــــــەبوو
گەرچــــی زۆرن بـــــە ژمێـــــرە، بـــــەڵام کــــەمیان متمانــــەی بـــوو

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٠)

لەم هۆنراوەیەدا شافیعی خ.ل بە زمـانی حـاڵ لەگـەڵ بەختەوەریـدا دەدوێـت و پێـی دەڵـێ: ئـەی بەختـەوەری لـەکوێیت؟ وەرە بـۆ لام بـا خـەمباریی یەخـەم پـێ نەگرێت، چونکە وا هەست دەکەم کـە خـوای گـەورە بەرەکـەت و بەخشیشـی زۆری پێداوم و لەسەر هیچ پەکم نەکەوتووە، بگرە بە هێندەی تۆزقاڵێکی بەخشیشـەکانی سوپاسم نەکردووە، شەیتان دەیەوێت بێتە بـن کڵێشـەم و فریـوم بـدات بـە فیکـر و خـەیالاتی خـراپ، لەلایەکـەوە دەڵـێ کـوا ڕزق و ڕۆزی و پـارەو پولـت بـۆ خـەرجی سبەینێ؟ ئـەی دوو سـبەی؟ ئـەی بـۆ منداڵـەکانت؟ بـەڵام کـە خـودا ڕۆژی بەسـەردا هێنام، ئەوا ڕزق و ڕۆزی ئەو ڕۆژەشـم دەدات، کـە سـبەینێش مـام ئـەوا سـبەینێش دیسان هەر ڕۆزی و بەشی ئەو ڕۆژەمی پێیە، ئەمانە تـەماح و چاوبرسـێتی و ترسـی ڕزقە لە ویستی نەفسی پیسمەوە دەردەپەڕن، ئەوا منیش ئەو نەفسە تێـر نـەخۆرە

ترسنۆکەم سەرکوت کرد، وازم هێنا لە ویست و حەزە بەدەکانم و تەنها و تەنها ویستی تۆم دەوێ.[1]

### التسليم الخالص

إذَا أصْـبَحْتُ عِنْـدِي قُـوتُ يَـوْمِي　　فَخَـلِّ الْهَـمَّ عَنِّـي يَـا سَـعِيدُ

وَلا تخْطُــرْ هُمُــوم غَـد بِبَـالِي　　فَـإنَّ غَـدًا لَـهُ رِزْقٌ جَدِيـدُ

أُسَلِّــمُ إنْ أرَادَ اللهُ أمْــراً　　فَـأتْرُكُ مَـا أُرِيـدُ لِمَـا يُرِيـدُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە(١٠):

#### (خۆدانە دەست خودا بەتەواوەتی)

کە ڕۆژم لێبووەوە ئەمڕۆ، ڕۆزی ئەم ڕۆژەشم هەبێ

دەوەرە، ئەی بەختەوەریی، لابە خەمم، با هەر نەمبێ

نەهێڵی خەمی سبەینێ، سەر بکێشێتە ناو بیرم

چونکە سبەی، لەگەڵ خۆیا، ڕۆزی تازەیشی پێ دەبێ

ملکەچی فەرمانی خودام، کە فەرمانێکی پێداوم

وازم هێناوە لە ویستم، هەتاکو ئەو ویستی هەبێ

### دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١١)

ڕۆژ و شەو بەدوای یەکدا دێن و دەڕۆن، چەندەها کەس هەیە کە تا بەریەیان ناخەون، جا یان کارو پیشەیان وایە، یاخود خەم و پەژارە، یان ئاهەنگ و شادی، یا پاسەوانی، یا بەندایەتی و لەخواترسان، هەندێ کەسیش لە کاتی ئاسایی خەوتن دا لێی دەخەوێ، تاکو بەیانی زوو هەستێتەوە سەر کارو پیشەی خۆی، هەردوو جۆرە کەسەکان، بە ئاگا و خەوتووەکان خەوتن و نەخەوتنیان لە پێناوی کارو

---

(١) ص٣٩/التسليم الخالص/ إذا أصبحت عندي قوت يومي

مەبەستێکایە، جا یان بۆ ئەوەیە نەهێڵێ کارێکی نەخوازراو ڕووبدات، یان هەوڵ دەدات کارێکی خوازراو ڕووبدات، کەواتە ئەو خەوتن و نەخەوتنە پەیوەندی بە ڕوونەدان یان ڕوودانی کارێکەوە هەیە، کارەکەش دوو ئەگەری هەیە، ئەگەری ڕوودان و ئەگەری ڕوونەدان، هەردووکیشیان تەنها خودا دەیزانێ ئایا ڕوودەدات یان ڕوونادات، مرۆڤ زانیاری و دەسەڵاتی لەوەدا نیە بزانێ ئاخۆ سبەینێ چی ڕوو دەدات. لەبەرئەوە دەروونت پڕ مەکە لە زوخاوی خەم و پەژارە بۆ ڕووداوێك کە نازانی ئاخۆ ڕوودەدات یان نا، کاتەکەی دێتە پێشت یان نا؟ ئەو خەمە بێ سەروبەرانە لە دڵت دەرکە و مەیانکە بە خەورزێنی شەوانەت، بەڕاستی ئەگەر وا بکەیت، مانای جۆرێك لە شێتیت بۆ خۆت دروست کردووە و یەك کۆڵی گران لە خەمت لە کۆڵی خۆت ناوە، دە تۆ سەرنج لە ژیانی ڕابردووی دوێنێی خۆت بدە، هات ڕوویدا، تۆش تیایدا ژیایت، تێپەڕی، تازە ناشگەڕێتەوە، ئەوەی دوێنێی بەتۆدا، هەر ئەویشە کە سبەینێشت پێ دەدات، ئەگەر بیەوێت، ئەوەشت پێ دەبەخشێ کە بۆ ژیانی سبەینێت پێویستە و بۆی نوسیویت کە دەبێ بەسەرتدا ڕووبدات، ئەو بیەوێ، دەبێ ببێ، ئەگەر چی هیچ کەس نەیەوێ، ئەو نەیەوێ کەس ناتوانێ کە بیکات گەرچی هەموو کەسیش بیەوێ.

واتا بۆ ڕابردوو، بۆ ئێستا، بۆ ئاینده تەنها خودامان بەسەو هیچی تر، با بەتەواوەتی پشت بەو خودایە ببەستین. چ بۆ ژیانمان و چ بۆ ئەو شتانەی دەیخوازێ.(١)

## ترك الهموم

سَهِرَتْ أعينٌ، وَنَامَتْ عُيونُ ... في أُمورٍ تَكونُ أوْلاَ تَكونُ

فادْرَإِ الهَمَّ مَا استَطعْتَ عَنْ النَّفْ ... سِ فحملاُنكَ الهُمُومَ جُنُونُ

إنَّ رَبّاً كَفَاكَ بالأمسِ مَا كاَ ... نَ سَيكْفِيكَ في غَدٍ مَا يَكونُ

(١) ص٨٥/ ترك الهموم/ سهرت اعين، ونامت عيون

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١١)

### (وازهێنان لە خەم)

شـــەونخونن، کۆمـــەڵێ چـــاو، هەنـــدێکی تـــر لـــە خەودایـــە
هـــــــەردوولایان کـــە ئاوایـــە، لـــە پێنـــاو چـــەند کارێکایـــە
هەریەکـــەیان یـــان ڕوونـــادەن، وە یـــا ڕوودانیـــان ئاسـایە
تـــا دەتـوانیـــــت، لـــــە دەروونـــــت، خـــــەم بـــــە بـــا کـــە
لـــــە شێتـــــــیتە بـــــاری خەمـــــــت لـــــــە بارایـــــــە
پـــــەروەردگارێکت بەســــە، دوێنێـــی بـــۆ دەســـتەبەر کـــردی
بـــۆ ســـبەینێش ئـــەوت بەســـە، لـــەوەی دەبـــێ و لـــە ڕێتایـــە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٢)

(ابن کثیر) لە کتێبی (البدایة والنهایة) بەرگی (١٠) لاپەڕە (٢٥٤) دا دەڵێت: شـافیعی دەیفـەرموو: قورئـان فەرموودەیـەکی نـاوەدیهێنراوە (غـیر مخلـوق) هەرکەسـیش بڵـێ بـەدیهێنراوە، ئـەوە بـێ بـاوەڕە، کـە قورئـانی دەخوێنـدەوە ئایەتەکانی سیفەتەکان و فەرموودەکانی بەو شێوەیە دەبینی کە پێشینەی ڕابـردوو دەیانبینی و هیچ تۆبزیەکی لە خـۆی نـەدەکرد، (کـوڕی خوزەیمـە) دەڵێ (المزنـي) هۆنراوەیەکی بۆ خوێندمەوە و گوتی (شافیعی) ئەم هۆنراوەیەی بۆ خۆی وتووە:

کە ڕوو دەکاتە خودا و دەڵێت: هەر شتێك کە بتەوێ ڕوویـدات ڕوویـدا، گەرچـی منیش خواستم وا نەبوو بێ، وە ئەوەش کە نەتەویست ڕوویـدا، ڕووی نـەدا گەرچـی وام نەویستبا، هەر خۆت بەندەکانت دروست کردووە بۆ ئەو مەبەستەی دەتـەوێت و خـۆت دەیزانـی، ئـەو زانسـت و زانینـەش لاو و پـیر و بەساڵاچـوو دەهـەژێنێ، ئـەو کەسـانە هەمـە جـۆرن هەیانـە سروشـتی شـەڕخوازانە و بـەدکاریی هەیـە، هەیانـە ئاسودەو ئاشت و بێکێشەیە، هەیە ڕەزاگران و درێوە، کەچی کەسانی وا هەیە چاك

و چاكەكارە، ئەی خودایە خۆت منەت بەسەر ئەمیاندا دەكەی و چاكەی لەگەڵ دەكەی، ئەوی دیكەیان ریسوا و رەنج بە با دەكەی، چاودێری ئەمیان دەكەی و ئەوی تریان فەرامۆش دەكەی و چاودێری خۆتی لێ لادەدەی و دوچاری چەندین گرفت و كێشە دەبێ.(١)

## المشيئة الألهية

مَـا شِئْـتَ كَـانَ، وإنْ لَـمْ أشَـأْ
وَمَـا شِئْـتُ إنْ لَـمْ تَشـأْ لَـمْ يَكُـنْ

خَلَقْـتَ العِبَـادَ لِمَـا قَـدْ عَلِمْـتَ
فَفِـي العِلْـمِ تَجـرِي الفَتَـى والمُسِـنْ

فَمِنْهُـمْ شَقِـيٌّ، وَمِـنْهُمْ سَـعِيدٌ
وَمِنْهُـمْ قَبِيـحٌ، وَمِـنْهُمْ حَسَـنْ

عَلَـى اذَا، مَنَنْـتَ، وَهـذَا خَـذَلْتَ،
وَذَاكَ أعنْـتَ وَذَا لَـمْ تُـعِنْ

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٢)

## (ویستی پەروەردگار)

چیت ویست روویدا، گەرچی واشم نەویستبێ
چیم ویست نەبوو، كە ویستی تۆ وا نەبووبێ
بەندەكانت وەدیهێنا، بۆ مەبەستێ خۆت دەزانی
هەر لە زانینی تۆدایە، كەسێ لاوە، یا لەتەمەن و سالابێ
لەوانیشدا لاسار، درێو، یا دڵشاد، و بەختەوەرە
هەیە خراپ و بەدكارە، هەیشە لە جۆرێ چاكا بێ
بە ئەمیان دەبەخشی پایە و چی چاكە بۆی
ئەوی تریان سوك دەكەی و تا ماوە دەبێ ریسوا بێ
یارمەتی ئەمیان دەدەیت و لە هەموو شتێ پارێزراوە
ئەمی تریان وەلادەنێی، چاودێری تۆی لەسەر نابێ

---

(١) ص٨٣/المشيئة الألهية/ ما شئت كان، وإن لم أشأ/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٣)

هەریەکەمان نەنگی و کەچیمان تێدایە، بەڵام کاتێك بە چاوی ڕەزامەندی و یەکتر قەبوڵکردنەوە بۆ یەکتری دەڕوانین هەڵەو نەنگیەکانی یەکتری نابینن، بەڵام کە نەیار و ناحەز بۆمان دەڕوانێ، یان خۆمان بۆ نەیارەکانمان دەڕوانین ئەوا نەك هەر عەیبەکان بەدی دەکەین، بەڵکو زۆر بە گەورەیی دەیانبینین، نابمە ترسێنەر، یان هەواڵدەرێکی ترسێنەر بۆ کەسێك کە ئەویش بەرانبەرم وانەبێ، مانای وایە بۆ کەسی تریش وانەبووە، منیش کەچی و نەنگی لەو کەسانەدا نابینم کە لە مندا نایبینێ، ڕاستیەکەیشی ئەوەیە کە خۆ بەخۆ هەر گلەیی و کەمیەکم تێدا دەبینی، پێم بڵێ، با ڕاستی بکەمەوە، منیش بۆ تۆ وادەبم، بەڵام هیچمان لەناو خەڵکیدا عەیبی یەکتری باس ناکەین، دنیا بۆ دنیایە، ئەگەر تۆ منت خۆش دەوێ و لێم نزیك دەبیتەوە ئەوا منیش بۆ تۆ وادەبم، وا نەبی، وانابم و لێت دوور دەکەومەوە.

خۆ لەگەڵ یەکتریشدا نەبین، سبەینێ هەر دەچینەوە بەر بارەگای خودا و وا لەم دنیایەشدا هەریەکەمان سەربەخۆ ژیانمان دەگوزەرێنین، هاواری هیچ کاممان لە قیامەتدا نابێتە مایەی فریاگوزاری ئەوی ترمان، با ئەوەندەش لە یەکتری ڕازی نەبین کە عەیبی یەکتری بپۆشین لەلای یەکتری، باش وایە هەر یەکەمان ئاوێنە بین بۆ ئەوی ترمان، خۆمان لە یەکتریدا ببینینەوە.(١)

### عين الرضا كليلة

وَعَـينُ الرِّضَـا عَـنْ كُـلِّ عَيْـبٍ كَليلَـةُ ... وَلَكِـنَّ عَـينَ السُّخْطِ تَبْـدِي المَسَـاوِيَا

وَلَسْــتُ بَهيــَّابٍ لِمَــنْ لا يَهَــابُني ... وَلَسْــتُ أرَى لِلمـرْءِ مَـا لا يَـرَى لِيَـا

فَـإنْ تَـدنُ مِـني، تَـدْنُ مِنْـكَ مَـودَتي ... وَانْ تَنْـأَ عَـني، تَلْقَـني عَنْـكَ نَائِيَـا

كِلانَـا غَنِـيٌّ عَــنْ أخِيــهِ حَيَاتَــهُ ... وَنَحْـنُ اذَا مِتْنَــا أشَــدُّ تَغَــانِيَا

---

(١) ص٩١/عين الرضا كليلة/ وعين الرضا عن كل عيب كليلة/١

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٣):

## (چاوی ڕەزامەندی نەنگی نەبینە)

چـاوێ، ڕەزامەنـد بڕوانـێ، لـە کەسـا (کەچـیی) نـابینێ
بـەڵام چـاوێ کـە ناحـەزە، خراپـەی تێـدا زل دەبـێ
ترسێنـەر نـابم بـۆ کەسـێ، کاتـێ ئـەو مـن نەترسـێنێ
(کەچـیی) لـە کەسـێ نـابینم، کـە بینـەری (کەچـیی)م نـەبێ
جـا ئەگـەر نزیـك وەبـی، سـۆزی منـت لێ نزیکـە
کـاتێکیش خـۆم لـێ دەبـوێری، منـیش حـەزی دووریـم دەبـێ
هەریەکـەمان بـۆ خـۆی دەژی وەکـو دوو بـرای سـەربەخۆ
کاتـێ مـردین، پێویسـت نەبوونمـان بـە یـەکتر زیـاتر دەبـێ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٤)

نـزا و پاڕانـەوە، پانتاییـەکی گـەورەی پێکهێنـاوە لـە پـەیڕەوی سـەرجەم ئایینەکانـدا، بەشـێکی زۆری بەندایـەتی مـرۆڤیش بـۆ خـودا لـە نزاکانیدایـە، وەك: پاڕانەوە، نوێژکردن، کڕنوش بردن و...هتد.

یەکەم شت کە مرۆڤ لەدوای تکاو لەخوا پاڕانەوە دەیخوازێ ئەوەیە کە نزاکـەی وەرگیراو بێ لەلای خودا، بـەو چەشنـەی کـە داوای کـردووە، بـەڵام خـودا لـە خـۆی باشترە بۆ خـۆی، بۆیـە زۆرجـار وەرگرتنـی نزاکـە بـەو جـۆرەی داواکـراوە خـراپ و زیانبەخشە بۆ کەسەکە، یان خوا خێـری زیـاتر لـەوەی بـۆ دانـاوە بـۆ دواڕۆژ، بۆیـە نزاکەی بەو چەشنە وەرناگیرێ کە ئەو داوای کردبوو، بـەڵکو چەشـن و کاتەکەیشـی لای خودا شیاوی گۆڕینە، هەروەها خودا هەموو نزایـەك وەرنـاگرێ کـە مەرجـەکانی نزاو نزاکاریی تێدا نەبێ، بۆ نموونە کەسێکی خراپ دوعا و نزای خراپ لـە کەسـێکی چاك بکات، ئەوە وەرگیراو نیە.

بەلام نزیکترین کەس بۆ نزا لێوەرگرتن ئەو کەسەیە کە خواپەرستی ڕاستەقینەیەو بە ناهەق ستەمی لێ دەکرێت.

لێرەدا ئیمامی شافیعی خ.ل باسی ئەوە دەکات کە ئەو جۆرە نزایانە لای خوا نرخ و بەهای گەورەیان هەیە و گاڵتەیان پێ ناکرێ، بەلام ڕوودەکاتە ئەو کەسانەی گاڵتەیان بەو نزایانە دێت و بەکەم تەماشایان دەکەن. ئەوانە نەیانزانیوە کە ئەو جۆرە نزایانە (بەتایبەت نزاو نوێژ و پاڕانەوەی شەوانە) وەکو تیری دەست ڕاست وانە و سەر ناکا و بەسەر نیشاندا هەڵنابورێ و هەر ئامانج دەپێکێ و گیرا دەبێ، بەلام تەنها مەسەلەکە ماوەو کاتی دیاریکراوە، ماوەش هەرچەندە دوور بێ، هەر دێتە پێشەوەو ماوەکە بەسەر دەچێ و کاتی وەرگرتنی نزاکە دێ.

کەواتە کە نزامان کرد، با نزای چاك بە شێوەی چاك بکەین و داوای شتی چاك بکەین و پاشان پەلەمان نەبێ لە وەرگرتنی هەروەکو شافیعی خ.ل ڕوو دەکاتە ئەو کەسانەی بە کەم سەیری نزا و کاریگەری نزا دەکەن و دەفەرموێت: [١]

**قيمة الدعاء**

أَتَهْــــزَأُ بِالـــــدُّعَاءِ وَ تَزْدَرِيــــهِ      وَمَــا تَــدْرِي بِمَــا صَــنَعَ الــدُّعَاءُ

سِــــهَامُ اللَّيْــــــلِ وَلكِــــــنْ      لَهَــــــا أَمَــدٌ وَلِلأَمَــدِ انْقِضَــاءُ

**دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٤):**

**(بەهای نزا)**

تــۆ گاڵتـــەت بـــە نـــزا دێـــت و بـــێ نـــرخـــە لات
نـــاشـــزانـــــی نــــــزا چــــــی دەکـــــات
تـــیری شـــەوانە، ســـەر ناکـــا، کـــە دەردەچــــێ
مـــاوەیـەکــــــی هەیـــــە لــــــە کـــــات
مــــاوەش، هەرچـــەندێ دریـــژ بـــێ، بەسەرئەچـــێ

---

(١) ص١٧/قيمة الدعاء/أتهزأ بالدعاء و تزدريه/

# دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٥)

لە دێرەوە، لەناو شارستانیەتە دێرینەکان دا، زۆربەیان بە چاوی سوك و کەم سەیری ئافرەتیان کردووە، تەنانەت هەندێکیان وەك شەیتان و جنۆکە سەیریان کردووە، هەر ئەم بۆچوونە خراپەش وای کردووە کە ئافرەت وەکو کۆیلە و مرۆڤی ژمارە دوو تەماشا کراوە، کاری پێکراوەو لە چوار دیواری ماڵەوەدا بەندکراوەو گەلێك مافی پێ نەبڕاوە، بازرگانی پێوەکراوە، میراتی پێ نەدراوە، لە پۆست و ئەرکە نیشتمانیەکان دوور خراوەتەوە، ئەم نەریتە ماوەیەکی درێژ لە مێژوو بە شێوەی پچڕ پچڕ بەردەوام بووە، بەتایبەتیش لە ماوەی نێوان هاتنی دوو ئاینی ئاسمانیدا، کە ئایینی یەکەمیان بەرەو کاڵ بوونەوە چووە و هێشتا ئاینی دووەمیش نەهاتووە.

بۆ نمونە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات و ئافرەتی لەو بۆچوون و کۆتە درێوانە ڕزگار کرد، هاوشانی پیاو حیسابی بۆ کرد، هێنایەوە مەیدانی ژیان، تەنانەت لەم سەردەمەی خۆشماندا خەریکە وردە.. وردە.. ئافرەت دەکرێتەوە بە کۆیلە و بەکەم سەیر دەکرێت، ڕۆژانە بە چاوی خۆمان دەبینین کە وێنەی ئافرەت بەبێ بەرگی و ناشیرینی بەکار دەهێنرێت بۆ بانگەشەو ڕیکلام و بازاڕ گەرم کردن، بۆ پیاهەڵدان و گۆرانی و سەما، بۆ دەرکردنی جۆرەها فیلمی خراپ و بێ شەرمی لە دەزگا میدیاییەکاندا، وەکو جاری جاران ئێستا ئافرەت کراوە بە کارەکەر و بەکرێ گیراوە بۆ ماڵ خاوێنکردنەوەو منداڵپەروەری و گەلێ کاری تر.

لەو نەریتە کۆنانەی کە باو بووە لە سەردەمی پێش شافیعی و سەردەمی خۆی و بگرە تا ئێستاش، ئەو بۆچوونە هەڵەیە کە گوایە ژن بەڵایە، کە ئەمە بەڕای من بۆچـوونێکی زایۆنیانەیـەو ئامـانجی ئەوەیـە کـە لاوان لـە ژیـانی هاوسـەری دووربکەونەوەو بکەونە ناو داوی بەدکاری و داوێن پیسییەوە، بۆیە ئیمامی شافیعی خ.ل لەم کورتە هۆنراوەیەدا ئەو بۆچوونە هەڵەباوەی ناو خەڵکی ڕاست دەکاتەوەو دەفەرموێ: بەڵا ئەوە نیە کە لە ژندایە، بەڵکو بەڵای گەورە ئەوەیە کە ژن و پیاو

یەکتریان خۆش نەوێ و ژیانیشیان پێکەوە بەسەر بەرن، لەڕووی جەستەو خێزانیەوە لە یەکتری نزیك بن، بەڵام لە ناخ و دڵ و دەروونەوە لە یەکتری دوور بن و یەکتریان خۆش نەوێت، کەواتە بنەمای سەرەکی دورکەوتنەوە لە بەڵای خێزانی بریتیە لە خۆشەویستی نێوان هاوسەران.[1]

## جَهْدُ البَلاء

أكْثَـرَ النَّـاس في النِّسَـاءِ وَقَـالُوا إنَّ حُـبَّ النِّسَـاءِ جَهْـدُ الـبَلاَءِ
لَـيْسَ حُـبُّ النِّسَـاءِ جَهْـداً وَلكِـنْ قُـرْبُ مَـنْ لاَ تُحِـبُّ جُهْـدُ الْـبَلاَءِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٥):

خەڵکی زۆر لەسەر ژن دواون، گوتوشیانە:
گرانی بەڵا بزانە کە خۆشەویستی ژنانە
خۆشەویستی بۆ ئافرەتان گرانی ناو بەڵایە
بەڵکو نزیکی لە کەسێ خۆشت نەوێ، بەڵایەکی زۆر گرانە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٦)

پێشەوا شافیعی، کەسێکی دنیاگەڕ بووە، ڕێی کەوتووەتە ناو جۆرەها کۆڕ و کۆبونەوەی خەڵکی یەوە، لەم هۆنراوەیەدا ئاماژە بە کۆڕێك یان ئاپۆڕایەك لە خەڵکی دەکات، جا ئایا بەڕاستی وابووە، یان لە خەیاڵی خۆیدا دروستی کردووە، تاکو بزانرێ کە خەڵك و کۆڕی لەو جۆرەش هەیە، یان هەبووە، یان دەبێت، هەروەکو ئێستاش لەم سەردەمەی خۆماندا کۆڕی لەو جۆرە زۆرن.ئەو کەسانە ئاپۆڕاو ژاوەژاویان دروست کردبوو، خۆیان نەزان بوون، نرخی مرۆڤی بە ئەدەب و ئەدیب دۆست و زانایانیشیان نەدەزانی، وەك ئەوە وابوون کە بازرگانێك کەڵلەی بە

(١) ص١٨/جهد البلاء/ اكثر الناس في النساء قالوا...

نرخی مەڕ و بەران بگۆڕێتەوە بە کلکی بزن، ئەو کەسانەی لەو کۆڕەدا بوون، هەمە جۆر و هەمە ئاست بوون لە ڕووی ئاستی ژیری و زانست و ئەدەب و پایە و کەسێتی وەچە و تیرە و تایەفەیانەوە، وەکو ئەو خاکەی کە خاشاك و مس و خۆڵ و ئاڵتون تیایدا تێکەڵاو بێ، هەریەکە لەو کانزاو ماددانە ڕەنگ و ڕوخسار و بەهای خۆی نمایش بکات، ئاڵتون گەرچی ڕەنگی زەرد و بەنرخە، بەڵام لەلای ئەوان نرخێکی نەبوو، هەروەکو چۆن داری بوخورد بەو بۆن و بەرامە خۆشەیەوە، خەڵکی جیاوازی پێ نەکەن لەگەڵ داری ئاسایی سوتاندن.بەڕاستی زۆر ناخۆشە دانا و زانا و ڕۆشنبیر و ژیرێك بکەوێتە ناو ئەو جۆرە کەسانەوە و جۆری پیشەو کارەکەی یان گەشت و سەفەرەکەی، یان بەندیخانەکەی یان گەڕەك و دراوسێیەتیەکەی ناچاری بکات کە هەر دەبێ لەگەڵ ئەوانەدا بژی، ئەو داماوە فریای چاکسازی ئەو هەمووانە ناکەوێت و گیر دەخوات بە دەستیانەوە، ئەو خاڵە بەهێزەی لەم هۆنراوەیەدا بەدی دەکەم ئەوەیە کە شافیعی خ.ل باسی لەوە کردووە کە هەریەکە لەو کەسانەی ناو کۆڕەکە تایبەتمەندێتی خۆیان هەیە، لە یەکتری جیاوازن لە ئاستی ژیری و ئەدەب و لایەنی ڕەگەزی و تیرەیی، ئەوەش ئەمڕۆ لە دەرونزانی و پەروەردەدا بە (جیاوازی تاکەکەسی) ناو دەبرێت و مرۆڤەکانی سەر زەوی بەو هۆیەوە لەیەکتری جیاوازن، نەزانینی مامەڵەکردن لەگەڵ یەکتریدا بە قەبوڵکردنی ئەو جیاوازیانەوە ئەو جۆرە ناکۆکی و نەگونجان و ئاژاوانەی لێ دەکەوێتەوە کە ئەمڕۆ هەستی پێ دەکەین لە خێزان و کۆمەڵگەماندا، لە کاروباری دەوڵەت و حکومەت و دەزگاکانماندا، لە کارگە و پیشەو کۆمپانیاکانماندا.[1]

---

(١) ص١٩/ الأديب، أصبحت مُطرحاً في معشر جهلوا/

## الأديب

أصْــبَحْتُ مُطَّرَحــاً في مَعْشَــرٍ جَهِلَــوا — حَـقَّ الأديـبِ فَبَـاعُوا الـرَّأْسَ بِالـذَّنَبِ
والنَّـــاسُ يَجْمَعُهُـــمْ شَــمْلٌ، وَبَيْـــنَهُمُ — في العَقْــلِ فَـرْقٌ وَفِي الآدَابِ وَالحَسَــبِ
كَمِثْــلِ مَــا الــذَّهَبِ الإِبْرِيــزِ يَشْـرَكُهُ — في لَوْنِـهِ الصُّـفْرُ، وَالتَّفْضِـيلُ لِلـذَّهبِ
وَالعُـودُ لَـوْ لَـمْ تَطِـبْ مِنْـهُ رَوَائِحُـهُ — لَمْ يَفـرِقِ النَّـاسُ بَـيْنَ العُـودِ وَالحَطَـبِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٦):

### (ئەدیب)

ڕێمکەوتــە کۆڕێــك، ئــەدیـــب نــەناس بـــوون
کــەللـــــەی بــــەرانیان دا بـــە کلکـــی بـــز[١]
ئـــاپۆڕای خـــەڵکی چـــەند ئاســـت و جــــۆربوون
لـــە ژیـــری و ئـــەدەب، لـــە پایـــە و نـــەژاد
وەکـــو زێـــڕ لەگـــەڵ مـــس تێکـــەڵاو بـــوون
زەردیشیـــان هـــەبـــوو، کــــە زێـــڕی تێـــدا
بـــەڵام لای ئـــەوان هـــەموو یەکســـان بـــوون
داری بخوردیـــــش، گــــــەر بۆنـــــی نـەبـــا[٢]
وەك داری ئاســــا[٣] بــــۆ ســــووتان ئـــەبوون

---

(١) بز: بزن.

(٢) نەبا: نەبوایا

(٣) داری ئاسا: داری ئاسایی و چیلکە و داری سوتاندن و ئاگرکردنەوە کە ئەوسا سەرچاوەی یەکەمی سوتەمەنی بوون.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٧)

حەکیمێك دەڵێ: ئەگەر کەسێك جنێوی پێدای، تۆ بێدەنگ بەو وەڵامی مەدەرەوە، چونکە خەڵکی نازانن، کامتان کەسە ژێرەکەتانە.

مەرد و دانا چەند قسەی پێ بوترێ و بوختانی بۆ هەڵبەستن، کە ناخی پاك بێ، بەوە نەك هەر سووك نابێ، بەڵکو زۆر زیاتر بەرز دەبێتەوە، شەرمەزاری و نەنگیە بۆ کەسی ژێر کە وەڵامی ئەو گەمژە دەمشڕە بادێتەوە کە پیایدا هەڵدەخوێنێ، شافیعی لە سەر زاری ئەو کەسە ژێرە دەفەرموێت: من ئەگەر نەفس و کەسێتی خۆمم لەلا ئازیز و بەنرخ نەبێ، بمەوێ وەکو ئەو گەمژەیە خۆم سووك بکەم، ئەوا گەلێ قسەو بەرپەرچی لەوانەی ئەو بەهێزتر دەزانم، بەڵام من دەمەوێ پارێزراو بم، بەرژەوەندی نەفسی بەرزی خۆمم دەوێ بۆیە دەمبینی زۆر دەمسارد و بێ دەنگم بەرانبەر بەو گەمژەیە، تا بگەم بە خواستی خۆم، نەك خواستی ئەو، هاوکات خەم دەخۆم بۆ کەسێتی ئەویش، حەز دەکەم کە ئەویش خۆی سوك و ڕیسوا نەکات، هەڵوێستەیەك بکات و بەخۆیا بچێتەوە و واز لەو نەریتە خراپە بێنێ، بۆیە هێندە خاوم لە وەڵامدانەوەیدا، من ئەویش وەکو خۆم لەقەڵەم دەدەم و نامەوێ عەیبدار بێ، بەهۆی دەمشڕی و گەمژەیی خۆیەوە، واتا ئەم شێوزاە بەکاردەهێنم لەبەر خاتری چاکسازی ئەو، نەك تێرکردنی خواستی خۆم، بەم چەشنە هەردوولامان پارێزراو دەبین.

لە برگەی دووەمدا دەفەرموێت کە کەسێکی زمانشڕ و بەدگۆ بێ شەرمانە ڕووبەڕووم بدوێ و قسەی سووکم پێ بڵێ، بێز لە خۆم دەکەمەوە کە ئاستی خۆم هێندە دابەزێنم منیش وەکو ئەو بکەم و وەڵامی بدەمەوە، ئەو گەمژەیە بەو کارەی هەر زیاتر سووك و گەمژە دەبێ، منیش ئەگەر وەڵامی نەدەمەوە بە خۆشەرمتر و ئارامگرتر دەبم، هەروەکو چۆن داری بوخورد تاکو بسوتێ زیاتر بۆنی خۆش بڵاودەکاتەوە، منیش لە ناخەوە دەسوتێم بۆ ئەو ڕەوشتە خراپەی لە مرۆڤێکی ئاوا

گەمژەدا بەدی دەکەم و خەمی بۆ دەخۆم، ئەویش تا بسوتێ، هەر دوکەڵ و ڕەشی دەبەخشێ و من بۆن و بەرامەی خۆش پەخشان دەکەم.

مرۆڤ نابێ لە هەموو کاتێکا بێ وەڵام بێ، بەڵکو کاتێ گێل و گەمژە و کەم ئاستەکان دایدەگرنەوە بە قسەو جنێو دەبێ ئەم بێدەنگ بێ، ئەو بێدەنگیەش باشترین وەڵامە، بەڵام ئەگەر زانا و هۆشمەند لە ئاستی دیاریکراودا قسەو جنێوی وت، یان ڕەخنەی هەبوو، ئەوا دوای دڵنیابوونەوە لە ڕاستی یا ناڕاستی قسەکانی یان سوپاس دەکرێت، یان وەڵامی شیاو و گونجاوی دەدرێتەوە.

بەڵام گەمژە کە قسەی پێ وتی و تۆش وەڵامت دایەوە ئەوا باو بڕی سینەی دەردەچێ و دەیباتەوە، خۆ ئەگەر تۆش حەکیمانە بێ دەنگ بوویت ئەوا باو بڕی سینەی گوشاری لەسەر دروست دەکات و خەریکە لە داخا دەتەقێ.(١)

## السماحة وحسن الخلق

إذَا سَـبَّنِي نَـذْلٌ تَزَايَـدْتُ رِفْعَـةً ... وَمَـا العَيْـبُ إلاَّ أنْ أكُـونَ مُسَـابِبُهْ

وَلَـو لَـمْ تَكُـنْ نَفْسِـي عَلَـيَّ عَزِيـزَةً ... لَمَكَّنْتُـهَا مِـنْ كُـلِّ نَـذْلٍ تُحَارِبُـهْ

وَلَـوْ أنَّـني أسْـعَى لَنَفْعِـي وَجَـدْتَني ... كَثِيـرَ التَّـوَانِـي لِلَّـذِي أنَـا طَالِبُـهْ

وَلكِـنَّني أسْـعَى لأنْفَـعَ صَـاحِبي ... وَعَارٌ عَلَى الشَّبْعَانِ إنْ جَـاعَ صَـاحِبُهْ

***

يُخَـاطِبُنِي السَّـفِيهُ بِكُـلِّ قُـبْحٍ ... فَـأكْرَهُ أنْ أكُـونَ لَـهُ مَجِيبـاَ

يَزِيـدُ سَـفَاهَةً فَأزِيـدُ حِلْمـاً ... كَـعُـودٍ زَادَهُ الإحـرَاقُ طِيَبـا

إذَا نَطَـقَ السَّـفِيهُ فَـلاَ تَجِبْـهُ ... فَخَيْـرٌ مِـنْ إجَـابَتِهِ السُّـكَوتُ

فَـإنْ كَلَّمْتَـهُ فَـرَّجْـتَ عَنْـهُ ... وَإن خَـلَّيْتَـهُ كَمَـداً يَمُـوتُ

---

(١) ص٢٢/السماحة و حسن الخلق/ إذا سَبنّي نذل

دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٧):

## (لێبوردەیی و ڕەوشت بەرزیی)

گەمـژە جنێـوم پـێ بـدات، هـەر زیـاتر، بـەرز دەبـمـەوە
نـەنگیم نیـە، کـە وەکـو ئـەو منـیش جنێـو نەدەمـەوە
دەروونـی خـۆم، ئەگـەر لـەلا ئـازیـز نـەبێ
چـاک دەزانم، چـۆن وەڵامـی گـەمژەییەکانی دەمـەوە
کـە بـۆ سـوودی خـۆم تێکۆشـم، وا دەتـبیـنیم
گـەلێ خـاوم لـەو گـرەوەم، کـە دەمـەوێ بیبەمـەوە
بـەڵام، خـۆ مـن، بـەرژەوەنـدی هـاوڕێم دەوێ
شەرمە کەسێ تێر بێ خۆی و، هاوەڵەکەی لە برسانا بتلێتەوە[1]

* * *

گەمژە لە ڕووم بەدگۆیی کا، بێزم لێ دێ، دەمم لە ڕووی بکرێتەوە
هەتا وابێ، ئەو گەمژەتر دەردەکەوێ و، هێمنیم دەدرەوشێتەوە
وەکو بخورد، هەتاکو زیاتر بسوتێ، بەرامەی زیاتر پەخشانە
گەمـژە، کـە دوا، بـا هـەر بێـژێ، نـەکەی وەڵامـی دەیتـەوە
باشتریـنی وەڵامـی تـۆ، ئەوەیـە، بـێ دەنـگ وەستـاوی
کـە بیـدوێنی، بـە دەسـتی خـۆت، گرێـوی پـێ دەبـەیتـەوە
کـە وەلاتنـا، لـە داخانـا، خـەریکە سـوێی دەبێتـەوە

---

(١) یان شەرمە بۆ (تێر) برادەری تیکەی نەبێ تاکو بیخاتە دەمەوە.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٨)

پێشەوا شافیعی خ.ل دەفەرموێت: هەموو خەڵکانی سەردەمی خۆم، جگە لە پێشینە رابردووەکان لەسەنگی مەحەکم دان و تاقیمکردنەوە، هەڵمسەنگاندن، کەسێکی وام تێدا نەدۆزینەوە کە پڕ بە پێستی چروکی نەبێ، چرووکی واتە دەست تەنگی لە بەخشینی شتی ماددی و دڵتەنگی لە بەخشینی شتی مەعنەوی و شادی بەخشی، رووتەنگی واتە گرژی و مۆنی و نەبەخشینی رووی گەش و شیرین بە خەڵکی و کەللە تەنگی یان مێشك تەنگی واتە چروکی و نەبەخشینی زانست و زانیاری بە خەڵکی و...هتد، هەریەکە لە مرۆڤەکان لە هەموو ئەمانەدا یان لە زۆربەیاندا چرووك بوون، ناچار گەڕامەوە سەر سەنگەری ڕاستەقینەی پاراستنی دەرونی خۆم، کە قەناعەتە، بۆیە لەکێلانی قەناعەتدا شمشێرەکەم دەرهێناو کەوتمە بڕینی ئەو سەرە داوانەی کە دەمبەنە بەردەمی خەڵکی تاکو داواکاری پێویستیەکیان لێ بکەم، بەڵام من نەفسی خۆم لەوە بەرزتر دەگرم و تەنانەت داوای مێشولەیەکیش لە کەس ناکەم، هەر لەبەر ئەوەشە خۆم بە ئاسودە دەزانم و عیزەتی نەفسم بەرزە، کە هیچ کەسێ منی نەدیوە، لەسەر ڕێگاکەی دانیشتبم وە یا وەستابم و چاوەڕوانی بکەم تا داوا و تکای شتێکی لێ بکەم، هەروەها کەس من لە بەردەرگای خۆی نەدیوە کە دانیشتبم و داوای یارمەتیەکی لێ بکەم، من خۆم بە دەوڵەمەندترین کەس دەزانم کە قەناعەتم هەیە، من دەوڵەمەندترین کەسی بێ پارەو سامانم.

ستەمکارێکیش ئەگەر ستەمی بە باشی لە قەڵەم داوەو کردویەتی بە ڕێڕەو و پێڕەوی خۆی، ئەوا تا بینە قاقای لە ریسوایی و فیزدا ڕۆچووەو لە کردەوە بەدەکانیدا نگرۆ بووە، تۆش خەم لەو کەسانە مەخۆ، ئەوەشیان تا سەر بۆ ناچێتە سەر، بیاندەرە دەست کات و قەدەری خوایی و ئەو تەمەنی کە هەمووی بۆ ئەوان بە شەو ڕادەبرێت، شتی وایان بەسەر دێت کە ئەو ستەمکارانە هیچ ئامادەکاری و ئەگەر و پێشینیەکیان بۆ نەکردبوو، خۆ ئەوەتا بە چاوی خۆمان چەندین کەسی

ستەمکارو نا دادپەروەرمان بینی کە بەهۆی یاخی بوون و لەخۆبایی بوونیانەوە وایان دەزانی ئەستێرەکانی ئاسمانیش لەژێر سایەی فرمانی ئەودان، ئەوانە ماوەیەکی کەم و کورتیان لە پێشەوەیە، لە گومڕایی و بێ ئاگایی خۆیاندان، لەناکاو بەدکاریەکانیان یەخەی پێ دەگرن و دەرگایان لێ دەگرن و ڕیسوای دەکەن، ماڵ و سامان و پلەوپایە و دەسەڵاتیان لێ دەسەنرێتەوە، بەوەش دنیایان لەدەست دەچێ، هیچ کارو کردەوەیەکیشیان بۆ خوای خۆیان نەکردووە، لەبەرئەوە قیامەتیشیان لەدەست دەچێ، سەرەنجام پاداشتی سزادارانەی پڕ بە پێستی خۆی وەردەگرێ و خوای گەورە تۆڵەی لێ دەکاتەوە.[١]

## الزهد و مصير الظالمين

بَلَـوْتُ بَـني الـدُّنيا فَلَـمْ أرَ فـيهُمُ سِوَى مَـنْ غَـدَا وَالبُخْـلُ مِـلْءُ إهَابِـهِ
فَجَـرَّدْتُ مِـنْ غِمْـدِ القَنَاعَـةِ صَارِماً قَطَعْـتُ رَجَائِـي مِـنْهُمُ بِذُبَابِـهِ
فَـلاَ ذَا يَـرَانِ وَاقِفـاً طَرِيقِـهِ وَلاَ ذَا يَـرَانِـي قَـاعِـداً عِنْـدَ بَابِـهِ
غَنِـيٌّ بِـلاَ مَـالٍ عَـنِ النَّـاسِ كُلِّهِـمْ وَلَـيْسَ الغِنَـى إلاَّ عَـنِ الشَّـيءِ لا بِـهِ
إِذَا مَـا ظَـالِمُ اسْتَحْسَنَ الظُّلْمَ مَذْهَباً وَلَـجَّ عُتُـوّاً فِي قَبِيـحِ اكْـتِسَابِهِ
فَكِلْـهُ إلى صَـرْفِ اللَّيَـالِي فَإِنَّهَـا سَتَدْعِي لهُ مَا لَمْ يَكُـنْ فِي حِسَـابِـهِ
فَكَـمْ قَـدْ رَأيْنَـا ظَالِمـاً مُتَمَـرِّداً يَرَى النَّجْمَ تِيهاً صُرُوفُ الحَادِثَاتِ بِبَابِهِ
فَأَصْـبَحَ لا مَـالٌ وَلاَ جَـاهُ يُرْتَجَـى وَلاَ حَسَنَـاتٌ تَلْـتَقِـي فـي كِتَابِـهِ
وَجُـوزِيَ بِـالأمْرِ الَّـذي كَـانَ فَـاعِلاً وَصَـبَّ عَلَيْـهِ اللـهُ سَـوْطَ عَـذَابِهِ

(١) ص٢٣/ الزهد و مصير الظالمين/ بلوت بني الدنيا فلم أرَفيهم/

دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٨):

## (زوهد و چارەنووسی ستەمکاران)

خـــەڵکی دنیـــام، دا لـــە ئـەزمـــوون، بـــێ لــە پێشـــین[١]
نەمـدی کەسـێ، هـەر هـەموویان، پـڕ بـە پێستیان چـرووکی بـوو
لـــە کێلانـــی قەنـاعـەتـــا، شمـــشێری دەســـتم ڕاکـــێشا
داوی، داواشـــم[٢] هـــەڵبڕی بـــەو دوخـــە[٣] تیـــژەی کـــە هـــەیبوو
کەســـێ نـــەبوو منـــی دیـــبێ، ڕاوەسـتابـــم لـــە ڕێگـــەیدا
لەبـــەر دەرگـــای کـــەس نەکـــەوتم، منـــەتکا، داوام لێـــی هـــەبوو
بەبـــێ سامـــــان، لــــە گشــــت کــــەس دەوڵەمەنـــترم
دەوڵـەمەنـــدیی لـە (شـت)دایە، نـەکو بـە (شـتێ) کـە هـەبوو
ستەمکـــارێك (جـــەور بـــە چـــاکەڕێ) دانـــی لـــە ڕێبـــازی
ئـەو، ڕۆچـووە لـە سـتەم و لـەو بەدیانـەی پێـی هـەستـــابوو
بیــــدەرە دەســــت ئـــــەو شەوگـارانـــــەی مـاویـــــەتی
دێتـــەوە ڕێـــی، ئـــەو ئەنـــجامـــەی کـە لـە ئەژماریـدا نـەبوو
گـــەلێ ستـەمکـــارمان بینـــی کـــەوا ســـەرکەش و یـــاخی بـــوو
لـــە بـاییبونیـــا پێـــی وابـــوو ئـــەستێرەشی لەبـــەرپا بـــوو
زۆری نـــاوێ، لـــە گـــەرمەی بـــێ ئـــاگایی خـــۆی
هـــاکا بـــەری دەرکەیـــان گـــرت، کارەکـانی و بـە چـۆکا چـوو
نـــە مـــاڵ و پـایـــەی دەمێنـــێ، کـــە تـــکایەکی بـۆ بکـەن
نـــە دەفتـــەری کـــردەوەیشی کـــارێکی باشـــی تێـــدا بـــوو

---

(١) بێ لە پێشین: جگە لە پێشینەکان، ئەوانەی پێشتر ژیاون: السلف.

(٢) داوی داوا: پەتی وابەستە بوونی مرۆڤ بە داواکاریەکانیەوە.

(٣) دوخ: تیژایی لێواری دەمی خەنجەر و شمشێر: ذباب السيف.

پـــــاداشتـــی خـــۆی وەرگرتـــەوە، لەسـەر ئەوانـەی کردبـووی
چەشتـــی ئــەو ســـزا بـــە ئێشـــەی کـە خـوا بـۆ ئـەوی دانـابوو

## دەروازەی هۆنـراوەی ژمارە (١٩)

یـــاقوتی حەمـــەوی بــە پاڵپشـــتکردنەوەیەك دەگێڕێتـــەوە لـــە (ابـــن عمـــر الشافعی)یەوە، دەڵێت: ئەبو عبدالله ی شافیعی ژنێکی هەبوو کە لە قورەیشـیەکانی مەککە بوو، بۆ سوعبەت و قسەخۆشی پێشەوا شافیعی ئەم هۆنراوەیەی پێ گوت:

واتە یەکێکە لە بەڵا و ناخۆشیەکان کە تۆ کەسێکت خۆش بـوێ، بـۆی بمـری و بسوتێی، کەچی ئەو وانەبێت بۆت و خۆشی نەوێت.

هەرچەندە تۆ ڕوخۆش و نەرم و نیان بیت بەرانبەری، کەچی ئەو دەم و چـاوی بەیەکادا و مۆنبێ و حەزی لـە چـارەت نـەبێ، بـە مـەرجێك هـەر بـە دوو ڕۆژ جارێـك سەردانی بکەیت و بزر نەبی و دوانەکەویت لەو ڕۆژ تا ڕۆژەی دەرکەوتنەتدا.

وا دیارە شافیعی خ.ل ویستویەتی توانای خۆیشی لـە ڕووی هۆنراوەی ئـەوینی یەوە تاقی بکاتەوە، بەڵام مەبەستی لـەو پیاهەڵدان و مـەکر و نـازەی هاوسـەرەکی خۆیەتی.[1]

### المزاح

وَمِـــــنَ الْبَلِيَّـــــةِ أَنْ تُحِـــــــبَّ وَلاَ يُحِبُّـــــكَ مَـــــنْ تُحِبُّـــــهْ
وَيَصُـــــدُّ عَنْـــــكَ بِوَجْهِـــــهِ وَتُلِحُّـــــ أَنْـــتَ فَـــلاَ تُغِبُّـــهْ

### دەقی هۆنـراوەی ژمارە (١٩):

### (سوعبەت)

چ بــەڵایــە ! خــۆشت بـــوێ، ئـــەو کـــەسەی کــە تـۆی خـۆش نــەوێ
ڕوخسـاری بـە ڕووتـا داخـا، تـۆ ڕووخـۆش بـی و ڕۆژ نـا ڕۆژێ ڕێـت تێـی کـەوێ

---

(١) ص٢٤/المزاح/ ومن البلية ان تحب ولا يحبك/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٢٠)

فاڵچی و ئەستێرەچیەکان لە هەموو سەردەمێکدا بە جۆرەها ناو و نازناو و بیانوو کەوتونەتە فریودانی خەڵکی، تەنانەت لەم سەردەمەشدا هەندێ لەوانە بەناوی زانست، یان ئایین، یان بورج و کەلوەکانەوە مێشکی خەڵکیان جەنجاڵ کردووە، گوایە چارەنوس و بەخت و ئاییندە دەزانن، کەسانی لە خۆشیان نەفامتر هەبووەو هەر دەبێ کە بەو ئەفسونەیان بخەڵەتێن.

جا ئایا بەڕاستی یەکێك لەو ئەستێرە ناسانە بە ئیمامی شافیعی وا وتووە، یان وا بڵاوی کردووەتەوە، یاخود هەر شافیعی خۆی ئەو ڕووداوەی ئاوا بەرجەستە کردووە، نازانم، گرنگ ئەوەیە کە شافیعی خ.ل وەك کەسێکی زرنگ و زانا و خواناس باوەڕی بەو شتە هەلەق و مەلەقانە نەبووە، ئەوانە دورن لە ژیری و لۆژیك و زانستەوە، لەگەڵ پاکی و بێگەردی پەروەردگارا ناگونجێن، بۆیە دەفەرموێ کە من بێباوەڕم بەرانبەر بەو باوەڕە لاواز و شکستەی کە چارەنووس و دەسەڵات بە دەست ئەستێرەکان بێ. جا خۆ ئەو کەسانەی لە سەردەمی ئیبراهیم پێغەمبەریش دا س.خ ئەستێرەو مانگ و خۆریان دەپەرست هەر لەو جۆرە ڕوانگەو بۆچوونانەوە هۆگری ئەو ئەستێرە و ڕۆژ پەرستیە بوون، کە کۆڵەواری کردن.

ئەو زاتە بەرزە باوەڕی خۆی یەکلایی کردۆتەوە، کە بەشێك لەو باوەڕە بریتیە لە باوەڕهێنان بە قەزا و قەدەر، کە تەنها مافی خودایە چۆن دیاری بکات و گۆڕانکاری تێدا بکات، ئەستێرەو مانگ و هەسارەکانیش وەکو خرکە و گۆی زەوی گوێڕایەڵ و هەڵسوڕێنی ئەو فەرمانە خودایین کە لە قەدەریاندا بۆیان دیاری کراوەو خۆیان هیچ دەسەڵاتیان نیە، هەروەکو لە سورەتی (یس)دا دیارە.

باس لەوە دەکات کە بەشی ئەوەندە زانایی هەیە کە دەزانێ، ئەستێرەکان توانای حوکمڕانی و فەرمانیان نیە، بەڵکو جێبەجێکاری فەرمانی پەروەردگارن، هاوکات هەرچی شتێ لە ڕابردوو و ڕووی داوە، یان لە داهاتوو دەبێ ڕووبدات، خوای گەورە لێی بەئاگایە و بە حوکم و فرمان و بڕیاری خۆی بووەو هەر واش دەبێ، ئەو

بڕیـارەش دەبـێ جێبـەجێ بکـرێو واجبـە، هـەروەکو وابـووەو واش دەبـێ، بـەڵام بەداخەوە هەندێ کەس تا ئێستاش گومان و گرفتیان هەیە لە مەسەلەی باوەڕهێنان بە قەدەرو قەزا، چونکە (سنوری زانستی خودا) و (ویست و ئیرادەی خودا) یان لـێ تێکەڵ بووە، لە کاتێکدا دوو شتی جیاوازن، خوای گەورە بەرلەوەی تۆ چی بکـەیت دەزانێت چی دەکەیت و ئەنجامەکەش چی دەبێ، چونکە خوای گەورە زانایە، بەڵام تۆ بەشێك لە ئازادی و بڕیار و کارت پێ دراوە، کـە هەڵبـژاردنی ئـەو بڕیـار و کارانـە لەدەست خۆتدایە، تۆ لەسەر ئەوانە لێپرسینەوەت لەگـەڵ دەکـرێ کـە لـە سـنوری بڕیاردانی خۆتایە، نەك ئەوانەی کە بڕیاری خودا لەسەریان دراوە.[1]

## الكفر بالمنجمين

خَبَّرَا عَنِّيَ المُنَـــجِّمَ أَنِّي كَـــافِرٌ بِالَّـــذِي قَضَـــتْهُ الكَوَاكِـــب
عَالِماً أَنَّ مَا يَكُونُ وَمَا كَانَ قَضَـــاءُ مِـــنَ الْمُهَـــيْمِنِ وَاجِـــبِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٢٠):

### (باوەڕنەکردن بە ئەستێرە گرەوەکان)

ئەســتێرەناس پێــی وتبــووم، کــە مــن بــاوەڕم پێــی نیــە
بــەوەی کــە وا ئەســتێرەکان توانــای حــوکمی هیچــیان نیــە
دەزانم کــە هەرچــی بــووەو هەرچــیەکیش کــە بــەرپا بــێ
حــوکمی خودایــە کــە وابــوو، پێویستیشــە کــە هــەر وابــێ

(١) ص٢٥/ الكفر بالمنجمين/ خبراً عني المنجم أني/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٢١)

دنیا، لە هەر گۆشەو سوچێکەوە دەستی بدەیتێ و خووی پێوەبگری، هەر سەر ئێشەو سەرقاڵی و جەنجاڵیت بۆ دروست دەکات، هەریەکە لە شتەکانی دنیا، ڕاستە تام و چێژێکی خۆشیان هەیە، بەڵام ئەگەر زۆر پێوەی خەریك بیت ئەوا ئەویش ئەوەندە خەریکت دەکات، کە فریای ئەنجامدانی ئەو شتانە ناکەویت کە بۆ قیامەتی خۆت باشن، بۆ نموونە ماڵ و سامان، پارەپول، کاسبی و قازانج، پلەوپایە، منداڵ و جگەر گۆشە، خانوو تەلار، خۆراکی خۆش و هتد، ڕاستە ئەوانە چێژیان هەیە، پێویستیشن بۆ ژیان، بەڵام نابێ ئەوەندە خۆمانیان پێوە خەریك بکەین، کە خودی خۆمان لەبیچێتەوە، تۆ چەندە خۆت بۆ ماڵ و منداڵ ماندوو بکەیت، هێشتا ئەوان لێت ڕازی نین و زیاتر لەوەیان لێت دەوێت، ئەمەش ناچارت دەکات کە لە هەوڵ و پەل کوتانی زیاتردا بی، پشوو لە خۆت هەڵگری، نوێژەکانت لە مزگەوت بەکۆمەڵ نەکەی، قورئانی ڕۆژانە نەخوێنی، زیکر و یادی خوا نەکەیت، دڵی خەڵکی بشکێنی لە کارو کەسابەتەکەتدا، درۆ بکەی، سوێندی بە درۆ بخۆیت و... هتد ئەمانەش هەموویان هۆکارن بۆ دروکەوتنەوەت لە خودا.

بۆیە ئازیزەکەم وەبیرت دەخەمەوە، کە سنورێك بۆ هەموو شتەکانت دانێ، مەبە بەو کەسەی کە ماڵی خەڵکی ئاوەدان بکەیتەوەو ماڵی دڵی خۆت وێران و کاول بکەی، مەبە بە پزیشکی چارەسەرکار بۆ خەڵکی و خۆشت دەردەدار و نەخۆش بیت.

شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا دەفەرموێ: خوایە گیان من تەنها ڕەزامەندی تۆم دەوێ و هەر ئەوەشم بەسە، ئەگەر دڵیشك لەم قسەو بڕیارەیدا ڕاست بکات، ئەوا ئەو پلەوپایەیەی بەسە کە تۆ پەیمانت داوە بیدەیتە خاوەن دڵە پاکەکان، من بێ باکم و گوێ نادەمە ئەوەی ئاخۆ کەی سۆز و میهری تۆ بۆ من دەبارێ، کە لەوانەیە پێچەوانەی بیروکاری من بێ، واتا هەمیشە ڕەحمەتی تۆ لەسەر من هەیە، مەرج نیە من هەستی پێ بکەم، یان نەکەم.[1]

---

(١) ص٢٥/لا أُبالي/ أنتَ حسبي، وفيك للقلب حسب

## لا أُبالي

أَنْتَ حَسْبي، وَفِيكَ لِلْقَلْبِ حَسْبُ   وَلِحَسْبي إنْ صَحَّ فِيكَ حَسْبُ
لا أُبَالِي مَتَى وِدَادُكَ لي صَحَّ   مِنَ الدَّهْرِ مَا تَعَرَّضَ خَطْبُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٢١):

### (بێ باکم)

بەسمە، ئەی پەروەردگارا، کە ناو دڵم تۆی تێدابێ
دیسان دڵم ئەوەی بەسە، ڕاستکاو ئەو پلەت پێ دابێ
بێ باکم، لەوەی چ کاتێ، سۆزی خۆتم پێ ئەبەخشی
من نازانم، چ کات باشە، کە سوودی منی تێدا بێ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٢٢)

گەڕان و گشت، چاوی مرۆڤ دەکاتەوە، شارەزای دەکات، ئەو گەشت و سەردانانە، ئەگەر بۆ کاری خێر و کاسبی خێر و فێربوونی زانست و بڵاوکردنەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بێ، ئەوا هەموو بە خێر و بێری لای خودا بۆی دەنوسرێ. بۆیە شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا، دەفەرموێت من لە باری درێژی و پانی وڵاتان دەگەڕێم، جا یان دەگەمە خواست و ئاواتی خۆم و پاشان دەمرم، یان ناگەم بەو ئاواتەم و پێشتر دەمرم، لەو وڵاتە نامۆیەدا، جا ئەگەر مردم ئێوە خۆش، ئەوا بە ئاواتەکەم گەیشتووم، چونکە ئامانجی چوونەکەم بۆ ڕەزامەندی خودا بوو، کەواتە چوونم بۆ ئەودنیا و مردنەکەیشمن هەر بۆ خودا بوو، ئەگەر مەودای تەمەنی دام و لەو سەفەرەم گەڕامەوە، ئەوا ئەوەشیان خەمی ناوێ، چونکە مادام ماوم ئاسایی یە کە بگەڕێمەوە ئەگەر خوای گەورە بیەوێ بگەڕێمەوە.

لە هەردوو بارەکەدا من سەرم بەرزە، نەفسم بەرزە.[1]

---

(١) ص٢٧/ النزحال و عزة النفس/ سأضرب في طول البلاد../

## الترحال وعزة النفس

سَأَضْـرِبُ فِي طُـولِ الـبِلَادِ وَعَرْضِـهَا      أَنَـــالُ مُـــرَادِي أَوْ أَمُـــوتُ غَرِيبَـــا
فَـــإِنْ تَلِفَـــتْ نَفْسِـــي فَلِلَّـهِ دَرُّهَـا      وَإِنْ سَـــلِمَتْ كَـــانَ الرُّجُـــوعُ قَرِيبَـــا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٢٢):

### (گەڕیدەیی و دەرونبەرزیی)

لـــەدوی ئـــاوات، ســـەراپای شـــاران، دەگـــەڕێم، کـــە پـــێم وایـــە
یـــان پێـــی دەگـــەم، یـــاخـــود، مـــەرگم لـــە ڕێدایـــە
کـــە تێداچـــووم، خـــەمی نـــاوێ، چـــونکە چـــوونم بـــۆ خودایـــە
ئەگـــەر مـــام و ســـەلامەت بـــووم، ئـــەوا چـــوونەوەم ســـانایە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٢٣)

یەکێك ئامانجەکانی ئاینی ئیسلام بریتیە لە ڕێزگرتنی مافی مرۆڤەکان، جا هەر مرۆڤێك ڕێزی مرۆڤەکانی تری گرت، ئەوا ئێوەش بە ڕێزەوە تەماشای ئەو کەسە بکەن، بێگومان هەرکەس بەڕێز بێ، خوای گەورەش لەناو خەڵکیدا ڕێزداری دەکات، ئەگەرچی کەسێکی هەژار و بێ کەسیش بێ، مرۆڤیش بەپێی پلەی ئەو ڕێزەی کە هەیەتی لەناو دڵی خەڵکیدا جێگەی دەبێتەوە، هەر کەسێك و پلەی تایبەتی ڕێزداری خۆی هەیە لە دڵی خەڵکیدا، ئەو ئاست و پلەیەش جێگیر نیە، بەڵکو بەپێی ڕێزگرتنی خۆت لە خەڵکی، لە دڵی خەڵکیشدا ئاست و پلەکەت بەرزو نزم دەکات، بۆیە زانا شافیعی خ.ل دەفەرموێ ڕێزی ڕێزداران بگرن، ئەوەی خەڵکیشی لەلا سووکە ڕێز و شکۆی نابێ، هەیشبێ ڕاست نیەو دەمامکدار و کاتیەیە.

هەرکەسێکیش خەڵکی مافیان پێداو مافیان بۆ پاراست دەبێ ئەویش وابێ، ئەو کەسەی لە خەڵکیش یاخی یە، ئەوا هەر سوک و بێ نرخە و ناشتوانێ ئامانجی ڕاستی بپێکێ.(1)

## توقير الرجال

وَمَــنْ هَــابَ الرِّجَـالَ تَهَيَّبُـوهُ        وَمَــنْ حَقَــرَ الرِّجَـالَ فَلَـنْ يُهابـا

وَمَــنْ قَضَــتِ الرِّجــالُ لَــهُ حُقُوقـاً        وَمَــنْ يَعْـضِ الرِّجَـالَ فَمـا أَصَـابَا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٢٣):

هەرکەس، ڕێزی لە کەسی شایستە نا، ڕێزی بگرن

کەسێکیش ڕێز نەنوێنێ، خۆی ڕێزی لە دەستداوە

بگرن ڕێزی کەسێ مافی پارێزراوە، شایستەیە

ئەوەش لە خەڵکی یا من بێ، ئەو ئامانجی نەپێکاوە(2)

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٢٤)

زۆرجار هەژار و داماوان دەبینین، دڵنیاین کە پێویستی زۆریان بە یارمەتی و هاوکاری ئێمە هەیە، بەڵام خۆیان ئەوەندە نەفس بەرز و خۆڕاگرن، دەست لە کەس پان ناکەنەوەو سکاڵای حاڵی خۆیان ناکەن، بۆیە شافیعی خ.ل دەفەرموێ: لەو کاتانەدا کە تۆزێ پول و پارەو ماڵم دەست دەکەوێ و دەمەوێ دابەشی بکەم بەسەر کەسانی شایستەدا، دڵ و دەروونم دەسوتێتەوەو چزەچز و کسپەی دێت، پڕە لە خۆزگەو بریا بۆ ئەوەی کە خۆزگە زۆر بووایەو بمتوانیایە ببەخشم بەو هەژارانەی کە شایستەن، مەردن، نەفس بەرزن. هاوکات داوای لێبوردن دەکەم لەو کەسانەی کە داوای یارمەتیم لێ دەکەن و نەمتوانیوە یارمەتیان بدەم.

---

(١) ص٢٧/توقير الرجال/ ومن هاب الرجال تهيبوه

(٢) بڕوانە هۆنراوەی ژمارە (١٤٠) کە هاوشێوەی ئەم هۆنراوەیەیە.

لە ڕاستیدا خەم خواردنی دەوڵەمەند بۆ هەژارانیش بۆ خۆی جۆرێکە لە هەڵوێستی جوان، چونکە هەندێ دەوڵەمەند وا دەزانێ خەڵکانی هەژار هەموویان سواڵکەری بەردەرگای ئەون، زۆر بە پارەو سامانەکەیەوە لە خۆی بایی یە، نازانێ کە هەژار و دەستکورتی وا هەیە سەد هێندەی ئەو نەفس بەرزە و لەلای خوداش پلەو پایەی لە ئەو بەرزترە.

شافیعی کەسێکی بەدڵ دەوڵەمەند بووە و هەمیشە ئەو جۆرە کەسانەش بەخشندەن، خەڵکیش عادەتیان وایە کە وا دەزانن هەموو کەسێکی بەخشندە دەوڵەمەندە لەبەرئەوە مرۆڤی سەخی و دڵ دەوڵەمەند هەمیشە خەڵکانی تر داوای قەرز و یارمەتی و هاوکاری لێ دەکەن، شافیعی زۆر بەخشندە بووە، لە ماوەی ژیانیدا سێ جار هەرچی هەیبووە لە سامان ماڵی دنیا هەمووی بەخشیوە بە هەژاران، تەنانەت خشڵی هاوسەر و کچەکەیشی کردووە بە خێر، بەخشندەیی لە پلەی زۆر بەرزدا، کە مرۆڤ خۆی سفر بکاتەوە لەو پێناوەدا پێی دەگوترێت (دەهەندەیی).[1]

## منتهى الجود

يَا لَهْفَ نَفْسِي عَلَى مَالٍ أُفَرِّقُهُ ... عَلَى المُقِلِّينَ مِنْ أَهْلِ المُرُوآتِ

إنَّ اعْتِذَارِي إلى مَنْ جَاءَ يَسْأَلُني ... مَا لَيْسَ عِنْدِي لَمِنْ إحْدَى المُصِيبَاتِ

---

(١) ص٢٨/منتهي الجود/ يالهف نفسي على مال افرّقه

دەقی هۆنراوەی ژمارە (٢٤):

## (ئەوپەڕی دەهەندەیی)

کســـپەی دێ دڵ و دەروونم، کـــە ســـامانێکم دێتـــە دەســـت
خۆزیـــا ئەوەنـــدە بوبایـــە، بمـــدایا بـــە مـــەرد و کەمدەســـت
پۆزشـــم بـــۆ ئـــەو کەســـانەی، دێـــن بـــۆ داوای یـــارمەتی لـــێم
لـــێم ببـــورن، ئـــەوەی هەمـــە، گـــەلێ کەمـــە، ناکـــا مـــەبەست

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٢٥)

ئەی ئەو کەسەی دەتەوێ بخوێنی و فێری زانست و زانیاری ببی، وا مەزانە ئـەوە کـارێکی ئاسـانە، دڵنیابـە مانـدویی و شـەونخونی دەوێ، مامۆستاکەشت بەقوربان و بەساقەت نابێ، بگرە هەندێ جار لێت تـوڕە دەبـێ، وشـکە بەرانـەبرت، منـەتت نازانـێ لـە بەرانبـەر ئـەوەدا کـە تـۆ فێـر ببـی و زیـرەك بـی، چـونکە ئـەو بەسـەرکەوتنی تـۆ، جگـە لـە دڵشـاد بـوون هیچـی دەسـت ناکـەوێ، تـۆ بخـوێنی و نەخوێنی، بزانی و نەزانی، تێکۆشی و نەکۆشی، ئەو هەر مامۆستایەو بەوە هیچی لێ کەم نابێتەوە. بەڵکو تۆ سوود یان زیانت پێ دەگات.

ئەو زانست و زانیاریەی ناو دڵی مامۆستاکەت لە ڕاستیدا گەنجینەیەکە بۆ تـۆ، ئەو ماندووبووەو زانستی کۆکردۆتەوە، تـۆش بـە ئاسـانی لـە ئـەوی وەردەگـری بـە ئامادەکراوی، خوێندن و زانستێکیش کە لە پێناوی فێربوونەکەیدا مانـدویی و تـامی زەحمەتت نەچێژابێ تـا نەتگەیەنێتـە ئامـانجێکی بـاش، بۆیـە ئەگـەر تێنەکۆشـی و هـەوڵ نـەدەی، تامـاوی شکسـتی دەخـۆی و خـەمی نـەزانی و نەخوێنـدەواریت دەچێژی.

کە لە ڕاستیدا فێربوون و خوێندن لە قۆناغی منداڵی و گەنجی و لاویەوە دەست پێدەکات، دەبێ تەمەنی لاوی خۆتی بکەی بـە قوربـان، ئەگـەر کەسـێك وای نـەکرد ئـەوا (اللە أکـبر)ی کۆچـی دوایـی عـەقڵ و مێشـکی لەسـەر بکـەو لـە ئێسـتاوە لـە

پرسەکەیدا چوار مشقی لێی دابنیشە، چونکە نەخوێندەوار و نەزان وەکو مردوو وایە، با زیندووش بێ.

خوێندەواری زانست و زانیاری و شارەزایی ئەزموون و پایە و کەسێتی تایبەتی بۆ مرۆڤ دروست دەکەن، بەتایبەتی بۆ کەسی گەنج و لاو.

هەبوونی گەنج و خۆسەلماندن و نمایشکردنی کەسێتی خۆی پەیوەندی بە دوو خەسڵەتەوە هەیە، کە ئەو دوو خەسڵەتە بۆ هەردوو دنیای بەسوودن یەکەمیان زانست و زانیاری، دووەم باش بەکارهێنانی ئەو زانستەیە بۆ کاری هەردوو دنیا، کە بریتیە لە تەقواو خواناسی، بیهێنە بەرچاوت گەنجێك ئەگەر ئەو دوو سیفەتەی تێدا بێ چۆنە و تیایدا نەبێ چۆنە؟

بێگومان ئەگەر تیایدا نەبێ ئەوا نەیتوانیوە کە کەسێتییەکی خۆشەویست و سەرکەوتوو ڕەزامەند بۆ خۆی دروست بکات و خۆیشی بە متمانە بە خودی خۆی و تواناکانی خۆیشی ناکات، نەخوازەلا خەڵکی تر...![1]

## زينة الأنسان

## العلم والتقوى

اصْـبِرْ عَلـى مُـرِّ الجَفَـا مِـنْ مُعَلِّـمٍ فَـإِنَّ رُسُـوبَ العِلْـمِ في نَفَرَاتِـهِ
وَمَـنْ لَـمْ يَـذُقْ مُـرَّ الـتَّعَلُّمِ سَـاعَةً تَجَـرَّعَ ذُلِ الجَهْـلِ طُـولَ حَيَاتِـهِ
وَمَـنْ فَاتَـهُ التَّعْلِـيمُ وَقْـتَ شَـبَابِهِ فَكَبِّـرْ عَلَيْـهِ أرْبَعـاً لِوَافَاتِـهِ
وَذَاتُ الفَتَـى وَاللهِ بِـالعِلْمِ وَالتُّقَـى إذَا لَـم يَكُونـا لا اعْتِبَـارَ لِذَاتِـهِ

(١) ص٢٩/ زينة الانسان/ إصبر على مرّ الجفا من معلم

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٢٥):

## (جوانی مرۆڤ لە زانست و تەقوایدایە)

خۆڕاگرە، لە بەرابەر تالّی جەفا[1]، لە کاری مامۆستاکەتدا
کەڵەکە بوونی زانستە، گەنجینەتە، لە ناخیدا
کەسێ ساتێ، تالاوی فێربوون نەچێژێ
زوخاوی[2]، نەزانی دەخوا، لە درێژایی تەمەنیدا
ئەوەی هەلی فێربوونیشی لەلاویتیدا لە دەست دا
(الله أکبر)ی دەوێ[3]، چوار مشقی بە لە پرسەیدا
بەخوا بونایەتی[4] لاویی، بەندە بە زانست و تەقوای
کە ئەو دووانەی تێدا نەبێ، متمانەکەیشی لەدەستدا

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٢٦)

پارەو سامان، لەو شتانەن کە ئەگەر وریا نەبین، ئەوا زۆر بەبێ دەنگی کەتنی خۆیان دەکەن، بەڵام جاری واش هەیە پارەکان دێنە قسەو بە زمانێکی پەنهانی پێمان دەڵێن: کەسانێك لە ئێوەی مرۆڤدا هەیە، کە پارە بوغرای کردووە، لایەك لە کەس ناکاتەوە، وا دەزانێ هەر پارەکانی بەسەو پێویستی بە کەسی تر نابێ، بەڕاستی ئەو کەسەی پێی وابێ کە پارە هەموو شتێکە ئەوا لە پێناوی پارەشدا

---

(١) تالّی جەفا: ئەو ئەرك و نارەحەتی و زەحمەتانەیە کە دێنە ڕێی کەسێك، لە پێناوی گەیشتنی بە ئامانجێکی گەش و باشدا.

(٢) زوخاو: ئەو زامدارییە دەرونیانەیە کە مرۆڤ لە ڕووی مەعنەویەوە ئازار دەدەن، وەکو ئەو کەسەی لە منالّیەوە نەخوێنێ و کە گەورە بوو خەمی بۆ بخوات.

(٣) (الله أکبر)ی دەوێ: لەناو عەرەبان و بگرە لەناو کوردانیش وا باوە، کە کەسێك دوچاری کارەساتێکی ناخۆش بێتەوە، کە هەواڵەکە دەبیستی دەڵێی الله أکبر وەك نیشان دانی سەرسامی و بێ دەسەڵاتیدا.

(٤) بوونایەتی: (وجود الذات) سەلماندنی بوونایەتی خود و دەرخستنی کەسێتی.

هەموو شتێ دەكات و هەموو شتێكی قەبووڵە، چەند خراپە مرۆڤ كۆیلەی ژێر دەستی شتێك بێ كە خۆی پەیدای دەكات، ئەو كەسە پول پیس و پارە پەرستانە، ڕێز و شكۆو قەدری كەسانی تریان نەگرت، تەنها پارەدارانیان خۆش دەویست، هەموو پێوەرێك لەلایان پارە بوو، بۆیە كاتێك پارەیان لەدەست چوو، هەموو شتەكانی تریشیان لەدەست دا، پارە بۆ ئەوەیە مرۆڤ خزمەتی خۆی پێ بكات، نەك ببێتە خزمەتكاری.

لە هۆنراوەیەكی تردا، كە هەر لەم دیوانەدایە، پێشەوا شافیعی خ.ل دەفەرموێت دڵی چیت بە پارەو پول خۆشە، لە كاتێكا وشەی (دینار) برگەی كۆتاییەكەی (نار)ە، واتە (ئاگر)و وشەی (درهم)یش دوابڕگەكەی (هَمْ)ە، واتە خەم و پەژارە، كاتێ تۆ دینار و درهەمت كردووە بە دۆلار، ئەوا كۆتایی ئەمیش هەر (لار)ە، كە زۆرجار ئەگەر خراپ بەكاری بهێنی كردارت لار دەكا، كەسێتی و ناوبانگت لار دەكا، لای خەڵكی سەرشۆڕو مل لارت دەكا، لای خوداش لە قیامەتدا پشتت خوار و لار دەكا، ئەوەندە پارەو پول بەسوودە هەتا سنوری خزمەت بە مرۆڤ و مرۆڤایەتی و هاوكاری و ئاوەدانكردنەوەی ماڵی هەردوو دنیامان.

(عبدالله)ی ئەسپەهانی لە (ئەبو نصر)ەوە بۆی گێڕاینەوە، كە دەڵێت: گوێم لێبوو كە (أبا عبدالله)ی برازای وەهەب گوتی[1]: ئیمامی شافیعی فەرمووی[(٢)]

**شح النفس**

وَأَنْطَلَقَــتِ الــدَّرَاهِمُ بَعْــدَ صَمْــتِ     أُنَاســاً بَعْــدَمَا كَــانُوا سُــكُتَا

فَمَـا عَطَفُـوا عَلَـى أَحَـدٍ بِفَضْـلٍ     وَلاَ عَرَفُـوا لِمَكْرُمَـةٍ ثُبُوتَـا

---

(١) ص٣٠/شح الأنفس/وانطلقت الدراهم بعد صمت

(٢) حلية الأولياء، ابي نعيم الأصفهاني. ج(٩) ص١٤٠

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٢٦):

### (دەروونچرووکی)

دوای ئەوەی، کە بێ دەنگ ببوون، ئەو پارانە

خەڵکانێکیان بەدەنگ هێنا، لەو کەسانە

کە سۆزێکیان، بە ڕێزەوە نەدا بە کەس

نەیانزانی بە چەسپانی، ئەو شکۆیەی کە شایانە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٢٧)

مرۆڤ بە تەنها هەموو پێداویستیەکی ژیان و گوزەرانی خۆی و خانەوادەی پێ دابین ناکرێ، هەمیشە خوا وایکردووە کە تۆ پێویستت بە خەڵکی هەبێ و خەڵکیش پێویستیان بە تۆ هەبێ، لە هەردوو بارەکەدا پێویستە مرۆڤ قەدر و شکۆو دەرونبەرزی خۆی بپارێزێت، کاتێك پێویستیەکت ئەوێ، بزانە ڕوو لە کێ دەکەی؟ لە کێ داوا دەکەیت؟

دڵنیابە، کاتێ ئاسودە دەبی کە داوات لە کەسێك کردبێ کە شایستە بێ، جا داوایەکەت مادی بێ، یا مەعنەوی، باشترە لە کەسێکی مەرد و دەست بەخێر داوای یارمەتی بکەیت، هانا بۆ هەموو کەسێ مەبە، سکاڵای هەژاری و کێشەکانت لای هەموو کەسێ مەکە.

خەڵکی هەموویان وەکو یەك نین، بە دڵسۆزی ڕوکەشانەیان مەخەڵەتێ، بۆ نموونە کە دڵنیا بوویت کەسێك خێرێکی لەبەر خاتری خودا کردووە، ئەوە شیاوە بۆ داوای یارمەتی.

بچۆرە لای کەسێك کە ڕێزو حورمەتت بگرێ، چونکە ئەگەر هاوکاریشت نەکات، ناوت نازڕێنێ و لەملاولا باست ناکات، هەروەکو شێر لە سنوری دەسەڵات و پاوەنی دیاریکراوی خۆیدا سەرداره، ڕێزی گیانەوەرانی تر دەگرێ، کاتێك برسی دەبێ و دەیەوێ یەکێکیان ڕاو بکات هەمیشە هەر لاوازەو نەخۆشەکەیان ڕاو دەکات، بۆ ئەوەی لەش ساخ و بەگوڕ و گەنجەکان لەناونەچن، ئەوەی بۆیشی نەخورا، بەفیڕۆی نادات و نایخاتە ژێر گڵەوەو لە زیندەوەرانی تر نایشارێتەوە، بەڵکو بەجێی دەهێڵێ بۆ گیانەوەرانی برسی و بەسەر کەلاکەکەیەوە پاسەوان نابێ، وەك ئەوە وایە

گیانەوەرە برسیەکانی تر داوەتی سەر خوانی ئەو بن، ئەویش سەر سفرەکەیان بۆ بەجێ دەهێلێ، نەبادا شەرم بکەن، یان بترسن، تەنانەت کە گیاندارێکی ڕاوکرد و تێری لێ خوارد و دلنیا بوو کە هیچ گیانەوەرێك لەو نزیکانە نیە، تا بێت بیخوات ئەوا خۆی دەچێت گیاندارە برسیەکان بەرەو لای کەلاکەکە ڕاو دەنێ، تا بچن بیخۆن، واتە چووە بە دوایانا.

کاتێك گیانەوەرێکی دەرەوەی سنوری پاوەن و جەنگەلەکەی دێتە نیشتمان و سنوری ئەوەوە، ئەوا شێرەکە دەست دەکات بە پاشەڕۆ دانان و پیسایی خۆی بە درێژایی سنورەکەی، تاکو گیاندارە بێگانە هاتووەکە بۆنی بکات و بزانێت کە ئەمە سنوری پاوەنی شێرێکەو مافی نیە بەبێ لەدەرگادان بێتە ژوورەوە، جگە لەوەش بەردەوام لە چەند شوێنێکی جیاجیاوە نەڕەیەك دەکات واتا ئاگاداری دەکاتەوە و زەنگی بۆ لێدەدات و یەکسەر هەڵناکوتێتە سەری و شەڕی پێ نافرۆشێ، ئەمەش لە نەریتی ئاژەلاندا، واتا ڕێزگرتنی میوان.[1]

### محط الرجاء

إذا رُمْتَ المَكارِمَ مِنْ كَرِيمٍ   فَيَمِّمْ مَنْ بَنَى للهِ بَيْتا
فَذَاكَ اللّيْثُ مَنْ يَحْمِي حِماهُ   وَيُكْرِمُ ضَيْفَهُ حَيًّا وَمَيْتَا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٢٧):

### (جێ هیوا)

کە ناچاری داوایەك بووی، هانابەرە، بۆ لای مەردێك
وەکو کەسێ، لە پێناو خوا، بنیاتی ناوە مزگەوتێك
ئەوە (شێر)ە، کە پاسی[2] خۆی لە پەرێزیا[3]، ڕاگرتبێ
ڕێز لە میوانی خۆی دەگرێ، جا زیندووە، یا مرد بێ

---

(١) ص٣٠/محط الرجاء/ إذا رمت المكارم من كريم/

(٢) پاس پاسکردن، پاسەوانێتی، پاسەوانیی کردن، پاراستن.

(٣) پەرێز: جێوماوە، نیشتگە، پاوەن، ژینگەی تایبەتی زیندەوەرێك یان ئاژەلێك.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٢٨)

پێشەوا شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا ڕەخنە لە کەسێك دەگرێ، جا ئەو کەسە ڕاستیە یان خەیاڵی یە، نازانم، لەسەر ئەوەی کە فریوی خواردووە بە قسە زەق و زلەکانی شاعیرێکی بێ کردار و لەخۆبایی، کە لایداوەتە ماڵیان، یان خاوەن ماڵەکە خۆی داوەتی کردووە.

شافیعی دەفەرموێت: ئەو میوانەت چ هەواڵ و باسێکی بۆ ماڵ و خێزانت گێڕایەوە، لە چیرۆکی چوون و گەڕانەوەیدا؟ کاتێ ئێوەش پرسیارتان لێ دەکرد؟ ئایا زێدەڕوی دەکات و دەڵێ: ڕۆیشتم تا فورات و ئاوم دەست نەکەوت، کە شەپۆلەکانی دەکشانە وشکاییەوە، بەبەو لوتکەی زۆر بەرزی شاخەکان، یان لوتکەی سەر شەپۆلەکان بەڕێ کەوتم، بەڵام بەهۆی باریکە لاڕێکان گەڕامەوەو نەچووم، تۆش سڵاوی پێ بگەیەنەو پێی بڵێ: بەو قسەو باسانە فریو ناخۆم هەرچی درۆیەکت دەرپەڕاند لە ڕوخسارتەوە دیارە، هەروەکو چۆن خڵتەو پیسی لە بنی شوشەدا دیارە، من وانیم، ئەوە تۆی کە قسەو باس دەهۆنیەوە، ئەگینا قسەی من ئاوی زێڕە، پاك و بێ خڵتەیە.

مرۆڤ چی لە ناخ و دەروون دابێ، ئەوەش لە جەستەو زمانیەوە دەردەکەوێ، هەروەکو چۆن لە زەمینی گوڵزارا تووی گوڵ هەیە بۆیە گوڵ دەڕوێت.

شافیعی شانازی بەوەوە دەکات کە شاعیرێکی ناڕاست نیە، بەڵکو هۆنراوەکانی لە سەرچاوەی ڕاستیەوە هەڵقوڵاوون، بۆیە دەفەرموێت: هۆنراوەکانم لە یانەی شاعیراندا دەشەکێنەوەو تاجە گوڵینەن.

شاعیر کە لە خوا نەترسێ، زمان لوسە لە فریزدانی خەڵکیدا، وشەی شیعرەکانی لیکی دەمیەتی، ژاراوی دڵیەتی و خەڵك لەناو دەبەن، هەر بەوەدا بزانە کە شاعیرانی خوانەناس هەمیشە ناکۆکن و لە ململانێدان، دژی یەکتری دەدوێن، پاشقول لە یەکتری دەگرن، لە هەموو دۆڵێکدان، ئەوەی بە دەم خەڵکی دەڵێن، بۆ خۆیان بە کردار نایکەن، یانی پێچەوانەکەی دەکەن.

بەڵام شاعیری دانا و ژیر و پڕار و خواناس وانیە.[١]

---

(١) ص٣١/الشاعر المنطيق/ ماذا يخبّر ضيف بيتك أهله

## الشاعر المنطيق

مَــاذَا يُخَبِّــرُ ضَــيْفُ بَيْتِــكَ أهْلَــهُ ... إنْ سِــيلَ كَيْــفَ مَعَــادُهُ وَمَعَاجُــهُ
أيَقُــولُ: جَــاوَزْتُ الْفُــرَاتَ وَلَــمْ أنَــلَ ... رِيًّــا لَــدَيْهِ وَقَــدْ طَغَــتْ أمْوَاجُــهُ
وَرقِيــتُ فِي دَرَجِ الْعُــلاَ فَتَضَــايَقَتْ ... عَمَّــا أُرِيــدُ شِــعَابُهُ وَفِجَاجُــهُ
وَلَتُخْبِــرَنَّ خَصَاصَــتِي بِتَمَلُّقِــي ... وَالْمَــاءُ يُخْبِــرُ عَــنْ قَــذَاهُ زُجَاجُــهُ
عِنْــدِي يَوَاقِيــتُ الْقَــرِيضِ وَدُرُّهُ ... وَعَلَــيَّ إكْلِيــلُ الْكَــلاَمِ وَتَاجُــهُ
تَرْبِــي عَلَــى رَوْضِ الرُّبَــا أزْهَــارُهُ ... وَيَــرُفُّ فِي نَــادِي النَّــدى دِيبَاجُــهُ
وَالشَّــاعِرُ المِنْطِيــقُ أسْــوَدُ سَــالِخٌ ... وَالشِّــعْرُ مِنْــهُ لُعَابُــهُ وَمُجَاجُــهُ
وَعَــدَاوَةُ الشُّــعَرَاءِ دَاءٌ مُعْضِــلٌ ... وَلَقَــدْ يَهُــونُ عَلَــى الكَــرِيمِ عِلاَجُــهُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٢٨):

### (شاعیری لەخۆبایی و بێ کردار)

چـــی هـــەواڵێکی دا بـــە خێزانـــی، میـــوانی ماڵەکـــەت
کاتـــێ پرسیـــاری لێ کـــرا، لـــە چـــوون و گـــەڕانەوەی
ئایـــا دەڵـــێ: کـــە فـــوراتم تێپەڕانـــد و نەگەیمـــە ئـــاو
لـــە کاتێکـــا گەیبونەتـــە وشکایـــی شـــەپۆلی ئـــەو ئـــاوەی
بـــۆ لوتکـــە هـــەنگاوم دەنـــا، تـــا بگەمـــە، بـــەرزایی کێـــو
کـــە نـــەمتوانی لـــە تـــەنگی و کەنـــدەك و ڕێچـــکەی نـــەبڕاوەی
لـــە هـــەواڵی زمانلوســـی خۆیشـــی دەڵـــێ: لـــە هـــەژاریم
ئـــاو لـــە شـــوشەدا دەردەخـــات، ئـــەو خڵتـــاوەی
بەســـەرهاتی منـــیش وایـــە، ئـــەوەی دیـــتم لـــەو ڕێگایـــە
تاجـــە گوڵینـــەی قســـانە، ئـــەو بەســـەرهات و ڕووداوەی

لەسەر خاکی تەپۆلکەدا دەڕوێنێ گوڵ و گوڵزاری
لەناو یانەی یانەکانا، دەشەکێتەوە هۆنراوەی
شاعیری خوانەناس، ڕەشمارێکی بێ توێژاڵە[1]
هۆنراوەیشی، لیکی دەمیە، ئەو ژەهراوەی
ناتەبایی شاعیرانە، پەتایەکی کوشندەیە
لای بەخشندە، زۆر سانایە چارە بۆو دەردە بەدناوەی

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٢٩)

بەلا و گرفت و کێشە لە دنیادا نابڕێ، ئەوەی بیەوێ بژی دەبێ گرفت و کێشەکانی ژیانیش قەبوڵ بکات، ژیان بۆ خۆی ئەزمون و کێشەیە، بەتایبەتی تەمەنی گەنجی ناسکترین و دژوارترین تەمەنی داباڕینی بەلا و کێشەیە، بۆیە دلێری و دانایی دەوێ کە کەسێك بەرەنگاری ئەو کێشانە بێ و بە سەرکەوتوویی ئەو قۆناغی تەمەنە تێپەڕێنێ، ئەم گرفتانە ژیانی بەختەوەریانەی لێ تاڵ و لێڵ دەکەن، گەنجەکە وا دەزانێ ئیتر دەروازەی ڕزگاربوونی نەماوە، چونکە خەم و گرفت و کێشەکان دەوری دەدەن و پاپۆکە دەخۆن بە دەوریدا، دەرونی دەگوشن و تەنگی دەکەن، بەڵام شافیعی خ.ل دەفەرموێ منیش ئەو بارودۆخانەم بەسەر هاتووە، وامدەزانی ئیتر هیچ ڕێیەکی ڕوون نەماوە بۆم، بەڵام خوای گەورە ڕوناهی ئاواتی نیشان داوم و دەروازەی ڕزگاری بۆ کردوومەتەوەو دەرباز بووم لەو گرفت و ناڕەحەتیانە.[2]

---

(١) توێژاڵ: توێژی مار، توێخەکەی، توێکڵ، چەرم، پێست.

(٢) ص٣٢/كلّما اشتدت فرجت، ولَرُبَّ فازِلةٍ يضيقُ لها الفتى/

## كلما اشتدت فرجت

وَلَــرُبَّ نَازِلَــةٍ يَضِــيقُ لَهــا الْفَتــى ذَرْعــاً، وَعِنْــدَ اللهِ مِنْهــا الْمَخْــرَجُ
ضَــاقَتْ فَلَمَّــا اسْــتَحْكَمَتْ حَلَقَاتُهَــا فُرِجَــتْ، وَكُنْــتُ أَظُنُّهَــا لا تُفْــرَجُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٢٩):

### (لە تەنگانە ڕزگاربووم)

لەوانەیــە، تــەنگ هەڵچــنێ، بــە گــەنجێك، بــەڵای ناگــەهان
بــەڵام، لای خوایــــە، دەروازەی، لێوەدەرچــــون و بــــەختیاری
تەنگەبــەر دەبــێ ڕێگەكــەی، كــە بازنــەی بــەڵای لــە دەورە
دەربــازیش بــوو، كــە پــێم وابــوو، نــەمابوو دەرگــای ڕزگــاریی

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٣٠)

مرۆڤ هەمیشە نەیارو ناحەزی هەیە، كە چاكیت خراپەكاران خۆشیان ناوێیت، كە خراپیش بیت لای چاكەكاران نـەیاری، لەبەرئـەوە ناوبـەناو لەگـەڵ نەیارەكانتـدا كێشەت بۆ دروست دەبێ، پێشەوا شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا دەفەرموێت: ئەوە بۆچی وا بێدەنگیت؟ لە كاتێكا ناحەز و دوژمنانت شەڕت پێ دەفرۆشن؟ لە وەڵامـدا دەفەرموێ: وەڵامدانەوەی من لەم كاتەدا بۆ نەیارەكەم كردنـەوەی دەرگـای هـەرا و شەڕە بێدەنگ بوون لەبەرانبەر گەمژەو نەزاندا شكۆیەكی بەرزە و ئـابڕو پاراسـتنە، هۆیەكە بۆ ئومێدی چاكسازی، ئەوە نیە شێر بەو هەموو ئازایی و ترسناكیەیەوە كە هەیەتی بێدەنگە و بەو بێدەنگیەیشی گرەوی بردۆتـەوە، كەچـی سـەگەل هەمیشـە دەترسێ و حەپەی دێت.[1]

---

(١) ص٣٢/السكوت سلامه/ قالوا سكت وقد خصمت/

## السكوت سلامة

قالُوا سَكَتَّ وَقَدْ خُوصِمْتَ قُلْتُ لَهُم — إنَّ الْجَوَابَ لِبَابِ الشَّرِّ مِفْتَاحُ

وَالصَّمْتُ عَنْ جَاهِلٍ أَوْ أَحْمَقٍ شَرَفٌ — وَفِيهِ أَيْضَا لِصَوْنِ العِرْضِ إِصْلَاحُ

أَمَا تَرَى الأُسْدَ تُخْشَى وَهْيَ صَامِتَةٌ — وَالكَلْبُ يُخْسَى لَعَمْرِي وَهْوَ نَبَّاحُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٣٠):

### (بێدەنگیت سەلامەتیتە)

وتیان: کە بۆچی بێدەنگی، دوژمن شەڕت پێ ئەفرۆشێ

وتم: وەڵام لە ئێستادا، کلیلێکی شەڕ خوازیە

بێدەنگی بەرانبەر گەوج شەرم و شکۆت پێ دەبەخشێ

جگە لەوەش ڕێگەیەکی نایابی چاکە خوازییە

ئەی نابینی، کە (شێر) چەندە ترسناکە و بێدەنگیشە

سەگ لە پلارێک[1] دەترسێ، حەپەی دێ و هەر ناڕازیە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٣١)

(ربیع)ی کوڕی (سلیمان) وتی: لە خزمەتی شافیعی دابووین، پیاوێك هات، پارچە نوسراوێکی دایە دەست شافیعی، پێشەوا شافیعی خوێندیەوەو زەردەخەنەیەکی کرد، ئینجا شتێکی لەسەر نوسی و دایەوە دەستی، ئێمەش وتمان لەوانەیە پرسیارێکی کردبێ و ئەویش وەڵامی دابێتەوە، جوان نیە ئێمی لێی بپرسین ئەوە چیە؟ بەدوای پیاوەکەدا شوێن پێمان هەڵگرت و دۆزیمانەوە، دوای داواو مۆڵەت لێ وەرگرتنی پیاوەکە نوسراوەکەمان لێ وەرگرت و خوێندمانەوە، تیایدا نوسرا بوو[2]

---

(١) پلار: ئەو بەرد یان کەرسەکەیە کە لە ئاژەڵ دەگیرێت بە مەبەستی دورخستەوەو راونانی.

(٢) معجم الأدباء لياقوت الحموي، ج١٧ ص٣٠٥.

سَـلِ المُفْتِـيَ الْمَكِّـيَّ هَـلْ فِي تَـزَاوُرٍ وَضَــمَّةِ مُشْــتَاقِ الْفُــؤَادِ جُنَــاحُ

**قالَ: وإذا إجابة أسْفَلَ من ذَلكَ:**

أَقُـولُ: مَعَـاذَ اللهِ أنْ يُـذْهِبَ التُّقَـى تَلاَصُــقُ أَكْبَــادٍ بِهِــنَّ جِــرَاحُ

بپرسە لە موفتی مەککە، لە سەردانا ئاخۆ ڕەوایە

باوەشکردن بە کەسێکا، خۆشویستنی لە دڵتایە

**شافیعی خ.ل لە دامێنی نوسراوەکەدا نوسیبوویەوە بۆی:**

پەنا بە خوا گەر تەقوا باری کردبێ

بە یەکالکانی دڵتان، دڵبرینداری تێدایە

(ربیع) دەڵێ: نکوڵیم لەوە دەکرد کە شافیعی فەتوای لەو جۆرە بدات، بۆیە چوومەوە بۆ لای شافیعی و پێم گوت: ئەی (باوکی عبدالله) فەتوای لەم جۆرە بۆ گەنجێکی ئاوا دەدەیت؟

فەرمووی: ئەی (باوکی محمد)، ئەوە گەنجێکی هاشمیيە، لەم مانگەدا بووکی هێناوە، (واتە مانگی ڕەمەزان)، ئەمان بوك و زاوای گەنجن، پرسیاری لێ کردم، ئاخۆ لە ڕووی شەرعەوە دروستە و گوناح نیە کە جاروبار بیگرێتە باوەش یان ماچی بکات؟ منیش بەو جۆرە فەتوام بۆ دا، (ربیع) دەڵێ: چووم دیسان گەنجەکەم دۆزیەوە و پرسیارم لێ کرد، کە وەڵامی دامەوە، کوت و مت وەك فەرموودەکەی شافیعی بوو، بەڕاستی من تا ئێستا نەمدیوە کەسێکی تر هێندەی شافیعی بیرتیژ بێت و فیراسەتی بەهێز بێت.

## دەروازەی هۆنـراوەی ژمارە (٣٢)

زانست و خواپەرستی دوو شتی جیاوازن، دەشـێت کەسـێك یـەکیانی تێـدابێ و ئەوی تریانی تێدا نەبێ، بەڵام ئامانجی ئیسلام ئەوەیە کە مـرۆڤ وا پـەروەردە بکـات کە هـەردووکیانی وەکو یـەك تێـدا بـێ، چونکە ئـاینی ئیسـلام گشـتی و جیهـانی و مرۆیییە و بۆ هەردوو دنیایە، خودای گەورە نە بە تەنها زانـای خوانەناسـی دەوێ و نە خواناسی نەزانیشی دەوێ، دەبێ مـرۆڤ زانـا بـێ تـا خـودا بناسـێ و بیپەرسـتێ، خواپەرسـتی بکـات لەسـەر بنـەمای زانسـت و لۆژیـك و بیرکردنـەوەو هۆشـیاری، بەداخەوە تاکو ئەم سەردەمەی ئێستاشمان جۆرە کەسانێك هەیـە کـە تـەنها یـەك لەوانەی تێدایە.

پێشەوا شـافیعی خ.ل هەسـتی بـە مەترسـی ئـەوە کـردووەو لـەم هۆنراوەیـەدا هانمان دەدات کە فیقه و زانا بین و هاوکات خواپەرستیش بین، چونکە هـەردووکیان تەواوکەری یەکترین و هیچیان بە تەنها تەواو نین.

دەفەرموێت: زانا و خواپەرست بـە، تـەنها یـەکیان مەبـە، بـەخوا مـن بـۆ خـوا رێنماییت دەکەم و ڕاستیت پێ دەڵێم، چونکە زانا وشکەو دڵی ڕەقـە و دڵـی چـێژی تەقوا و خوا پەرسـتی ناکـات، خواپەرسـتی نـەزانیش نەفامـەو نازانـێ چـۆن چـۆنی چاکسازی و کاری باش بکات.

بـۆ نمونـە ئـەو زانایانـەی کـە چـەکی کۆکوژییـان دروسـت کـردو ئـەو بـەناو خواپەرسـتانەی کـە توندو تیـژییان هێنایـە نـاو ئیسـلامەوە، یـان ئیسـلامیان لـە چوارچێوەی سەردەمێکی ڕابردوودا قەتیس کردووەو پێیان وایە لە هەموو زەمـان و شوێنێکدا هەر دەبێ وابێ، هەروەها کۆمەڵێ کەسـی تـر چـاویان دەوڵـەتی مەککـەو حکومەتـداری و پۆلیسـی ئـەو سـەردەمەو ئەنجومەنـەکانی ڕاوێـژکاری و حـوکم و سیاسەتی ئیسـلام و یاسـا ئـابوری و کـارگێڕی و دام و دەزگاکـان نـابینن و بـەهۆی نەزانی خۆیانەوە دەڵێن: دینـداری شـتێکی تاکـە کەسـیەو نابـێ ئیسـلامی سیاسـی هەبێت، ئەم جۆرە سەقەتیانە لە ڕێی ئەوەوە هاتونەتە نـاو عـەقڵی موسـوڵمانانەوە کە خواپەرستی نەزانیان زۆرترە لە زانای خواناس.(١)

---

(١) ص٣٤/الفقه والتصّوف متلازمان/ فقيها وصوفّياً فكُن

## الفقه والتصوف متلازمان

فَقِيهاً وَ صُوفِياً فَكُنْ لَيْسَ وَاحِداً فَإِنِّي وَحَقِّ اللهِ إِيَّاكَ أُنْصَحُ

فَذلِكَ قَاسٍ، لَمْ يَذُقْ قَلْبُهُ تُقىً وَهذا جَهُولٌ، كَيْفَ ذُوالجَهْلِ يَصْلُحُ؟

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٣٢):

### (زانایی و خواپەرستی تەواوکەری یەکترین)

زانـــا و ســـۆفی بـــە، هـــەردوو، نـــە بەتـــەنیا یـــەك دانـــە

وا مـــن بـــۆ خـــوا پێـــت دەڵـــێم، بـــە ئـــەو زاتـــی یەزدانـــە

ئەمـــەیان دڵـــی رەقـــە، تـــەقوای پـــێ چـــێژ ناكـــرێ

ئـــەوی تریـــان نەزانـــە، كـــوا نـــەزانیش چـــاك دەكـــرێ؟

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٣٣)

ژیان ناسۆر و تاڵی زۆری هەیە، هەروەها شادی و خۆشیشی زۆرە، بەڵام چونكە تاڵی و ناسۆر هەیە، تامی خۆشیەكانمان لەیاد نیەو هەمیشە گومانمان وایە كە ناخۆشیەكان زۆرتر و گرانترن، بۆیە پێمان وایە هەمیشە ناشادین، مەگەر جاروبار، وەك جەژن و بۆنە، بۆماوەیەكی كورت شادیەكان بەسەرمانا بێن.

لەم دنیایەدا گەورە پیاوان بوون كە گەوج و نەزان و كۆیلەكانیان رزگاركردن، پێیان گەیاندن، كەچی ئەو كەسە كۆیلەو هیچ بەخۆنەدیوانە دەسەڵاتی خۆیان درێژ و پان كرد بەسەر خەڵك و وڵاتدا و دەستیان دایە كورسی پەرستی و دنیاخۆری و ستەمكردن، سەرەنجام ئەو مەزنە پیاو و ژنە ناودارو گەورانەیان كردە ژێر دەست و كۆیلەی بن دەستی خۆیان، لەمەوە بۆمان دەردەكەوێ كە دەسەڵاتی دنیا بایەخی نیەو وەفای بۆ كەس نیە.[1]

---

(١) ص٣٥/تملك الأوغاد/ محن الزمان كثيرة لاتنقضي/

## تملك الأوغاد

مِحَـــنُ الزَّمَـــانِ كَـــثِيرةٌ لا تَنْقَضِـــي      وَسُـــــرُورُهُ يَأْتِيـــــكَ كَالأَعْيَـــــادِ
مَلَـــكَ الأكَـــابِرَ فَاسْـــتَرَقَّ رِقَـــابَهُمْ      وَتَـــــرَاهُ رِقـــــاً فِي يَـــدِ الأوْغَـــــادِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٣٣):

### (خاوەنداریێتی گەوجان)

ناســـــۆری زەمانـــــە زۆرن، ناگەنـــــە کۆتـــــایی و تـــــەواو
شادێکانیشـــی وەك جـــەژن، ڕوت تـــێ دەکـــەن، نـــاو بـــەناو
گـــەورە پیـــاوان، ئـــەو کۆیلانـــەیان ڕزگـــار کـــرد، لـــە ژیانـــا
دەبینـــــی چـــۆن دەبنـــــە کۆیلـــە لەبەردەســـــتی گـــــەوجەکانا

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٣٤)

تۆمەتیان بۆ شافیعی دروست کرد، کە گوایە بووەتە ڕافیـزی، لـە کاتێکدا ئـەو تـەنها ویستویەتی خۆشەویستی خـۆی دەبـڕێ بـۆ ماڵـە بـاپیرەی، چـونکە دایکـی دەچێتەوە سەر هاوسەرەکەی علی کوڕی ئەبی طالـب، کـە بـە (ولـي الله) ناسـراوە، لەلایەکی ترەوە (علی) خ.ل یەکێکە لە نزیکترین هاوەڵانی پێغەمبەر د.خ کـە هێشـتا منداڵ بوو، لـە ڕووداوی کۆچـدا، خـۆی بەخشـی تـاکو لـە جێگـەی پێغەمبـەردا د.خ بخەوێت، شـافیعی مـافی خۆیـەتی شـانازی بـەو پیـاوە مەزنـەوە بکـات. بـەڵام وەو بەرپەرچی ئاژاوەگێڕان دەداتەوەو دەفەرموێ نا مـن لـە بیروباوەڕمـدا ڕافیـزی نـیم، بەڵکو من ئەو هەنگاوانە هەڵدەگرمەوە کە (علی) باپیرەم ناویەتی لە خزمەتی ئـاینی ئیسلام و زانست و زمانزانیدا، ئەو یەکێکە لە گەورە ڕابـەر و پێشـەواکانی ئیسـلام و جێنشینی چوارەمی پێغەمبەرە د.خ خەڵکی کەیفی خۆیانـە چـی دەڵـێن، مـن ئـەوم خـۆش دەوێ هـەروەکو چـۆن جێنشـینەکانی تریشـم خـۆش دەوێ، خـۆ ئەگـەر

خۆشەویستیم بۆ ئەو زاتە بەرزە لای ئێوە بە ڕافیزی لەقەڵەم دەدرێ، ئەوا منیش تا سەر ئێسقان ئەو جۆرە ڕافزیەتەی خۆم قەبوڵە، نەك ئەوەی ئێوە باسی دەكەن.[1]

**الترفض**

قَـــالُوا تَرَفَّضْـــتَ قُلْـــتُ: كَلَّـــا مَـــا الـــرَّفْضُ دِيـــني وَ لاَ اعْتِقَـــادِي
لَـــكِنْ تَولَيْـــتُ غَيْـــرَ شَـــكٍّ خَيْـــرَ إِمَـــامٍ وَخَيْـــرَ هَـــادِي
اِنْ كَـــانَ حُـــبُّ الـــوَلِيِّ رَفْضَـــا فَـــإِنَّ رَفْضِـــي إِلـــى العِبَـــادِ

**دەقی هۆنراوەی ژمارە (٣٤):**

**(ڕافزیەت)[2]**

پـێم دەڵـێن: بویتـە ڕافیـزی، منـیش دەڵـێم: نـەخێر وانـیم
ڕافیـــزی دینـــی مـــن نیـــە، لـــە باوەڕیشـــمدا وانـــیم
بـەڵكو مـن بـەبێ دوو دڵـی، هـەنگاوم نـاوە، بـە دوایـا
بێگومـانم كـە هـەر ئـەوە باشـترینی ڕێنمایـەو پێشـەوایە
ئەگـــەر خۆشەویســـتم بـــۆ (وەلی)[3] ڕافیـــزی بـــێ
ئـــەوەم دەوێ، گشـــت خـــەڵكیش لێـــم نـاڕازی بـێ

لەو هۆنراوەیەی سەرەوەدا شافیعی خۆشەویستی خۆی بۆ (علی كوڕی ئەبی طالیب) خ.ل دەردەبڕێ، وەك یەكێك لە جێنشین و پێشەوا بەجەرگ و زاناكانی پێشووی ئیسلام، بەڵام نەیار و ناحەزانی شافیعی ئەم هۆنراوەیەیان بۆ مەبەستی خراپ بەكارهێناو كردیانە بەڵگەیەك بەسەر شافیعی یەوە، كە گوایە بووەتە ڕافیزی،

(١) ص٣٥/ الترفض/ قالوا ترفضت، قلت لا/

(٢) ڕافیزیەت: الترفض: جۆرە بۆچوونێكی باوی ئەو سەردەمە بووە، كە هەر كەسێك بە تەنها یەك ئاراستەی دینی وەرگرتایەو ژیری و بەڵگە عەقڵی و نەقڵیەكانی بە گرنگ نەزانیبایە، بە گوێ نەگر و ڕافزی ناوزەدیان دەكرد، ئەگەر واش نەبووایە.

(٣) وەلی: لێرەدا مەبەست لە پێشەوا (علی كوڕی ئەبی تالیب)ە.

هەروەکو چۆن شیعەکان، زۆربەیان لەم سەردەمەدا سوننەکان بە لادەر ناودەبەن و ڕەوتی بیری خۆیان پێ باشترە، دەیانەویست لەو سەردەمەشدا فیتنەیەك بۆ ئەو زانا پایە بەرزە دروست بکەن، بەڵام پێشەوا شافیعی چونکە بەبێ جیاوازی هەموو خەلیفەکانی خۆش دەویست، کە بەو فیتنەی زانی هۆنراوەیەکی تری نووسی کە تیایدا ناوی هەموو خەلیفەکان وەکو یەك دەهێنێ لەوانە، أبوبکر، عومەر، عوسمانی کوڕی عەفان و عەلی. کە لەم دیوانەیدا هەیە.[1]

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٣٥)

(ئەسفەهانی) دەڵێت: (ابن قاسم) بۆی گێڕاینەوەو گوتی: (زوبەیری کوڕی عبدالواحد) بەلاماندا گوزەری کردو گوتی: گوێم لێ بوو کە (حەسەنی کوڕی سوفیان) دەیگوت: لە (حەرمەلە)ەوە گوێم لێبوو کە گوتی: گوێك لە شافیعی بوو کە دەیفەرموو.

هەندێ کەس هەیە ئومێدەوارن کە من بمرم، جا کە مردم ئەوا مردن ڕێی هەموو زیندەوەرانەو هیچ کەسێ لێی دەرباز نابێ، مردنی کەسانی پێش منیش ژیان بە من نابەخشنەوەو کەس لە جیاتی کەس نامرێ، هیچ کەسێکیش لە خەڵکی دوای مردنی منەوە بە نەمری نامێنن و بری من ناکەون، واتە ئەوەی دەژی بۆ خۆی دەژی، ئەوەی دەمرێ بۆ خۆی دەمرێ، لەوانەشە ئەو کەسەی ئاواتی مەرگی من دەخوازێ پێش من بمرێت.[2]

### الموت سبيل كل حي

تَمَنَّى رِجَالٌ أنْ أمُوتَ وَإنْ أمُتْ ... فَتِلْكَ سَبِيلٌ لَسْتُ فِيهَا بِأوْحَدِ

وَما مَوْتُ مَنْ قَدْ مَاتَ قَبْلِي بِضَائِري ... ولاَ عَيْشُ مَنْ قَدْ عَاشَ بَعْدِي بِمُخْلِدِي

لَعَلَّ الَّذي يَرْجُو فَنَائِي وَ يَدَّعِي بِهِ ... قَبْلَ مَوْتِي أنْ يَكُونَ هُوَ الرَّدي

---

(١) بڕوانە هۆنراوەی ژمارە (٦٣) لەم دیوانەدا.

(٢) ص٣٦ ص٣٧/ الموت سبيل كلّ حيّ/ تمنّى رجال أن اموت/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٣٥):

### (مەرگ چارەنووسی هەموو زیندەوەرانە)

هــــــەن کــەسانێ، تکـا خـوازن بـۆ مـردنم، کـە دەشمـرم
چـوومە ڕێیـەك، هـی هەمووانـە، تـەنیا نـیم ئـەو ڕێیـە دەگـرم
نـە مـەرگی کەسـانی پـێش خـۆم، ژینێـك بـە مـن دەداتـەوە
نـــە ژینـــی ئەوانــەی دوای مـــن، نەمـــرییان لێ وەردەگـــرم
ڕەنگـــە ئـــەوەی مەرگـــم بـــــە ئـــاوات دەخوازێـــت
لـە پێشـا نـۆرە هـی ئـەو بـێ، لـە پاشـانا ئـەمن بمـرم

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٣٦)

مرۆڤ لە تەنگانەدا ناچارە هانا بۆ هەموو کەسێ بەرێت، بەڵام زۆربەی ئەو کەسانەش مەردانە نایەن بەدەمەوە، تەنانەت ئەو کەسانەی بران، جێی متمانەو دۆستی سەر سفرەن لەو کاتانەدا تاقی دەبنەوەو دەردەکەون.

دەفەرموێت: تەمەنم فێری ناسینی شادی و ناشادی کردم، بانگی هەموو گیانەوەرانم کرد لە تەنگانەیەکدا تاکو بێن بە هانامەوە، ئەوانەی هاتن دوو جۆرە کەس بوون یەکیان کەوتە سوکایەتی و سەرزەنشتی کردن و جنێو پێدانم کە بۆچی خۆم فرێداوەتە ناو ئەو بەڵایەوە، ئەوی تریان کە جێی دڵخۆشی و ئومێدی من بوو، ئێرەیی پێ دەبردم و حەسوود بوو پێم و نەیدەویست لەو تەنگانەیە ڕزگاربم.[1]

### قلة الاخوان عند الشدائد

وَلَمَّا أَتَيْتُ النَّاسَ أَطْلُبُ عِنْدَهُمْ ... أَخَاثِقَةٍ عِنْدَ ابْتِلاَءِ الشَّدَائِدِ
تَعَلَّمْتُ فِي دَهْرِي رَخَاءً وَ شِدَّةً ... وَنَادَيْتُ فِي الأَحْيَاءِ هَلْ مِنْ مُسَاعِدِ؟
فَلَمْ أَرَ فِيمَا سَاءَنِي غَيْرَ شَامِتٍ ... وَلَمْ أَرَ فِيمَا سَرَّنِي غَيْرَ حَاسِدِ

(١) ص٣٧/قلة الأخوان عند الشدائد/ ولّما اتيتُ الناس اطلب عندهم/

دەقی هۆنراوەی ژمارە (٣٦):

## (کەمیی برایان لە تەنگانەدا)

کـە چـوومە لای ئـەو خەڵکانـەی، وەك بـرا، جـێ متمانـە بـوون
تـاکو بەفریـام بکـەون، لـەو کێشـانەی تەنگانـەم بـوون
لـە مـاوەی تەمـەنی خۆمـا، شـادی و تەنگانەشـم ناسـی
بانگی زیندەوەرانم کرد، فریـام کـەوت لـە دەمـی خـەم و کەساسـی
نـەمدی کەسـێ، مـەگـەر ئـەوەی بـە جنێـو وێرانـی کـردم
نەمـدی کەسـێ، دڵشـادم کـا، مەگـەر ئێـرەیـی پـێ بـردم

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٣٧)

کەسانی وا هەیـە، زێـدەڕەوی لـە هاوڕێیـەتی دا دەکـەن و هـەر حـەز دەکـەن ژمارەی هاوڕێکانیان زۆر بێ، بیر لە جۆرایـەتی ئـەو هاوڕێیانـەی ناکاتـەوە، پێشـەوا شافیعی لەسەر زاری ئەو جۆرە کەسانە دەفەرموێت:

ئەو کەسانەی کە هاوڕێیەتیم کردن، هێندە ژمارەیان زۆرە کە لە ژمارە نایـەن، وامزانی دەستم پڕ بووەو جێی کەسی تر نەماوە تا بیکەمە هاوڕێ، بەڵام کاتێك لـە ئەزموونـدان و هەڵمسـەنگاندن، بـۆم دەرکـەوت کـە ئـەوانیش وەك زەمانـە کەمتەرخەمی ناکەن لە غەدر و فێڵ، کەسیان بە پاکی دەرنەچوون، لـەناو ئەوانـەدا ئەگەر ساتێك لە خراپترین کەسیشیانەوە دابڕامایـەو بـزر بوومایـە گلـەیی دەکردو جنێـوی پـێ دەدام، کەچـی هاتـێ نـەخۆش دەکـەوتم باشـترین کەسـیان ئامـادەیی ئەوەی تێدا نەبوو کە سەردانم بکات، کـە خێـر و خۆشـیەك ڕووی تێـدەکردم ئـەوان پێیان ناخۆش بوو، کەچی کە کۆسپ و ناخۆشیم بەسەر دەهات دڵ خۆش دەبوون.

کەواتە ئەم جۆرە هاوڕێیانەت هەبێ، دوژمنت نـاوێ، بۆیـە یـەکێك لـە بـەڵاکانی ئەم سەردەمە کە بووەتە هۆی شڕکردن و خـراپ کردنـی پـەروەردەی نـەوەی نـوێ

بریتیە لە هاوڕێی خراپ و زۆری ژمارەیان، جا ئەو هاوڕێیانە هاوتەمەنەکانی گەڕەك و کۆڵان بن، یان هی قوتابخانە، یان هۆی کارو پیشەی هاوبەش، یاخود ئەوانەی لەڕێی ئەنتەرنێت و تۆڕە ئەلکترۆنیەکانەوە هاوڕێن و کاریگەرییان لەسەر ئاراستەی بیرو ڕەفتار و ڕەوشتی یەکتری هەیە.

پێشەوا شافیعی سەدان ساڵ بەر لە ئەمڕۆ هەستی بەو ڕاستیە کردووە و فەرموویەتی:[1]

**ود الناس**

إنِّـي صَـحِبْتُ النَّـاسَ مَـا لَهُـمْ عَـدَد ... وَكُنْـتُ أحْسَبُ أنِّي قَـدْ مَلَأْتُ يَـدِي

لَمَّـا بَلَـوْتُ أخِـــلاَّئِي وَجَـدْتُهُمُ ... كَالْدَّهْرِ فِي الغَـدْرِ لَمْ يَبْقُوا علـى أحَـدِ

إنْ غِبْتُ عَـنْهُمْ فَشَـرُّ النَّـاسِ يَشْتُمُني ... وَإنْ مرِضْـتُ فَخَيْـرُ النَّـاسِ لَـمْ يَعُـدِ

وَإنْ رَأَونِـي بِخَـيرٍ سَـاءَهُمْ فَرَحِـي ... وَإنْ رَأَونِـي بِشَـرٍّ سَـرَّهُمْ نَكَـدِي

**دەقی هۆنراوەی ژمارە (٣٧):**

**(سۆزو تێکەڵاوی خەڵکی)**

هاوڕێیەتی هێند کەسم کرد، ناویان لە ژمارە نایا
وامدەزانی دەستم پڕبوو، هەر ئەوەندەم لە توانایە
کەچی کە تاقیمکردنەوە، ئەنجامەکەم لێکدایەوە
وەك زەمانە غەدریان کرد، لای هیچ کەسێ نەمایەوە
کەساتێ بزر بم لێیان، خراپترین کەس جنێوم پێ دەدا
نەخۆشیش بم، باشترینیان نایات سەرێکم لێ بدا
کە لە خۆشیما دەیاندیم، دڵخۆش نەبوون، بە دڵشادیم
کاتێك دەیاندیم لە خەما، دڵشاد دەبوون بە ناشادیم

---

(١) ص٣٧/ودّ الناس/ إني صحبت الناس ما لهم عدد/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٣٨)

هەموومان دڵی مەرگ لەسەر تەوقی سەرمانە، کەی فرمانی پێ کرا بە کەللەمان دا دەڕواتە خوارێ، کەچی لەوە سەیرتر ئەوەیە کەسانی وا هەن، یان هەبوون، کە لەوە بێ ئاگا بوون کە پاش ساتێکی کەم دەبێ بمرن، پڕ بە دەمیان لە کەیف و شادی و تریقەی پێکەنیندان، ئەوانە ئەگەر بیانزانییایە کە کەمێکی تر دەبنە لاشەیەکی سارد و سڕی بێ گیان، ئەوا هەر لە ترسانا زینۆقیان دەچوو، فریشکیان دەکەوت، دەتۆقان، سوێیان دەبووەوە و دەمردن، لە خەم و ترسی ئەو مەرگە.

جێی سەرسامییە، کەسێك دڵنیانەبێ لەوەی ئاخۆ تا سبەینێ، دەژی یان دەمرێ، کەچی لە خەمی ڕزق و ڕۆزی دوو سبەی دابێ، ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە چ جۆرە بیرکردنەوەیەکی نابەجێیە..!

ئەم هۆنراوەیە فێرمان دەکات، کە چاوبرسی نەبین بۆ ڕزق و ڕۆزی ڕۆژێك کە هێشتا نەهاتووە، کەچی باڵندەکان هیچ لە هێلانەی خۆیاندا نیە بۆ سبەینێ و ناشمرن لە برسانا.(١)

### الاستعداد للمنايا

كَـمْ ضَـاحِكٍ وَالْمَنَايَـا فَـوْقَ هَامَتِـهِ ‏ ‏ لَـوْ كَـانَ يَعْلَـمُ غَيْبـاً مَـاتَ مِـنْ كَمَـدِ

مَـنْ كَـانَ لَـمْ يُـؤْتِ عِلْمَـا فِي بَقَـاءِ غَـدٍ ‏ ‏ مَاذَا تَفَكُّـــرُهُ فِـــي رِزْقِ بَعْـدَ غَـدِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٣٨):

### (ئامادەکاریی بۆ مەرگ)

چەند کەسی دەم بە پێکەنین، مەرگ تەوقی سەری دەگرێ
ئەگەر پەنهانی پێ دەزانی دەتۆقێ و سوی دەیباتەوە
کەسێ زانیاری پێ نەبێ، تا سبەی دەژی یا دەمرێ
چ بیرێکە وا لە ڕۆزیی، دوای سبەینێ دەکاتەوە؟

---

(١) ص٣٨/ الأستعداد للمنايا/ كم ضاحك والمنايا فوق هامته/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٣٩)

کەسی وا هەیە گوناهێك دەکات، لەوەوە خۆی ناودەنێ (تاوانبار) ئیتر هەمیشە لە ڕوانگەی ئەو ناوەوە دەڕوانێتە خۆی، بیرکردنەوە و کردارەکانیشی هەر بەلای خراپەکاری و تاوانکردندا دەبات، وا دەزانێت ئیتر دەرگای لێخۆشبوونی لێ داخراوە، بەڵام لە ڕاستیدا خوای گەورە بۆ خۆی ڕەحمەتەو لە هەموو شوێنێکیشە، کەواتە هەمیشە ڕەحمەتی خودا لێمان نزیکترە تا سزا و تۆڵە.

هەروەکو پێشەوا شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەیدا دەفەرموێ: ئەگەر بویتە شاخ و بەستەڵۆکێکی گەورە لە گوناه و تاوانت، یان لە گوناه و تاوانەکانت هێندەی یەك شاخی گەورەت کەڵەکە کردووە، بەڵام هێشتا ترسی خوات لە دڵدایە و تەوبە دەکەی و یادی ڕۆژی پەسڵان (قیامەت) دەکەیت، ئەوا خوای گەورە بارانی ڕەحمەتی خۆیت بەسەردا دەبارێنێ و دڵت دەشواتەوە، هەروەکو چۆن پێشتر هەزاران بەخشیش و نیعمەتی هەمەجۆری پێداویت.

نائومێد مەبە لە ڕەحمی خودا، ئەو لوتف و کەڕەمی زۆرە، بۆ نمونە تۆی لە زامالّی (الرحم)ی دایکت دا دروست کرد، چەندین قۆناغی گەشەی بەسەراهێنای و نەیهێشت لەناوبچیت، بوویتە خوێنپارە، گۆشتپارە، لەدایك بوویت، دوای ئەوەش ئەگەر خودا بیویستایە کە تۆ کەسێکی دۆزەخی بی بە هەمیشەیی، ئەوا خۆی لێ ئاشکرا نەدەکردی و ئاین و قورئان و پەیامی یەکخواپەرستی بۆ نەدەناردیت، ئێستا کە خودا ئەو هەموو نیعمەتانەی پێ داویت، مانای نایەوێ دۆزەخی بیت، بەڵکو پایەو شکۆی بەرزی بۆ داناوی لە بەهەشتدا، ئەگەر خۆت هەنگاوی بۆ بنێیت.[1]

---

(١) ص٣٩/ لاتقنط من رحمة الله/ إن كنت تغدو في الذنوب.

## لا تقنط من رحمة الله

إنْ كُنْـتَ تَغْـدُو في الـذُّنوبِ جَليـدَا — وَ تَخَـاف في يَـوْمِ المَعَـادِ وَعِيـدَا
فَلَقَـدْ أتَـاكَ مِـنَ المُهَـيْمِنِ عَفْـوُهُ — وَأفَـاضَ مِـنْ نِعَـمٍ عَلَيْـكَ مَزِيـدَا
لا تَيْأسَـنْ نْ لطـفِ رَبِّـكَ في الحَشَـا — في بَطْـنِ أُمِّـكَ مُضْـغَةً وَوَليـدَا
لَـوْ شَـاءَ أنْ تَصْـلَي جَهَـنَّم خَالِـدَا — مَـا كَـانَ ألْهَـمَ قَلْبَـكَ التَّوْحيـدَا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٣٩):

### (لە ڕەحمەتی خودا نائومێد مەبە)

گەر شاخێکیت، لە بەستەڵۆکی گوناه و، شکانی فەرمانی خوایی
بەڵام هێشتا، زۆر دەترسی، کە پرس و پەسڵانی[١] دوایی
ڕژاندی بەسەر دڵتدا بارانی لێبوردنی خۆی
ئەو خودایەی کە پێی بەخشی، نیعمەتی کۆتاو بەرایی[٢]
لە بەزەی پەروەردگارت، نائومێد نەبی هیچ کاتێ
بیخە بیرت، کە لە زامالْی[٣] دایە خوێنپارە[٤] بوی بەتەنهایی
خوا بیوستا، دۆزەخی هەمیشەیی بی، لەو دنیادا
لەم دنیادا، دڵت ڕێنما نەدەکرا بۆ پەرستشی خودایی

---

(١) پەسلان: ڕۆژی قیامەت.

(٢) بەرایی: بەرێ، بەر لە ئێستا، سەرەتا، پێشووتر.

(٣) زامالْ: ماڵی زایندە، ڕەحمی دایك، منداڵدان.

(٤) خوێنپارە: مەیوەخوێن، خەستەخوێن: هاوچەشنەی پارووی جوراوی نەرم و شل و لینج و کەتیرەیی که قۆناغێکی گەشەکردنی کۆرپەلەی مرۆڤە.

## دەروازەی هۆنـراوەی ژمارە (٤٠)

لە پێشەکی ئەم کتێبەدا ڕوونمان کردەوە کە پێشـەوا شـافیعی هـەرگیز حـەزی نەکردووە بە شاعیر بناسرێت، بەڵکو شیعری وەك هۆکـار بـەکارهێناوە بـۆ خزمـەتی ئاین و مرۆڤایەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا توانایـەکی گـەورەی هـەبووە لـە هـۆنراوە نوسیندا، بۆیە لە پایەی هۆنراوە کەم دەکاتەوە لە چاو ئاستی کرداردا و کـردەوەو گوفتاری چاکدا، وەك لەم هۆنراوەیەدا دەفەرموێت:

ئەگەر هۆنراوە ئەو کارەی پـێ بکرایـە کـە مـن دەمـەوێ بیکـەم، کـە خزمـەتی سـەرتا سـەریانەی ئیسـلام و مرۆڤایەتیـە ئـەوا هـۆنراوەی مـن زۆر بـەهێزترە لـە هۆنراوەکانی گەورە شاعیری ناودار (لەبید)، بەڵام هۆنراوە ئەو بەها گەورەیەی نیە، لەلای زانایـان، هـەر بـۆ نموونـە لـەم سـەردەمەدا زانایـەکی فیزیـا، یـان IT چـی لـە هۆنراوە بکات و کام ڕۆڵـی هەیـە لـە بـەرەوپێش بردنـی زانسـت و توێژینەوەکەیـدا؟ کەواتە سوود و بەهای هۆنراوەش سنوردارە.

شـافیعی کـەمێك باسـی تواناکـانی خـۆی دەکـات و دەفـەرموێت لـە گۆڕەپـانی جەنگی هۆنراوەدا لە هەردوو بەرەی (موهلەب) و (یەزید)یش ئازاترم، کـە ئـەوان لـە جەنگدا هەمیشە چاپوك و براوە بوون و دوو تیرەی ئـازای عـەرەبی چـاخی نـەفامی بوون.

دواتر دەفەرموێت: ئەگەر من بمەوێ توانا هونەری و ئەدەبییەکانم بـۆ خزمـەتی خۆم بەکاربهێنم ئەوا زۆربەی ئـەو خەڵکـە بـە خۆشـاناز و لەخۆباییانـە بەردەسـت و کۆیلەی ژێر دەستی من دەبوون، مەرجیش نیە پێشەوا شافیعی مەبەستی لە خودی خۆی بێ، لەوانەیە لەسەر زمانی کەسێك وابڵێ کە گشتی بێ و نادیار بێ.

بەڵام لەخواترسان وات لێ دەکات کەس بە کەم سەیر نەکەیت، بـە پێچـەوانەوە تا گەورە بی زیاتر خزمەت پێشکەش بە خوارووی خۆتەوە دەکەیت.[1]

---

(١) ص٣٩/ الوقار وخشية الله/ ولولا الشعر بالعلماء يُزري

**الوقار وخشية الله**

وَ لَــوْلا الشِّــعْرُ بِالْعُلَمــاءِ يُــزْرِي      لَكُنْــتُ الْيَــوْمَ أَشْــعَرَ مِــنْ لَبِيــدِ
وَ أَشْـجَعَ فِي الـوَغَى مِـنْ كُـلِّ لَيْـثٍ      وَ آلِ مُهَلَّـــبِ وَ بَنِـــي يَزِيـــدِ
وَ لَــوْلا خَشْــيَةُ الــرَّحْمنِ رَبِّــي      حَسِــبْتُ النَّــاسَ كُلَّهُــمُ عَبِيــدِي

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٤٠):

## (شەرم و لەخواترسان)

گـەر هـۆنراوە، لای زانایـان، بەهایەکـــی ئـــەوتـــۆی دەبـوو
ئـەوا، هـۆنراوەی ئـەمڕۆی مـن، باشـتر لـە هـی (لـــەبید) دەبـــوو
لـەو گۆڕەپـانی جەنگـەدا، لـە گشـت شێـــرێ، شـێتر دەبـــــووم
بـەرەی (موهلـەب)و (یەزیـد)یش، دەسـتی منیـــان پـێ نـەدەبوو
گەر ترسی شـەرمی خـودای خـۆم، لـەناو دڵمدا نـــەبـــایـــا[1]
ئـەوا ئـەو خەڵکـە، هـەموویان، لام[2]، بەردەسـت و کۆیلـە دەبـوو

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٤١)

(خەیثەمە)ی کوڕی (سلیمان)ی کوڕی (حیدرە) دەڵێت: پیاوێك هاتـە خزمـەتی شافیعی خ.ل پێی گوت: فڵان کەسی هاوڕێت نەخۆشـە، شـافیعی فـەرمووی: بـەخوا چاکەیەکی باشت لەگەڵ کردم، هۆشیارت کردمەوە بۆ بەدەست هێنـانی پاداشـتێك، ئەو پۆزشتەیشت لەسەر لابردم کە مەودای درۆکردنی تێدایە، ئینجا فەرمووی:

ئادەی کوڕەڵە ئەو نەعلە موویيانەم بۆ بێنـە، پاشـان فـەرمووی: بـەپێی پـەتی برۆی، بە دەستی بەتیغ براوەوە، لە گەرمای هاویندا بە تیـونێتی، بـە زگـی برسـی، باشــترە لــەوەی کــە دوایــی پۆزشــت و داوای لێبــوردن بهێنیتــەوە بــۆ هــاوڕێ

(١) نەبایا: نەبوایا

(٢) لام: لەلام، لەلای من، لەبەردەستی من، لەبن دەسەڵاتی من.

نەخۆشەکەت، کە لە درۆ بچێت (واتە بیانوی شێوە درۆی بۆ بێنیتەوە کە گوایە لەبەر ئەو هۆیانە نەتتوانیوە سەردانی بکەی)

پاشان ئەم هۆنراوەیەی فەرموو:[1]

## حقوق الناس

أرَى رَاحَةً لِلْحَقِّ عِنْدَ قَضَائِهِ وَ يَثْقُلُ يَوْماً إنْ تَرَكْتَ عَلَى عَمْدِ
وَحَسْبُكَ حَظّاً أنْ تُرَى غَيْرَ كَاذِبٍ وَقَوْلُكَ لَمْ أعْلَمْ وَذَاكَ مِنَ الجَهْدِ
وَمَنْ يَقْضِ حَقَّ الْجَارِ بَعْدَ ابْنِ عَمِّهِ وَصَاحِبِهِ الأدْنَى عَلَى الْقُرْبِ وَالبُعْدِ
يَعِشْ سَيِّداً يَسْتَعْذِبُ النَّاسُ ذِكْرَهُ وَإنْ نَابَهُ حَقٌّ أتَوْهُ عَلَى قَصْدِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٤١):

### (مافەکانی مرۆڤ)

پێم وایە، پشوویە بۆ هەق، کەسێك ئەرکێ بەجێ بێنێ
چ ڕۆژێکی بارگرانە[2]! کە بە ئەنقەس بیفەوتێنێ
بەسە هێندە بەختەوەر بی، درۆت لێ نەبینێ هیچ کەس
کە وەلامت (نازانم) بێ[3]، شکۆت گەورەتر دەنوێنێ
کەسێ مافی هاوسێکەی خۆی لەگەڵ هاوڕێ و کەسەکانی
دورونزیك بپارێزێ، ئەوا خەڵکی بەناوازە ناوی دێنێ
خۆ کەسێك مافی ئەم بخوا، خەڵکەکە بۆی لێ ئەسێنێ

---

(١) ص٤٠ص٤١، حقوق الناس/ أرى راحة للحق عند قضائه

(٢) واتە ئەو ڕۆژەت لەسەر شان قورس و گرانە، کە ئەرکی خۆت وەك پێویست تێدا جێبەجێ نەکردووە.

(٣) وتراوە (نازانم، ڕاحەتی گیانم) بەلام ئەوەش دەبلا لە سنور و کات و شوێنی خۆیدا بێت.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٤٢)

مرۆڤ خۆی حەزی لە چی بێ، داوای ئەوەش لە خودا دەکات، بەڵام خۆ مرۆڤ نازانێ چی باشە بۆی، خودا هەمیشە باشتر لەوەی بە مرۆڤە چاکەکان دەبەخشێ، ئەگەر واش نەبێ ئەوا خوا ئەوە بە بەندەی خۆی دەدات کە خۆی (واتە خوا) دەیەوێ نەك ئەوەی کە خۆی (واتە مرۆڤەکە) دەیەوێ.

مرۆڤ چاو چنۆکەو هەر داوای ماڵ و سامان و قازانجی دنیایی بۆ خۆی دەکات، لە کاتێکدا تەقواو خواپەرستی، زۆر باشترە بۆی لەو شتانەی کە داوای دەکات.

(محمدی کوڕی ابراهیم) دەڵێ (یوسف)ی کوڕی (عبدالأحد) بۆی گێڕاینەوە و وتی: لە (المزني)م پرسی ئەو دوو دێڕە هۆنراوەیە کامەیە کە شافیعی دەیگوت و دەیگوتەوە؟

لە وەڵامدا (المزني) وتی: شافیعی ئەم دوو دێڕەی دەگوت و دەگوتەوە:[1]

### أماني الانسان

يُرِيــدُ المَــرْءُ أنْ يُعْطَــى مُنَــاهُ ... وَيَــأْبَــــى اللهُ إلاَّ مَــــا أرَادَا

يَقُــولُ الْمَــرْءُ فَائـِــدَتِي وَمَــالِي ... وَتَقْــوَى اللهِ أفْضَــلُ مــا اسْــتَفَادَا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٤٢):

### (ئاواتەکانی مرۆڤ)

دەخوازێ مرۆڤ، دەکۆشێ، تا بیدرێتێ، هەرچی دەوێ
خواش هەر ئەوەی پێ دەبەخشێ، کەوا خۆی بۆ ئەوی دەوێ
مرۆڤ دەڵێ: کوا قازانجم، ئەی کوا ماڵ و سامانەکەم
کەچی هەر تەقوای خوداشە، باشتر لەوانەی دەیەوێ

---

(١) ص٤١/ أماني الأنسان/ يريد المرأ ان يعطي مُناه/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٤٣)

دنیا فراوانە، نەتەوەو گەل و وڵاتان زۆرن، کەلتورو نەریت و شارستانێتییەکان جۆراوجۆرن، زمانەکان، ئاینەکان، شێوازی ژیان، مێژوو... هتد، لە هەموو چەشن و جۆرەکان لەسەر زەویدا هەنە، ناکرێت تۆ لە تەنها یەك شوێن و یەك وڵات و یەك نەتەوە و ئاین و زمانێکدا بژیت و بمریت، بێ ئاگابی لەو جیهانە پان و بەرینە و هەمە جۆرە، لەبەرئەوە گەشت و وڵاتگەڕیی و سەردان گەلێك سوودی کۆمەڵایەتی و دەرونی و ئابوری بە مرۆڤ دەگەیەنێ، کەواتە دامەنیشە و پارە کەڵەکە مەکە، بەو ڕادەیە خۆت ماندوو مەکە، بەشێك لە تەمەنیشت دانێ بۆ پشوودان و چێژ وەرگرتن لە سەیران و سەردان و گەشت و ئاشنابوون بە وڵاتانی بیانی، هیچ نەبێ برۆ حەجێك بکە، عەمرەیەك بکە، لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکانت، دۆست و هاوڕێکانت، لە سەفەردا عەقڵت دەکرێتەوە، چاك و پاك، بەد و پیس، سور و سپی، باش و نەگریس، دەناسی، دەورنت ئاسودە دەبێ بەو ژینگە گۆڕینە، خەمەکانت دەڕەوێنەوە، جۆری نوێی کارو پیشەی تازە و قازانجداری فێردەبی، زانست و زانیاری و نەریت و ئەدەب و زمان فێر دەبی، برادەرانت بۆ تاقی دەبێتەوە، چونکە لە سەفەر و مامەڵەدا هاوڕێ دەناسرێت، شوێنان، شاران، گوند و دێهات و دەریا و شاخ و دورگەو چەم و بیابان دەبینی، بەردی سارد و گەرمت دێتە ڕێ، هەموو سەردانێکت وەك ئەوە وایە چوویتە خولێکی ڕاهێنانی شتی نوێ وە.[1]

### فوائد السفر

| | |
|---|---|
| تَغَـرَّبْ عَـنْ الأَوْطـانِ فِي طَلَـبِ العُلَـى | وَسَـافِرْ فَفِـي الأَسْـفَارِ خَمْـسُ فَوَائِـدِ |
| تَفَـــرُّجُ هَــمٍّ، وَاكْتِسَـــابُ مَعِيشَــةٍ | وَعِلْـــمٌ، وَآدَابٌ، وَ صُحْبَــةُ مَـــاجِدِ |

(١) ص٤١/ فوائد السفر/ تغربْ عن الأوطان في طلب العلى/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٤٣):

### (سوودەكانی گەشت و گەڕان)

بــڕۆ نــامۆیی ولآتــان، تــا خــواستـــی گــەورەت دەســتكەویٚ
دەی بگــەڕێ، لــە گــەڕانا، پێنـــج قـــازانجت دەســت دەكــەویٚ
بــەبای خــەمان[1]، بــژێوی و كــار، فێربــوونی زانســت و ئـــەدەب
ناســینی هــاوەڵانی چــاك[2]، چــاوت بـــە شوێنـــان دەكــەویٚ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٤٤)

وشەی (دنیا) لە (دنيء)ەوە هـاتووە، واتـا نـزم و كـەم ئاسـت، كەچـی هەنـدێ كەس بەڕادەیەك خووی پێوە دەرگن و هـۆگری دەبـن، دەڵێـی هـەرگیز شـتی لـەوە چاكتر نەماوە، كەسانێك هـەن پـڕە بـە باوەشـیان باڵیـان بـۆ دنیـاداری كردۆتـەوە، ئێوارەو بەیانی پەیتا پەیتا بەسەر ئەم دنیا كاتیـەدا دێـت و دەڕوات ، كەچـی مـرۆڤ پەند وەرناگرێ لە ئاوابوونی خۆر و مانگ و بیرناكاتەوە لەوەی كە ئـەو ئاوابوونانـە، واتــە دنیـاش ئـاوا دەبـێ و ون دەبـێ، شـافیعی ڕوو دەكاتـە ئـەو كەسانەی كە بـە پەرۆشەوە پڕ بە دڵ دنیایان خۆش دەوێ و دەفەرموێ: ئایا تا ئێستاش ئەو دەست لەملانیـەت واز لێ نـەهێنا بـۆ دنیـا خۆرەكـان، ئـەی كـەی و كـام كاتـت دانـاوە بـۆ خواپەرستیەك كە ڕەزامەندی خودا و بەهەشتی لێ بكەوێتـەوە؟ لـە فیردەوسـی ئـەو بەهەشتانەشدا لەجیاتی دنیا دەست بكەیتە ملی حۆریەكان و كیژانی نازدار و خوێن گەرم كە دەڵێی هێلكەی پاككراوی دەست لێ نەدراون؟

جا ئەگەر تۆ دەتەوێ لـەو بەهەشـتەدا نیشـتەجێ بیـت ئـەوا نابـێ هەوڵـەكانت بمرێنی، بەڵكو دەبێ تێبكۆشیت، هەروەها نابێ بـە هـەوڵ و چاكەكاریەكانیشـت لـە خۆت بایی ببی، بەڵكو دەبێ لەوەش دڵنیا بیت كە خوای گەورە دۆزەخێكـی پـان و

---

(١) بەبای خەمان: بەباكردنی خەم و پەژارە.

(٢) هاوەڵان: كۆی (هاوەڵ)ە، هاوڕێ، هاودەم، هاوگەشت، برادەر.

بەرینی دروست کردووە و نابێ بەتاڵ بێ، تۆش وریای خۆت بەو مەبە بە یەکێك لە سووتەمەنیەکانی ئەو دۆزەخەیەی کە سوتەمەنیەکەی مرۆڤ و بەردە، هەر لە دنیادا دڵت مەکە بە بەرد و ئامادەی مەکە بۆ هاوبەرد بوونی لەگەڵ بەردە دۆزەخیە ڕەشەکان. تۆ دڵت هەیە و دەتوانیت بیکەیتە چرایەکی ڕووناك بۆ ڕێنمایی خۆت و کەسانی تریش، ئیتر لەنێوان (چرا) و (بەرد)دا بۆچی بەردێکی ڕەق و ڕەش هەڵدەبژێریت[1]..؟

## التأهب للآخرة

يَا مَنْ يُعَانِقُ دُنْيَا لا بَقَاءَ لَهَا — يُمْسِي وَ يُصْبِحُ فِي دُنْيَاهُ سَفَّارَا
هَلاَّ تَرَكْتَ لِذِي الدُّنْيَا مُعَانَقَةً — حَتَّى تُعَانِقَ فِي الْفِرْدَوْسِ أَبْكَارَا
إِنْ كُنْتَ تَبْغِي جِنَانَ الْخُلْدِ تَسْكُنُهَا — فَيَنْبَغِي لَكَ أَنْ لاتَأْمَنَ النَّارَا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٤٤):

## (ئامادەکاری بۆ پەسڵان)

ئەی ئەو کەسەی، کە باوەشت بۆ ئەم دنیا براوەیە گرتۆتەوە[2]
دڵنیاشی، دوای ئێوارە، بەربەیانت لە قیامەتا کردۆتەوە

---

(١) ص٤٢/ التأهب للآخرة/ يا من يعانق الدنيا لا بقاء لها/

(٢) یان وەرگێڕانەکە بەم جۆرەیە:

ئەی ئەو کەسەی کە باوەشت بە دنیایەکا کردووە، دەبڕێتەوە
ئێوارە دێ و بەربەیانت، لەو دنیای تر کردۆتەوە
ئەو دەستلەملانەت جێ نەهێشت، بۆ دنیادارەکان ئێستا
تا دەست لەملانی حۆری بی، لەناو بەهەشتی فیردەوسا
بەتەما بی، لەنێو بەهەشتی نەبڕاوەی خودا، دابی
زۆر پێویستە کە لە خەمی ئاگری دۆزەخیشا بی

وازت نــــەهێنا هێشــــتاکە؟ دەســــتت هـــەر لـــە مـــل دنیایـــە؟
ئەی چی کاتێ بۆ دەستلەملانی فیردەوس، دڵت یەکلا کردۆتـەوە
بەتـــەما بـــی، لـــەنێـــو بەهەشتـــی نـــەبڕاوەی خـــودا دابـــی
زۆر پێویســـتە، بـــێ بـــاك نـــەبی، دۆزەخ دەرگـــای کردۆتـــەوە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٤٥)

لـەم هۆنراوەیـەدا پێشـەوا شـافیعی خ.ل لەگـەڵ چیاکانی (سـەرەندیب)و بـیرە ئاوەکانی (تەکرور) دەدوێ، پێیان دەڵێ ئەی چیاکان بارانی مرواری بەسـەر خۆتانـا ببارێنن، ئەی بیرەکان ئێوەش پڕ ببن لـە ئـاڵتون، ئەوانـە هـیچ بـەلای منـەوە جێـی بایەخ نین، چونکە من مرۆڤێکی بەقەناعەتم، هەموو کەسێکیش هـەر ئەوەنـدەی پـێ دەخورێ کە گەدەی دەیگرێ، هەر ئەوەندە بەرگی بـۆ دەپۆشـرێ کـە شـان و ملـی هەڵی بگرێ، من نامرم لە برسانا کە زێڕ نەباریوە، زیاتر لەوەشـم پێویسـت نیـە کـە هەمە، ئەگەر زێڕ و مرواری بەسەر چیاو بیرەکانیشدا بباری، ئەوەتا من دەژیم و بـێ بـژێو و قـووت نـەبووم، کـە مردیشـم، بـێ گـۆڕ و کڵکـۆ نـابم و چـاك و خاکێـك لـەم سەرزەمینە، پان و بەرینە هـەر دەبـێ تـا بکرێتـە گـۆڕ بـۆم، هیمـەت و باوەڕیـەخۆ بوونم، بڕوا بوونم بەوەی کە خودا ڕۆزیـدەرە وەکـو هیمـەتی سـەرکردەو پاشـایانە، دەرونیشـم بـەرزەو دەرونـی کەسـانی ئـازاد و سەربەسـتە، دەرونم پێـی وایـە کـە کڕوزانەوە بۆ ڕزق و ڕۆزی بێباوەڕیـە، ئیـدی کـە مـن ڕازی بم بـەو بـەش و قووتـەی خۆم، چ پێویستم بەوەیە لە دەرگای ئەم و ئەو، فلان و فیسار، عەمر و زەیـد بـدەم و داوای یارمەتیان لێ بکەم...؟

هەرکەسێ داوایەکی لە کەسێ ببێ دەبێ لەبەردەمیـدا خـۆی بچـوك بکاتـەوە و لێی بپاڕێتەوە، بەڵام دەرونی من هێندە بەشکۆ و بەرزە، ڕێگـەم پـێ نـادات کـە بـۆ هیچ کەسێ سەرم شۆڕ بکەمەوەو دەستم پان بکەمەوە.

هەرکەسێ داوای شتێ لە کەسێ بکات دەبێ لە کاتی لێوەرگرتنی ئەو شتە داواکراوەدا دەستی نزم بکاتەوەو دەستی بەخشەرەکە لەسەروترەوە بێ، هەروەکو دەستی سواڵکەر کە هەمیشە لە نزمیدایە، کە دەرونیشم بەرزە، ئازایەتی خۆم نیە، بەڵکو بیروباوەڕی ئیسلام ئاوای پەروەردە کردووم.[1]

## الهمة العالية

أمْطِرِي لُؤْلُؤاً جِبَالَ سَرَنْدِيـ ... بَ وَ فِيضِي آبَارُ تكرورَ تِبْرَا

أنَا إنْ عَشْتُ لَسْتُ أعْدَمُ قُوتاً ... وَإذا مُتّ لَسْتُ أعْدَمُ قَبْرَا

هِمَّتِي هِمَّةُ المُلُوكِ وَنَفْسِي ... نَفْسُ حُرٍّ تَرَى المَذَلَّةَ كُفْرَا

وَإذَا مَا قَنِعْتُ بِالقُوتِ عُمْرِي ... فَلِمَاذَا أزُورُ زَيْداً وَ عَمْرَا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٤٥):

### (هیمەت بەرزی)

چیاکانی سەرەندیب، بباریٚنە، بەسەر خۆتا، مرواری
ئەی چاڵاوەکانی (تەکرور) دەرپەڕێنن لافاوی زێڕ
کاتێ کە ژیابم بەبێ قووت، وا، لەبرسا ناکەم زاری
کە مردیشم، بێ گۆڕ نابم، لەم دنیا پان و بەرینە
هیمەتم پاشایانەیە و دەروونیشم، پڕ بە زاری
هاوار دەکا: (من ئازادم)، بۆیە وا بڵندە سەرم
چونکە هەرگیز دانابەزم، بۆ بێ باوەڕی و بەدکاری
کە من، لە تەمەنی خۆما، ڕازی بم بە قووت و بەشم
بۆ، سەر لە (عەمر) و (زەید)دەم، بە مەبەستی داواکاری؟

(١) ص٤٢/ الهمة العالية/ أمطري لؤلؤاً جبال سرنديب/

# دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٤٦)

هاوڕێ و هاوپیشە، دەوری گرنگیان هەیە لەسەر ژیانی مرۆڤ، هاوڕێی چاك ئەو کەسەیە کە هاندەرتە بۆ کاری چاك و خواپەرستی، لێت دەپرسێتەوە، هاوکاریت دەکات، چاودێریت دەکات، جا ئەگەر هاوڕێیەکی تەقواکارت دەست نەکەوت ئەوا بێ هاوڕێ بە، ئەو تەنهاییەت تام و چێژی زیاترە لەوەی کە تێکەڵی کۆڕ و کۆمەڵێکی خراپ ببی، دەفەرموێت:

بەتەنها لەگەڵ خۆمدا دانیشم و خەریکی خواپەرستی خۆم دەبم، بەوە بەرچاو ڕوون تر و دڵخۆشتر دەبم، وەك لەوەی لە کۆڕ و کۆمەڵێکدا بم کە گومانم لێیان هەبێ، لە شەڕ و خراپەی بەدگومان بم، بترسم و سڵیان لێ بکەمەوە.

## العزلة خير من جليس سوء

إذا لَمْ أجِدْ خِلاً تَقِيّاً فَوِحْدَتي ... ألَذُّ وَأشْهَى مِنْ غَوِيٍّ أُعَاشِرُه

وَأجْلِسُ وَحْدِي لِلْعِبَادَةِ آمِناً ... أقَرُّ لِعَيْنِي مِنْ جَلِيسٍ أُحَاذِرُه

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٤٦):

## (دابڕان باشترە لە کۆڕ و هاوڕێی خراپ)

گەر هاوڕێم، خواپەرست نەبێ، تەنهاییم زۆر بەتامترە

لەتێکەڵیم لەگەڵ کۆڕێك، خراپەیان پێ باشترە

دائەنیشم بە تەنهایی، بێوەی، خواپەرستیم دەکەم

وا بەرچاوم ڕۆشنترە، تا کۆڕێك بێ، کەلێی سڵ کەم[1]

---

(١) لێی سڵ کەم: سڵی لێ بکەمەوە.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٤٧)

(أبوالفضل نصرالدين)ی کوڕی (ابی نصر)ی (طوسي) دەڵێت: گوێم لە (ابا الحسن علي ابن احمد القضري) بوو، دەیگوت: لە هەندێ لە شێخەکانمانەوە بیستومە، کاتێ شافیعی خ.ل بەرەو شاری (سُرمن رأى) واتە (سامەڕای عێراق) کەوتە ڕێ، تاکو گەیشتە ئەوێ سەرو ڕیشی درێژ ببوو (چونکە سەفەر بە وڵاخ و پێ بووە)، ڕووی کردە لای سەرتاشێك، سەرتاشەکە کە بینی بێزی لەو ڕیش و سەرو قژە درێژەی کرد و پێی وت: بچۆ بۆ لای سەرتاشێکی تر، شافیعی ئەو قسەیەی زۆر لەسەر دڵ گران بوو، لای کردەوە بەلای ئەو کوڕەی لەگەڵیدا بوو، ڕۆڵە چ شتێکت پێیە لە پارەو پول؟ گوتی: دە دینار، فەرمووی: دە بمدەرێ، پارەکەی دایە دەستی و لەوێ ڕۆیشتن، لەو کاتەدا شافیعی ئەم هۆنراوەیەی فەرموو:

ئەم هۆنراوەیە ئەوە نیشان دەدات، کاتێك کەسێك ڕوو دەکاتە وڵاتێکی تر و ناناسرێت، چەندە زانا و بەتوانا بێ ناناسرێت، خەڵکی بەپێی جل و بەرگ و سەرو سیمای بۆی دەڕوانن، بەڵام شافیعی دەفەرموێ ئەو سەرتاشەش ناهەقی نیە، چونکە بەرگەکانم زۆر کۆن و پەڕپووتە و سەرو ڕیشم تێك ئاڵاوە[1]، بەڵام خۆ لەناو ئەو بەرگ و جل و جەستەیەمدا دڵ و دەروون و عەقڵێکی گەورەم هەیە، ڕاستە بەرگەکانم ئەگەر سەراپا بفرۆشم بە یەك فلس، ئەوا ئەو یەك فلسە زۆر زیاترە لە نرخی بەرگەکانم، بەڵام ئەوە کەموکوڕی نیە بۆ من، مادام ناو بەرگەکان ئاوەدانە، هەروەکو کەمی و شەرم و شورەیی نیە بۆ شمشێر کە کێلان و بەرگەکەی دڕاو بێ، بە مەرجێك خۆی تیژ و بڕندەبێ، واتا ئێمە ئیشمان بە ناوەڕۆکی مرۆڤ هەیە، نەك ڕوکەش، خوداش لەو دنیا تەماشای جەستەو قیافەت و قەد و باڵامان ناکات، تەماشای ڕوخسار و سیمامان ناکات، بەڵکو سەیری قوڵایی دڵمان دەکات، لە ڕۆژی

---

(١) گەلێك کەسی دانا و ژیر و زانا لەناو میللەتاندا هەبوون کە لەبەر هەژاری جل و بەرگی کۆن و دڕاویان پۆشیوە، بەڵام ناخیان پڕ لە گەوهەری زانست بووە، وەکو (قانع)ی شاعیری چەوساوەکان لەناو شاعیرانی کوردماندا.

قیامەتیشدا سامان و ماڵ و منداڵ سوودی نیە، بەڵکو دڵێکی باوەڕدار و لەخواترساو گەورەترین سامانی ئەو ڕۆژەیە.

هاوکات نابێ مرۆڤ بە ئەنقەست شۆڕە پۆشی و پەڕپووتی و ڕوت و ڕەجاڵی و چڵکنی و کوڵکنی هەڵبژێرێ، بە پێچەوانەوە کام بەرگەت هەیە کە جوانە، ئەوە لەبەر بکە، با خەڵکی بزانن کە تۆ هەبوویت و خوا پێداویت، بەڵام لەمەشدا زێدەڕەوی مەکە و باو هەڵشاخان و لەخۆبایی بوون نەتگرێ و بەسەر هەژار و داماواندا خۆت مەنوێنە، سادەو بێ فیز و بەخشندەبە بەرانبەری هەژار و داماوان.

پێویستە بزانین کە نابێ لەناو خەڵکیدا بە کەم و سووك و نەزان و پەڕپووت سەیری ئەو کەسانە بکەیت کە ئەو بەرگانەیان لەبەردایە.[1]

### قيمة الأنسان ما يحسنه

عَلَــيَّ ثِيَــابُ لَــوْ تُبَــاعُ جَمِيعُهــا ... بِفَلْسٍ لَــكَانَ الفَلْسَ مِنْهُــــنَّ أَكْثَرَا

وَفِــيهِنَّ نَفْـسٌ لَـوْ تُقَـاس بِبَعْضِــهَا ... نُفُــوسُ الــوَرَى كَانَــتْ أَجَــلَّ وَأَكْبَــرَا

وَمَا ضَرَّ نَصْلَ السَّيْفِ إِخْلاقُ غِمْدِهِ ... إِذَا كانَ عَضْباً حَيْـثُ وَجَهْتَــهُ فَـرَى

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٤٧):

### (بەهای مرۆڤ ناخیەتی)

بــــەرگێکی وام لەبەردایـــــە، هـــــەمووی بفرۆشـــم بــــە فلســـێ
هێشـــتا بـــەرگم هەرزانـــــــترە، لـــە نرخـــی یـــەك تاكـــە فلســـێ
بـــەڵام دەروونێکـــی تێــــــدا، گەورەیـــــــی ئـــەو لـــەباس نایـــا
لـــە پـــاکی و بـــەرزی و جــــــوانیدا، گـــەلێ بـــەنرخ و بەهایـــە
بـــۆ شمشـــێر شــــــورەیی نابـــێ، كـــە كێلانەكـــەی[2] درابـــێ
بـــە مـــەرجێ تیـــژ و كـــارا بـــێ، گـــەر ئاڕاســـتەی بـــۆ هـــەرلابێ

(١) ص٤٣/قيمة الأنسان/ عَلَيَّ ثيابُ لو تباع جَميُعها/

(٢) كێلان: كالان، بەرگی خەنجەر و شمشێر، كيف.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٤٨)

هەندێ کـەس هەیـە، زۆر لەخۆبایییـە، لـەوەش خـراپتر ئەوەیـە کـە وەکـو (کەرەمار) خۆی گێل دەکات لەو لەخۆبایی بوونەی و بەشێکی ئاسـایی دەزانـێ، تـا لەگەڵ خوێنی تێکەڵ دەبێ، ئیتر ئـەو کەسـە لـەخۆبایی ببـوون دەبێتـە بەشێك لـە کەسێتی یەکەی، بـەلام لـە ڕاستیدا ئـەوە خویـەکی خراپـە، بـاش وایـە ئامۆژگـاری بکەیت و پێی بڵێی فلانەکەس وریای خۆت بـە، وا مەبـە، گومانـت بەرانبـەر کـرداری خۆت چاك بێ، ئینجا چاکە بکە، نەك کرداری خـراپ بکـەیت و گومانیشـت بەرانبـەر کارەکانت چاك بێ، لەو بارەدا لە ڕووداوەکانی قەدەر ناترسی.

جـاری وا هەیـە تـۆ لەوپـەڕی خۆشـی و شـادیدایت کەچـی لـەناکاو ڕوداوێکـی ناخۆش ڕوودەدات، وا مەزانە کاتێ دەگەیتە خۆشی و شادیەکانت ئیتر ناگەڕێیتـەوە سەر ناڕەحەتیەکان، لە هەریەکە لەو بارانەدا، بارەکەی ترت لەبیر بـێ، واش مەزانـە لەبەرئەوەی کە تـۆ پاکیـت و چـاکەکاریی ئـیتر کۆسـپ و خـەم و تەنگانـەت بەسـەر نایـات، بـە پێچـەوانەوە، جـاری وا هەیـە کەسـانی چـاك و چـاکەکار گرفـت و بـەلای گەورەیان بەسەر دێ، بەتایبەتی لە سەردەمێکدا کـە خـەڵکی چـاکەکار کـەمترن لـە خەڵکانی خراپەکار.

مەرج نیە چاکەکاریەکانت بـەلای هـەموو کەسێکەوە چـاك بـن، هەمیشـە تـۆی چاکەکار کەسێك نەیارتە، کـە کەسـێکی خراپـەکارە لەبەرئـەوە جـاری وا هەیـە، بـە پێچەوانەوە چاکەکاری و پاکی خۆت، لەم دنیایەدا و لەلای هەندێ کەس پلەوپایـەت کەم دەکاتەوە، بگـرە گازەنـدەو هەڕەشـەت لێ دەکـەن، هـەروەکو چـۆن گەلەکـەی حـەزرەتی (لوگ)یـان تاوانبـار دەکـرد بـەوەی کـە خـۆی و ئەوانـەی لەگەڵیـدان کەسانێکی پاك و داوێن پاك..! ئەمەش لـە فەرهـەنگی بەدکارانـدا بـاش نیـە، بۆیـە دژایەتیان دەکردن[1].

---

(١) ص٤٤/اليقظة والحذر/ تاه الأعيرج و استعلى به الخطر/

## اليقظة والحذر

تَـاهَ الأُعَيْـرِجُ وُاسْـتَغَلَى بِـهِ الخَطَـرُ   فَقُـلْ لَـهُ خَيْـرُ مَـا اسْـتَعْمَلْتَهُ الْحَـذَرُ
أَحْسَـنْتَ ظَنَّـكَ بِالأَيَّـامِ إِذْ حَسُـنَتْ   وَلَـمْ تَخَـفْ سُـوءَ مَـا يَـأْتِي بِـهِ الْقَـدَرُ
وَسَـالَمَتْكَ اللَّيَـالي فَـاعتَرَرْتَ بَهَـا   وَعِنْـدَ صَـفْوِ اللَّيَـالِي يَحْـدُثُ الكَـدَرُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٤٨):

### (هۆشیاری و سڵەمینەوە)

کەسێك کە وەکو کەڕەمار، لە بەرزیدا خۆی ببینێ
ئەوا مەترسی لە سەرە، با وریا بێ و سڵ کاتەوە
گەلێ چاکە، کە پێی بڵێی: با بەو جۆرە خۆی نەبینێ
ڕەفتار چاکیت، بە گومانی چاکی خۆتە، دەتکاتەوە
بۆیە ناترسی لەو ژینەی کەوا قەدەر بۆتی دێنێ
دەمێ، شەوگار، دەرگای سەلامەتیت دەکاتەوە
لە گەرمەی پاکیتایە، ڕۆژگار تەنگانەت بۆ دێنێ
پێت وانەبێ، چاکەکانت، لای هەموان بەرزت کاتەوە

### دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٤٩)

هەندێ کەس هەیە، زۆر درەنگ تورە دەبێ، بەڵام کە تورە دەبێ، زۆر بە توندی تورە دەبێ و پاشان لە کەس نابورێ، خاتری کەس ناگرێ، نازانێ کە سبەی خۆیشی هەڵەیەك دەکات و کاتێ داوای لێبوردن لە بەرانبەرەکەی دەکات ئەویش بەرانبەری ئەم ڕەق دەبێ، بۆیە شافیعی دەفەرموێت: تکا و داوای لێبوردن وەربگرە لە کەسێك کە داوای لێبوردنت لێ بکات، ئیتر تۆ کاری خۆت بکە کە لێبوردنە لە ئەو کەسە و بەدوای ئەوەدا مەڕۆ ئاخۆ ئەو کەسە ڕاست دەکات یان درۆ، تۆ کارت بەوە چیە؟ هەقت نەبێ بەسەر ئەوەیانەوەو لق و پۆپ بۆ ئیشەکەت

مەدۆزەرەوە، درۆ بکات، یان ڕاستە، تۆ لێی ببورە، دڵنیابە ئەو کەسەی کە بە ڕووکەش لەتۆ ڕازیە گوێڕایەڵیشت دەکات، بەڵام ئەوەی لێت ناڕازیە، ناڕازییەکەی لە تۆ لە قوڵایی دڵی خۆیدا دەشارێتەوە و دەری نابڕێ، لەبەرئەوە وریایی خۆت بە مەخەڵەتێ بەو خۆشەویستیە ڕووکەشەی لە بەرانبەرت دەینوێنن، تۆ بە ئاشکرا لە خەڵکی ببورە و پۆزشتیان وەرگرە، تاکو خەڵکیش فێر ببن بە ئاشکرا خەڵکیان خۆش بوێ و ڕق و قین نەشارنەوەو نەبنە کەسانی دوو ڕوو:[1]

## التماس العذر

| | |
|---|---|
| إقْبَلْ مَعَاذِيرَ مَنْ يَأْتِيكَ مُعْتَذِراً | إنْ بَرَّ عِنْدَكَ فِيمَا قَالَ أوْ فَجَرَا |
| لَقَدْ أطَاعَكَ مَنْ يُرْضِيكَ ظَاهِرُهُ | وَقَدْ أجَلَّكَ مَنْ يَعْصِيكَ مُسْتَتِرَا |

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٤٩):

## (تکای لێبوردن وەربگرە)

تکای ئەو کەسە وەربگرە، داوای لێبووردنت لێکا[2]
گوێ مەدەرێ، یاخود ڕاستە، یا ناڕاستەو درۆ ئەکا
گوێڕایەڵتە بە ڕووکەشی، ئەو کەسەی لە تۆ ڕازیە
ڕازی دڵی، شاراوەیە، ئەو کەسەی بەگەنت ناکا[3]

---

(١) ص٤٤/ التماس العذر/ اقبل معاذير من يأتيك معتذراً

(٢) لێکا: لێبکا.

(٣) بەگەنت ناکا: پەسەندت ناکا

# دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٥٠)

لێکدوان، گفتوگۆی دوو کەسە بەرانبەری یەکتری بە مەبەستی ئەوەی بگەنە ئەنجامێکی باش لە دۆز و باسێکدا، واتە دەیانەوێ بگەنە دۆزینەوەی ڕاستیەك، ئەمەش لە شێواز و ئەدەبی خۆی هەیە، بەڵگە و سەلماندن و زانایی دەوێ، دەبێ کارەکە بەپێی لۆژیك و ژیری بڕوات بە هێمنی، پێویست بە هەڵچون و شەڕە جنێو ناکات، بەداخەوە لەم سەردەمەدا، بەتایبەتی لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، دوو کەس یان زیاتر بەرانبەری یەك دەخوێنن و شەڕە قسە دەکەن، گوێگرو بینەران نازانن ڕاستیەکە کامەیە، پێشەوا شافیعی خ.ل لە سەردەمی خۆیەوە هەستی بە مەترسی ئەو جۆرە لێکدوان و گفتوگۆ خراپانە کردووەو ڕێنماییان دەداتێ و دەفەرموێ:

ئەگەر تۆ خاوەن پایەو شکۆی و ڕێز و قەدری زانست و زانیاریت لایەو لە کەسانی پێش سەردەمی خۆت و سەردەمی خۆت جیاوازیت و دەتەوێ بە شێوازێکی چاکتر و تایبەتی لێکدوان بکەیت، ئەوا بەبێ دەنگی و هێمنی و زانیاری تەواوە بدوێ لەگەڵ هاوتاکەتدا، خۆت بە گەورە تر لەو مەگرە، جارویار نوکتەو قسەی خۆشی ڕاستەقینە تێکەڵی قسەکانت بکە، خۆت دوور بگرە لە دەمەقاڵێ و نکوڵی لە ئاستی هەق و ڕیابازی و شانازی بەخۆوەکردن، خەریکی نەزان بەزاندن مەبەو سەنگەری شەڕ و تەشەر و شکاندن و تەریق کردنەوە لە بەرانبەرەکەت مەگرە، شیر و تیر لە یەکتری مەسوون، ئەمە گەڕانە بەدوای دۆزینەوەی ڕاستیەکی ونبوودا نەك بانگەشەی هێرش و جەنگ و زۆرانبازیی.[1]

---

(١) ص٤٥/ أدب المناظرة/ إذا ما كنت ذا فضل و علم/

## أدب المناظرة

إِذَا مَـــا كُنْـــتَ ذَا فَضْـــلٍ وَ عِلْـــمٍ | بِمَـــا اخْتَلَـــفَ الأَوَائِـــلُ وَالأَوَاخِـــر
فَنَـــاظِرْ مَـــنْ تُنَـــاظِرُ فِي سُـــكُونٍ | حَلِيـــــماً لا تَلِـــحُّ وَ لاَ تُكَـــابِـــــر
يُفِيـــدُكَ مَـــا اسْـــتَفَادَ بِـــلاَ امْتِنَـــانٍ | مِـــنَ النُّكَـــتِ اللَّطِيفَـــةِ وَالنَّـــوَادِرِ
وَإِيَّـــاكَ اللَّجُـــوجَ وَمَـــنْ يُرَانِـــي | بِـــأَنِّي قَـــدْ غَلَبْـــتُ وَمَـــن يُفَـــاخِرْ
فَـــإِنَّ الشَّـــرَّ فِي جَنْبَـــاتِ هَـــذَا | يُمَنِّـــي بِالـــتَّقَاطُـــعِ وَالتَّـــدَابِرِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٥٠):

### (ئەدەبی لێکدوان)[١]

ئـەگــــەر تــــۆ خــاوەنــــی ڕێـــز و زانستــــداری
ســــەبارەت بــــە ڕاجیــــاوازیی پێشــــینەکان و هاوچــــەرخان
بـەبێ فیــزی و نــەرم و نیــانی، لــە ڕێگــەی بــەڵگەی جوانــەوە
بــدویٚ لەگــەڵ هاوتــاکەتدا، بزانــە ئەدەبــی لێــکدوان
ســوودی دەبـــێ بــــۆ تـــۆش وەك ئــەو بەبــێ منــــەت
ئــەو نوکتــەو نەستەقــە جوانــەی دەرتــابڕیوە هــەردوتان[٢]
نــەکەی شانـــازی دەربـــڕی کـــە زاڵ بـــی بەســـەر کەســێکا
بــــەدوربە لــە دەمــە قاڵـێ و بـیری هــــەڵەی نـەزان بـەزان[٣]
لـــــە شـــــەڕ بەدوربـــــە لـــــەو جــــۆرە گفتوگۆیــــەدا
ئـــــەگەر وابـــی ئـــەوا ئـــەنجام، پشـــت هەڵکردنـــەو دابـــڕان

---

(١) لێکدوان: المحادثة وجهالوجه: المناظرة.

(٢) هەردوتان: هەردوکتان، هەردوولاتان

(٣) نەزان بەزان: بەزاندنی کەسانی نەزان، کە ئەمە زیاتر لە شەڕە قۆچ و زۆرانبازیدایە، نەك لە گفتوگۆ و لێکدوان.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٥١)

کات، لە دوور جۆرە ڕۆژ پێك دێ، ڕۆژێکی پڕ لە ئاسایشی و خۆشی، ڕۆژێکیش پڕ لە ترس و مەترسیە، ژیان دوو جۆرە، ژیانێکی خۆش و شیرین، ژیانێکی تاڵ و گران و پڕ لە کێشە.

سەرنجی دەریا بدە، بەشی سەرەوەی پڕە لە لاکی گیانەوەری مردارەوە بووی ناو ئاو و کەف و ئیسفەنج و سووکە شەخەڵەکان، بەڵام لە قوڵایی دەریادا هەمیشە مرواری و شتی بەنرخ و سەنگین هەیە، کەواتە دەریاش دوو بەشە، ڕۆژگار دوو بەشە.

ئینجا سەرنجی ئاسمان بدە، پڕە لە ئەستێرەو مانگ و خۆر، زۆربەیان هەڵدێن، ئاوا دەبن، دەردەکەون، ون دەبن، کەچی گوێ بەوانە نادەین، کەچی ئەوەیان بەهەند وەردەگرین کە ئاوابوون و گیران و دیارنەمانی خۆرە، لەو ئاسمانە پان و بەرین و پڕ لە ئەستێرەو هەسارەی ورد و گەورە، تەنها وا دەزانین مانگ و خۆر دەگیرێن.

واتە هەمیشە لەم دنیایەدا ئەو شتانە ڕوو دەدەن کە خواستی ئێمە نین، کەواتە دنیا جێگەی هاتنە دی ئاواتەکان نیە، هیچ کەسێکیش نیە هاتبێتە دنیاوەو دنیای بەجێ هێشتبێ و هەموو ئاواتەکانی هاتبێتە دی.

لە ڕۆژە ناخۆشەکانی ژیانتا سپڵە و بێ وەفا مەبە، بەرانبەر ڕۆژە خۆشەکان، لە ڕۆژە خۆشەکانیشتا لەخۆبایی مەبە و هەڵمەشاخێ، دور نیە ڕۆژگارە تاڵەکان دیسان بێنەوە. ڕۆژێك بۆ تۆیە، ڕۆژێك لەسەر تۆیە، واتا ڕۆژێك ئەرکت لە ئەستۆیەو ڕۆژێکیش پاداشت بۆ تۆیە.

بزانە ژیان تێکەڵەیەکە لە هەموو شتەکان، دەبێ هەموویت قەبوڵ بێ، ئینجا دەتوانی بە سەرکەوتوویی ژیان بگوزەرێنی.(١)

---

(١) ص٤٥ص٤٦/ الدهريوم لك و يم عليك/ الدهريومان ذا أمن و ذا خطر/

## الدهر يوم لك و يوم عليك

الـــدَّهْرُ يَوْمَـــانِ ذَا أَمْـــنٌ وَذَا خَطَـــرُ      وَالْعَـيْشُ عَيْشَـانِ ذَا صَـفْوٌ وَذَا كَـــدَرُ
أَمَـا تَـرَى الْبَحْـرَ تَعْلُـو فَوْقَـهُ جِيَـفٌ      وَتَسْـتَقِرُّ بِأَقْصَـى قَـاعِــــهِ الـــدُّرَرُ
وَ فِي السَّـــمَاءِ نُجُـــومٌ لا عِـــدَادَ لَهَـــا      وَلَـيْسَ يُكْسَـفُ إِلا الشَّـمْسُ وَالقَمَـرُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٥١):

### (ڕۆژێك بۆ تۆیەو ڕۆژێك لە تۆیە)

کـــات، دوو ڕۆژە: بـــێ مەترســـی، ترســـداریی
ژینـــیش دووانـــە: دڵشادیـــی، دەروون بێـــزاریـــی
دەریـــات دیـــوە کـــە ســـەرەوەی کـــەف و لاکـــە؟
کەچـــی بنـــی، پـــڕە لـــە گەنـــج و مـــرواری
ئـــاسمـــانیش پـــڕ، ئەستێرانـــی بێشـــومـــارە
کەچـــی تـــەنها، مـــانگ و خـــۆرن، لامـــان دەکەونـــە نادیـــاری

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٥٢)

بێ دەنگی و کەمدویی، یەکێکە لەو بەخشیشە گەورانەی کە دەست هەموو کەسێ ناکەوێ، چونکە سەرەتای هەموو فیتنە و ئاژاوەو گێچەڵ و بوختان و غەیبەتێك، هەموو تەشەرو درۆ و ناڕەزاییەك، هەموو نهێنی درکاندن و پەشیمانییەك لە دەروازەی زمانەوە دەردەپەڕێ، کە بێ دەنگیت مانای لە هەزاران ئاژاوە پارێزراویت، بەڵام پێویستە بزانیت بێ دەنگیش سنوری هەیە، بێ دەنگ بوون لە کاتی ناهەقی دا هەزار هێند خراپترە لە بێ دەنگی لە کاتی تردا.

شافیعی دەفەرموێت: وام بینی و بۆم دەرکەوت کە بازرگانی بێدەنگی (واتە کەمدویی و بێ دەنگی) باشترین کارو بازرگانی خێردار و قازانج بەخشە لەبەرئەوە ئەو پیشەو ڕەوشتەم هەڵبژارد، خۆ ئەگەر لەم جۆرە کار و بازرگانیەشمدا قازانج

نەکەم ئەوا دڵنیام کە مایەکەم دەست دەکەوێتەوەو هەرگیز زەرەر ناکەم، کەسانی مەرد و ژیر و دانایان بێ دەنگیان کردووە بە خووی خۆیان و بازرگانیان، هەمیشە بازرگانەکانی بێ دەنگی براوەن و لەسەرووی هەموو جۆرەکانی تری بازرگانیدان.

شافیعی مامەڵەو رەفتاری رۆژانەی مرۆڤ و نەریت و خووەکانی مرۆڤ بە بازرگانی ناو بردووە، چونکە لە کەسێکەوە دەگوازرێنەوە بۆ کەسێکی تر، هەروەکو کەرەسەی بازرگانی و دینارو دراو و دەستاو دەست دەکەن، بۆ نموونە کە دایك و باوك خوویەکی جوانیان تێدا بوو، ئەوا رەفتارو خووە لە منداڵەکانیشیاندا دەردەکەوێتەوە، وەکو ئەوە وایە کە دایك و باوکەکە فرۆشیار بووبن و مناڵەکانیشیان کڕیاری ئەو خووە.

زانستی کۆمەڵایەتی و دەروونزانی ئەم سەردەمەی خۆشمان هەمان راستی سەلماندووەو وەکو بارگەی کارەبایی باسی خووەکان دەکەن لە کۆمەڵگەی مرۆیی و خێزانەکاندا، کە لە یەکیانەوە دەگوازرێتەوە بۆ ئەوانی تریش[1].

## فضل السكوت

وَجَــدْتُ سُــكُوتِي مَتْجَــراً فَلَزِمْتُــهُ     إِذَا لَــمِ أَجِـدْ رِبْحـاً فَلَسْـتُ بِخَاسِـرِ

وَمَـا الصَّـمْتُ إِلاَّ فِي الرِّجَـالِ مُتَـاجِرٌ     وَتَـاجِرُهُ يَعْلُـو عَلَـى كُـلِّ تَـاجِرِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٥٢):

## (گەورەیی بێدەنگی)

بۆم دەرکەوت، کە بێدەنگین بازاڕێکی قازانجدارە

کە قازانجیشم لێی نەبێ، زیانێك ناکەم لەئەو کارە

بێ دەنگیی، لەلای کەسمەردان[2] بازرگانیەکی چاکە

هەر بازرگانی ئەویشە، لە سەرووی گشتیانا دیارە

---

(١) ص٤٦/فضل السكوت/ وجدت سكوتي متاجراً فلزمته/

(٢) کەسمەردان: ئەو کەسانەی کە مەرد و ژیر و دلێر و خاوەن کەسێتی بەرزن.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٥٣)

ئەگەر کاوبار بەدەست زەمانە بێ، ئەوا کەسێ نیە کە لە زەمانە ڕازی بێ، بۆیە پێشەوا شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا لەسەر زمانی ئەو کەسانە دەفەرموێت: من ڕازی نیم لە زەمانی خۆم، بەڵام ڕازیم بەو حوکمەی کە خودای گەورە لە چارەی نوسیوم و لەڕێی قەدەرەوە دێتە ڕێم، جا ئەگەر ڕۆژگار ناپاکی کرد بێ لە گەیاندنی ئەو حوکمەی پێی دراوە، کە ناشتوانێ وابکات، ئەوا من ڕازیم، چونکە دڵنیام ناتوانێ ناپاکی بکات بەرانبەر فرمانی خودایی، گەرچی لە بنەڕەتدا تورەم، بەڵام تورە بوون لە بەرانبەر قەدەر سوودی چیە؟[1]

### الرضا بالقدر

وَمَا كُنْتُ رَاضٍ مِنْ زَمَانِي بِمَا تَرَى وَلَكِنَّنِي رَاضٍ بِمَا حَكَمَ الدَّهْرُ

فَإِنْ كَانَتِ الأَيَّامُ خَانَتْ عُهُودَنَا فَإِنِّي بِهَا رَاضٍ وَلَكِنَّهَا قَهْرُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٥٣):

### (ڕازی بوون بە قەدەر)

وەك دەبینی، ڕازی نیم، لەم چەرخەی خۆمان

بەڵام ڕازیم بەوەی (کات) چۆن حوکم دەکات

ئەگەر ڕۆژگار ناپاکی کرد لەگەڵ سەردەمی ئێستامان

ئەوا ڕازیم، گەرچی واشبێ، ستەم دەکات

---

(١) ص٤٦/ الرضا بالقدر/ وما كنت راض من زماني بما ترى/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٥٤)

کاتێك دوو کەس ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوە، هەندێ کەس لەجیاتی ئەوەی ڕۆڵی ئاشتکردنەوە ببینن، کەچی ئاگر خۆش دەکەن، پێشەوا شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا دیمەنی ئەوەمان بۆ باس دەکات، کە کەسێك هاتووەتە لای و پێی گوتووە، کە فلان کەس خراپەی بەرانبەر کردی، مرۆڤی مەرد و ژیریش نابێ ئەو شکان و سەرشۆڕیە قەبوڵ بکات، شافیعی خ.ل دەفەرموێت: منیش بەو کەسەم گوت: ئاخر ئەو زەلامەی کە خراپەی لەگەڵ کردم دوایی هات بۆ لام پەشیمانی دەربڕی و پۆزشتی هێنایەوە و داوای گەردن ئازادی و لێبوردنی لێ کردم، لای ئێمەش باج و غەرامەی هەڵە، بریتیە لە داوای لێبوردن.[1]

### دية الذنب الاعتذار

قِيلَ لِي قَدْ أَسَى عَلَيْكَ فُلانٌ　　وَمُقَامُ الفَتَى عَلَى الذُّلِّ عَارُ

قُلْتُ قَدْ جَاءَنِي وَأَحْدَثَ عُذْراً　　دِيَةُ الذَّنْبِ عِنْدَنَا الاعْتِذارُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٥٤):

### (باج)ی هەڵە پۆزشتە

گوتیان: فلان، خراپەی دژت هێنایە کایەوە

شەرمەزارییە بۆ جوامێر، کە سەرکزی قەبوڵ بکا

گوتم: ئاخر، هاتە لام و پۆزشی بۆم هێنایەوە

(باج)ی هەڵە، وایە لامان، کە وا داوای لێبوردن کا

---

(١) ص٤٦/ دية الذنب الأعتذار/ قيل لي قدأسى، عليك فلان/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٥٥)

شافیعی زۆری حەزی لە گەڕان بووە، بەتایبەتی بە مەبەستی فێربوونی زانیاری و بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام و فەتوای هاوچەرخ، ویستویەتی بچێت بۆ وڵاتی (میسر)، بەڵام بەر لەوەی لە حیجازەوە بەرەو (میصر) بەڕێ بکەوێ ئەم هۆنراوەیەی فەرموو، لە گێڕانەوەیەکی تردا کە (أبی بکر)ی کچەزای شافیعی دەگێڕێتەوە، ئەم هۆنراوەیە کاتێك شافیعی فەرمووی کە لە (مەکە)وە کەوتە ڕێ بەرەو (میصر).

پاشان دەڵێت: کەوتە ڕێ، چووەتە ناو چەندین مزگەوتەوە، تەنها چەپکە کتێبێکی (یان کۆڵە پشت)ێکی پێ بوو، خەڵکی دەهاتنە ناو ئەو مزگەوتانەو دەچوونە دەرەوە، کەس ئاوڕێکی لە شافیعی نەدەدایەوە، چونکە نەیاندەناسی، ئەڵێت: ئا لێرەدا شافیعی ئەو هۆنراوەیەی وت (یان وتەوە) کە دەفەرموێت: بەرگێکم لەبەردایە، ئەگەر هەمووی بفرۆشم بە فلسێك[1]، ئەوا فلسەکە زۆر زیاترە لە نرخی بەرگەکانم[2].

### سفره الى مصر

لَقَدْ أَصْبَحَتْ نَفْسِي تَتُوقُ إلى مِصْرِ وَمِنْ دُونِهَا أَرْضُ الْمَهَامَةِ وَالقَفْرِ

فَوَاللهِ لا أَدْرِي أَلِلْفَوْزِ وَالغِنَى أُسَاقُ إِلَيْهَا أَمْ أُسَاقُ إلى القَبْرِ؟

---

(١) ص٤٧/ سفره الى مصر/ لقد اصبحت نفسي تتوق الى مصر/

(٢) واتە هۆنراوەی ژمارە (٤٨)ی ئەم دیوانە، کە لە لاپەڕەکانی پێشووتردایە و لە سەفەرەکەیدا بۆ شاری سامەڕای عێراق وتویەتی.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٥٥):

### (سەردانەکەی بۆ میصر)

دەروونم، تامەزرۆی میسرە، لەوێشەوە بۆ خـــاکێکـــی چـــەقەن و شۆر[١]

دە بەخوا، نازانم بەرەو سەرکەوتن و دەوڵەمەندی دەچم، یـــان بـەرەو گۆڕ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٥٦)

داسەکنێ و ئارام بگرە، لەگەڵ کاروانی زەمانەدا برۆ، لەم دنیا پـان و بەرینـەدا وەك چۆن ڕاهیب لە (دێر)ەکەی خۆیدایە، تۆش وابە، دەست لـە دنیـاو خەڵکەکـەی بشۆرە، بەتەما مەبە، خەڵکی لە خۆت دڵسۆزتر بێـت بـۆ تـۆ، وریابـە، لـە گرێدانی پەیوەندیەکانت لەگەڵ ئەو خەڵکە دنیاییانەدا، ئەگەر لێزان بـی لـەوەدا ئـەوا خێـر و بێرت دەست دەکەوێ، خێر و بێری دنیاو قیامەت، من زۆر گەرشـام و ورد بوومـەوە هاوڕێیەکی گونجاو و شیاوم نەدۆزیەوە، کە بیکەمە هاوڕێم لە سەردەمی خۆمدا یـان لـە سـەردەمێکی تـردا، لەبەرئـەوە وازم لـە خراپترینـی ئـەو کەسانە هێنـا، چونکە زۆرترینی شەڕیان لەباردایە، وە بـەرزترین کەسیانیشـم واز لێ هێنـا بـەهۆی کـەمیی خێر و بێرەکەیانەوە.

کەواتە هاوڕێ، ئەگەر خراپە یان چاکە، هێشتا بـایی ئـەوە نابـێ کـە لـە خـۆت زیاتر متمانەت پێی هەبێ و پشتی پێ ببەستی.[٢]

### نادرة الخالص من الأصحاب

| | |
|---|---|
| كُــنْ سَــاكِناً فِي ذَا الزَّمَــانِ بَسَــيْرِهِ | وَعَــنِ الْــوَرَى كُــنْ رَاهِبــاً فِي دَيْــرِهِ |
| وَاغْسِــلْ يَــدَيْكَ مِــنَ الزَّمَــانِ وَأَهْلِــهِ | وَاحْــذِرْ مَــوَدَّتَهُم تَنَــلْ مَــنْ خَيْــرِهِ |
| إِنِّــي اطَّلَعْــتُ فَلَــمْ أَجِــدْ لِــي صَــاحِباً | أَصْــــحبهُ فِي الـــدَّهْرِ وَلاَ فِي غَيْــــرِهِ |
| فَتَرَكْـــتُ أَسْــــفَلَهُمْ لَكَثْــــرَةِ شَــــرِّهِ | وَتَرَكْــــتُ أَعْلاهُـــمْ لِقِلَّـــةِ خَيْــــرِهِ |

---

(١) چەقەن و شۆر: زەوی بیابان و ڕەقەن و لمین.

(٢) ص٤٨/ نادرة الخالص من الأصحاب

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٥٦):

### (هاوڕێی دەگمەن)

بەبێ دەنگی دابنیشە، لە کاروانی زەمانەدا
وەکو (ڕاهیب) لە (دێر)ی خۆیا وا ئەکا
دەست بشۆرە، لەم دنیایەو خەڵکەکەشی
سڵ لە سۆزی ئەوان بکە، بێگومان خێر ڕووت تێدەکا
من بە وردی چاوم گێڕا، بەڵام هاوڕێی وام نەبینی
شیاوی ئەوە بێ بەباشی هاوڕێم بێ، هاودەمیم بکا
کامیان نزم بوو لەلای من، ئەوا فەرامۆشم کرد من
تاکو (شەڕی زۆر)ی ئەویش ڕووم تێ نەکا
کامەشیان کەوا بەرز بوو، دیسانیش فەرامۆشم کرد
تا (خێر و بێرەکەمەکەی)، نەیات و سەرقاڵم نەکا

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٥٧)

(حسین)ی کوڕی (محمد)ی (زەعفەرانی) دەڵێت: پرسیار کرا لە شافیعی خ.ل دەربارەی بابەتێك، لە وەڵامدا ئەم هۆنراوەیەی فەرموو، کە تیایدا شانازی بە توانای خۆیەوە دەکات، یاخود هانی پرسیارکەرەکە دەدات تاکو متمانەی بە خۆی بێ و هەوڵ بدات کێشەکانی خۆی بە دەستی خۆی چارەسەر بکات، دەفەرموێت: هەر جۆرە کێشەیەك ڕووم تێ بکات ئەوا زرنگ و زمان گەرمم بۆ چارەسەرکردنی، ئەوەتا زمانم وەکو زارەجووی[1] وشتری (ئەرەحیبان)[2] وایە، دەڵێی شمشێری

---

(١) زارەجوو: الشقشقە: ئەو پارچە ئاڵفتە کوتراو و جوراوەیە کە لە ڕیقنە دەچێ و لە دەمی وشترەوە دێتە دەرەوە، کاتێك تووڕە بکرێ.

(٢) ئەڕەحیب: هۆز و تیرەیەکی وشترەوانی عەرەبن.

یەمانیە، عەقڵی خۆم بەکاردێنم، سوود لە ڕاوێژ و عەقڵی خەڵکیش دەکەم، بەڵام هەرگیز بڕیارەکانی خۆم نادەمە دەست کەسانی تر، هێندە ڕاڕاو ترسنۆك نابم لە وەڵامدانەوەدا، ئەوەتا دوو پارچە گۆشتی ژیر و گویا و قسەکەر لە لەشی خۆمدا هەیە، یەکیان دڵمەو ئەوی تریان زمانمە، ئەگەر زانایانەو ژیرانە بەکاریان بهێنم ئەوا خێر و بێرم بۆ دەهێنن و لە شەڕو ناڕەحەتی دەربازم دەکەن، هەروەکو چۆن پێچەوانەکەیشی ڕاستەو زۆربەی خەڵکی بەهۆی دڵ و زمانیانەوە تووشی گرفت و کێشەو ناڕەحەتی دەبن.

هەر ڕۆژەی دوای کەسێك ناکەوم، ئازادی بیرم حەبس ناکەم، بەدوای پرسیار و وەڵامێکدا ناگەڕێم کە کارم بەو کارە نەبێ، یاخود وەڵامەکەی بزانم، سوپاس بۆ خوا من ژیرم و خاوەنی دڵ و زمانی خۆمم، ئیتر بۆچی بە کەمتر لە دڵ و زمانی خەڵکی سەیریان بکەم.[1]

## عزة النفس

إِذَا الْمُشْـــكِلاتُ تَصَـــدَّيْنَ لـــي ... كَشَــــفْتُ حَقَائِقَهَـــا لِلنَّظَـــرْ

لِسَـــانٌ كَشَقْشَـــقَةِ الأَرْحَبِيـــ ... ـي وَكالْحُسَـــامِ اليَمَـــانِي الـــذَّكَرْ

وَلَسْـــتُ بِإِمَّعَـــةٍ فِي الرِّجَـــا ... لِ أُسَـــائِلُ هـــذَا وَذَا مَـــا الْخَبَـــرْ؟

وَلَكِنَّنِـــي مِـــدْرَهُ الأَصْغَرَيْـــ ... ـنِ جَـــلاَّبُ خَيْـــرٍ وَ فَـــرَّاجُ شَـــرّْ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٥٧):

**(دەروونبەرزیی)**

کە کێشەکان، ڕووم تێدەکەن، چارە دۆزیی لام ئاسانە

زمانم وەکو زارەجووی وشتری ئەڕەحیبانە

هێندە تیژ و بڕندەیە، هاوتای شمشێری یەمانی

---

(١) ص٤٨/ عزة النفس/ إذا المشكلات تصدَّينَ لي/

ساویلکە نیم، هەر جارەی لەگەڵ کەسێکا، بگۆڕێم بەپێی زەمانە
پرسیار لەم و لەویش ناکەم: چیە هەواڵ؟ چیە وەڵام؟
بەڵکو دوو پارچە ئەندامی سەرۆك خێڵم، یەك دڵ، ئەوی تر زمانە
خێر دەهێنن، لە شەڕیش دەربازم دەکەن، ئازایانە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٥٨)

هاوڕێ، دەبێ وەك برابێ، وا نەبێ، با هەر نەبێ، هاوڕێی وا هەیە لە کاتی تەنگانەو لێقەوماندا نایات بە دەمتەوە، لە دوژمنەکەتەوە نزیکترە تاکو لە تۆ، لە بەراورد و پێوانەدا، هاوڕێ نایاب و چاك و بگرە براش لە هەموو چاخ و کاتێك هەر بە باشی بۆ تۆ بەردەوام نابێ، مەگەر بۆ دڵنەوایی و سەرەخۆشی بێنە لات، دەفەرموێت: تەمەنێکی باشم لەگەڵ چاخ و کاتدا بردەسەر بە مەبەستی گەڕام بەدوای دۆزینەوەی هاوڕێیەکدا کە وەکو برا جێی متمانە بێ، نەبوو، یان هەبوو، بەڵام بۆ من نەبوو، نەمدۆزیەوە، دەڵێی خەڵکی ئەم وڵاتە هەموویان لە من تۆراون و من نەناس و ناۆمم لەلایان، کەس هۆگری و هاودەمیم ناکات، چونکە منیش بە شایستەی هاوڕێیان نازانم، لە بنەڕەتدا ئەوە هۆیەکەیەتی کە ئەو کەسانە مەرجەکانی برایەتی و هاوڕێیەتی ڕاستەقینەیان تێدا نیە.(١)

### الأصدقاء عند الشدائد

صَدِيقٌ لَيْسَ يَنْفَعُ يَوْمَ بُؤْسِ     قَرِيبٌ مِنْ عَدُوٍّ في الْقِيَاسِ
وَمَا يَبْقَى الصَّدِيقُ بِكُلِّ عَصْرِ     وَلاَ الإِخْوَانُ إلاَّ لِلتَّأسِي
عَمَرْتُ الدَّهْرَ مُلْتَمِسًا بِجُهْدِي     أخَاثِقَةِ فَأَلْهَانِي التماسِي
تَنَكَّرَتِ البِلاَدُ وَمَنْ عَلَيْهَا     كَأَنَّ أُنَاسَهَا لَيْسُوا بِنَاسِي

---

(١) ص٥٠/ الأصدقاء الشدائد/ صديق ليس ينفع يوم بؤس/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٥٨):

### (هاوڕێیانی کاتی تەنگانە)

هاوڕێ هەیە، سوودی نیە، لە کاتی تەنگانەدا
لە دوژمن نزیکترێکە، تا لە دۆست، لە پێوانەدا
هاوڕێ لە هەموو دەمێکا، لەو بارەدا، بۆت نامێنێ
بگرە براش، مەگەر، سەرەخۆشی بنوێنێ
رامبورد[١]، بە کوێرەوەری[٢]و دەستی نزام لە ئاسمانە
کەچی هەر دەستم نەکەوت، هاوڕێی براو جێ متمانە
ئەم وڵاتەو دانیشتوانی، هەموویانم لێ تۆراوە
دەڵێی ئەو خەڵکە نامناسن، وەکو نامۆم[٣] لێ قەوماوە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٥٩)

شافیعی خ.ل بە کوڵ لە خودا دەپاڕێتەوەو دەفەرموێ: خودایە بەسۆز و میهرەبانی خۆت دڵم بکەرە هۆگری خۆت، لە کاتی نهێنی و بەربەیان و ئێوارانمدا، لە هەموو کات و شوێن و بارێکمدا، کە دەخەوم، کە وەنەوز دەمگرێ، با هەمیشە دەروونم پڕ بێ لە یادی تۆ، هەموو هەناسەدانێکم ناوهێنانی تۆی لەگەڵدا بێ، دڵی منت منەتبار کردووە بەوەی کە خۆت پێناساندووم بەوەی کە تۆ خوایەکی گەورەو پیرۆزی، کەچی لە جیاتی ئەوەی ئینجا من خۆم بۆ پەرستنی تۆو گوێڕایەڵی فرمانەکانت تەرخان بکەم، کەچی دنیایەك سەرپێچی و بێ فەرمانی و تاوانم کردووە، ناشتوانم ئەو تاوانانەم پەردە پۆش بکەم، چونکە تۆ ئاگات لە هەموویان هەبووەو پێیان دەزانی، کەچی هێشتا ڕەحمت پێ کردووم و نەتشکاندووم و

---

(١) رامبورد: بردمە سەر، تەمەنم ڕابوارد، تەمەنم بەڕێ کرد.

(٢) کوێرەوەری: ژیانی پڕ لە تەنگژەو ماندویی و هەژاریوو دەردەسەری.

(٣) نامۆ: غەریب.

تاوانەکانمت پەردەپۆش کردووم لەناو خەڵکیدا، ئێستا تەنها من و تۆ دەزانین کە من چەندە تاوانبارو شەرمەزارم، من خراپەی زۆرم بەرانبەر بە تۆ کرد، کەچی تۆ خراپەت بەرانبەر من نەکردەوە لە کاتێکا جڵەوی من لە بەردەستی تۆیەو تۆ دەسەڵاتداریت و منیش لاواز و بێ دەسەڵاتم، خوایە منەتی ئەوەم لەسەر بکەیت کە گۆشت کردووم تاکو زیکرو یادی تۆ بکەم وەکو کەسە چاك و خواناسەکان، خوایە دینەکەم بە خراپەکانم دامەپۆشە، لە درێژایی بوون و ژیان و تەمەنی هەردوو دنیامدا تۆ لەگەڵمدابە، پشتیوانم بە، فریام بکەوە، بۆ ماوەی چاو تروکانێکیش مەمدەرە دەست خۆم، نەفسم بە خۆم مەسپێرە، خۆت نەفسم ئاراستە بکە بەرەو خواپەرستیەکی پاك و دڵێکی بێ گەرد، بمپارێزە لەو ناڕەحەتی و سەختیانەی کە لە سورەتی (عبس) دا باست کردون.[1]

## استغفار و توبة

قَلْبِـــي بِرَحْمَتِـــكَ اللّهُـــمَ ذُو أُنُـــسِ ... فِي السِّــرِّ وَالْجَهْـرِ وَالإِصْـبَاحِ وَالغَلَـسِ

وَمَـا تَقَلَّبْـتُ مِـنْ نَـوْمِي وَفِي سِـنَتِي ... إِلاَّ وَذُكْــرُكَ بَيْــنَ النَّفْــسِ وَالـنَّفَسِ

لَقَـدْ مَنَنْـتَ عَلَـى قَلْبِـي بِمَعْرِفَـةٍ ... بِأَنَّـــكَ اللهُ ذُو الآلاءِ وَالْـــقُـــدُسِ

وَقَـدْ أَتَيْـتُ ذُنُوبـاً أَنْـتَ تَعْلَمُهَـا ... وَلَمْ تَكُنْ فَاضِحِي فِيهَا بِفِعْـلِ مَــسِي

فَـامْنُنْ عَلَـيَّ بِـذِكْرِ الصَّـالِحِينَ وَلا ... تَجْعَلْ عَلَـيَّ إِذَا فِي الـدِّينِ مِـنْ لَبَـسِ

وَكُـنْ مَعِـي طُـولَ دُنْيَـاي وَآخِرَتِـي ... وَيَـوْمَ حَشْـرِي بِمـا أَنْزَلْـتَ فِي عَـبَسِ

(١) ص٥٠/إستغفار و تَوبة/ قلبي برحمتك اللهم ذو أُنس/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٥٩):

### (پەشیمانبوونەوە)

خـــــوایـــــە، ئـــــەوە دڵـــــی منــە، مـۆگری عیشـقی تـۆی تێـدا
لە پەنهان و لە دیـــــار و لـــــە بـــــەیـــــان و ئێـــــوارانـــــی
لەشەوا کـــــە تـــــل ئـــــەدەم و لـــــە خـــــەوتن و وەنەوزمـدا
دڵـی منــە، کـە یـادی تـۆ، وا لـەنێوان هەناسـەو ترپـەی لێـدانی
منەتـــــــت بـــــەســـــەر دڵمـــایە، خـۆت پێناسـاند لـە بەرزیـدا
بـە گوناهـەوە هاتمـە لات، کـــــە بـــــۆ خـــۆشت پێـت دەزانـیم
بـەڵام هـیچ ڕیسـوات نـەکردم، تـۆ لەبەرچـــــاوی خـــــەڵـــکیدا
بـەر نـزای پیـاو چـاکانم خـەی، لـە پـای شـکۆو میهرەبانـــــــی
چـەوتی تـاوانم لابـەرە، مەیکـە پۆشـاك لـــــــە بـــــەرمـــــدا
پشـتیوان و پـەنای مـن بـە، لـە دوو دنیـاو هـــــــەردوو ژیـانی
لـە پەسـڵانیش بمپـارێزە لـەوەی لـە ســـــورەی (عَـــبَس)دا

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٦٠)

ئەی ئەو کەسەی کە ئامۆژگاری و ڕێنمایی خەڵکی دەکەیت و بەر لەوەش ئەوە دەکەیت کە خۆت بە خەڵکی دەڵێی، لە کردەوەی چاکە، ئەی ئەو کەسەی تەمـەنت بەپێی هەناسەکانت لە سەرت حیسابە، لـە ئێسـتاوە، لـە تەمـەنی گەنجیتـەوە دڵ و دەروون و داوێنت بپـارێزە لـەو شـتانەی کـە لـە پیریـدا پیسـت دەکـات، دڵنیابـە کـە ڕەنگی خاوێنی سپی کەمترین چڵك و پیسی پێوە دیارە، تـۆش ئـەو پـاك و سـپیەیە بە کە کەمترین ڕەشی پێتەوە دیار بێ و زوو فریای خۆت بکەویت، وەك ئـەو کەسـە مەبە کە بە دەست بەرگ و جل بۆ خەڵکی دەشوات، بەڵام بـەرگی خـۆی لـە چـڵك و پیسی دا ون بووە.

ئەی خوێنەر، ئەی فلان، داخوازی ئەوەی کە ڕزگارت بێ لە کارو کردەوەی بەد، کەچی ڕێگەی ڕزگاریەکە ناگریتە بەر، دیارە هەر شتێ هەنگاوی بۆ نەنێی بەرەو ڕووت نایات، خۆشت دەزانی کە بەلەم و کەشتی و پاپۆڕ لە وشکانییدا ناڕۆن.

زۆریش دڵ بە خۆشیەکانی دنیا، خۆش مەکە، بیهێنە بەرچاوی خۆت چەندە دڵخۆش بی بە سوار بوونی ئەسپی ڕەخش و وڵاخی نایاب و (ئوتومبیلی مۆدیل بەرزی ئەم سەردەمە) لەخۆت بایی نەبی، چونکە کاتێ سواری تابووت دەکرێیت هەموو سواربوونەکەی ترت لەیاد دەچێتەوە.

ڕۆژی پەسلان، نە ماڵ و سامان و نە منداڵ بە کەڵکت نایات، شەوی یەکەمی ناو گۆڕ و گۆڕەوشارەکەت شەوی بوك و زاواییت لەبیر دەباتەوە، مانگی هەنگوینیت لەیاد نامێنێ.

پێویستە لە خۆشیەکاندا ناخۆشی و تاڵیەکانیشت لەبیر بێ.

ئامۆژگاری خەڵکی چی دەکەیت، لە کاتێکدا خۆت جێبەجێی ناکەیت؟ پێویستە بەر لە خەڵکی خۆت ئامۆژگاری خۆت و دەروونی سەرکەشی خۆت بکەیت. ببە بە فریاگوزار و مامۆستای خۆت.(١)

## واعظ الناس

يَـا وَاعِـظَ النَّـاسِ عَمَّـا أنْـتَ فَاعِلُـهُ ... يَـا مَـنْ يُعَـدُّ عَلَيْـهِ الْعُمْـرُ بِـالنَّفْسِ

احْفَـظْ لِشَـيْبِكَ مِـنْ عَيْـبٍ يُدَنِّسُـهُ ... إنَّ الْبَيَـاضَ قَلِيـلُ الْحَمْـلِ لِلـدَّنَسِ

كَحَامِـلٍ لِثِيَـابِ النَّـاسِ يَغْسِـلُهَا ... وَثَوْبُـهُ غَـارِقٌ فِي الـرِّجْسِ وَالـنَّجَسِ

تَبْغِـي النَّجَـاةَ وَلَـمْ تَسْـلُكْ طَرِيْقَتَهَـا ... إنَّ السَّـفِينَةَ لاَ تَجْـرِي عَلَـى اليَـبَسِ

رُكُوبُكَ الـنَّعْشَ يُنْسِـيكَ الرُّكُـوبَ عَلَـى ... مَاكُنْـتَ تَرْكَـبُ مِـنْ بَغْـلٍ وَمِـنْ فَـرَسِ

يَـوْمَ الْقِيامَـةِ لا مَـالٌ وَلا وَلَـدٌ ... وَضُـمَّةُ الْقَبْـرِ تُنْسِـي لَيْلَـةَ العُـرْسِ

(١) ص٥١/ واعظ الناس/ يا واعظ الناس عمّا أنت فاعله/

**دەقی هۆنراوەی ژمارە (٦٠):**

**(ئامۆژگار)**

ئـــەی ئـامــــــۆژگار، ڕێ نیشـــــــاندەر، بـــۆ ئـــەو خەڵــــكەی
ئـــەوەی كـــە بـــــەوانی دەڵێـــــــی، خــــــۆشت ئـــەیكــــــەی
ئـەی ئــەو كەســەی كـە تەمـەنت، بـەپێی هەناسـەت پێـــوراوە
لــە شــەخەڵ خــاوێنی بكـە، ئـەو مـووە سـپیانەی لات مـــاوە
سپـــــی، ئـــــــەو ڕەنگــە پاكەیــە، كـەمترین پیســـی دەردەخــا
مەبـە، بـە ئـەو بـەرگ شـۆرەی بـۆ خـەڵكی دەشـواو هەڵــدەخا
بــەڵام كراســـــی بــەری خــۆی، لــە چـڵكا بۆتــە دوو ســێ بــــەر
ڕێگـــای ڕزگاریشـــت دەوێ و ئـــــــەو ڕێـــگایـــەش ناگریەبـــەر
خـــۆ، كەشـــتی لــــە وشـــكانییدا، ڕەوت و هاتنـــــی نــاكـــــرێ
كەسێك چەند سـواری ئەسپ بێ كـە سـواری تـابوت ئەكـــــرێ
چــێژی هـــەمووی لـــەبیر دەكــا، ئــەوجا لــە ڕۆژی پــەسڵانـــــی
بۆتــە ڕەجــاڵ، بــێ مــاڵ، منــداڵ، گۆڕەوشــاری گـــۆڕستانـــــی
هـــــەمووی لـــــەبیر دەباتـــــەوە، مانـــــەوەی گــــۆڕی تەنیــایــــــی
شـــــەوی هاوســــــەری و بـــــوكێنی، ڕۆژی زەماوەنـــد و شـایــــــی

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٦١)

زانســـت وەك نـــەمانی هـــەموو شـــانازیەكانی مرۆڤـــە، كەواتـــە شـــانازی بـــە زانستەكەتەوە بكە، وریابە ئەو شانازیەت لەدەست نەچێ، واتە هەوڵی زانست بدە، دڵنیاش بـە زانسـت دەسـت كەسێك ناكـەوێت كـە هەمیشـە بیری لـەلای گـەدەی و خواردنی جلوبەرگیەتی، بەڵكو زانست دەست كەسێك دەكەوێ كە لە هـەردوو باری تێری و برسێتی دا لە خەمی فێربوونی خۆیدا بێ، بەشە بەركەوتی بەختی خۆت لـە

زانستدا وەربگرە، بەهۆی ئەوەشەوە لە شادمانی نزیك بەرەوە، بە دوری مەزانە كە بە هۆی زانستەكەوە تۆ ببیتە سەرۆك و جێ شانازی ئەو كۆڕەی كە تیایدایت.(١)

## مفخرة الانسان العلم

الْعِلْــمُ مَغْــرَسُ كُــلَّ فَخْــرٍ فَــافْتَخِرْ وَاحْــذَرْ يَفُوتَــكَ فَخْــرُ ذَاكَ الْمَغْــرَسِ

وَاعْلَــمْ بِــأَنَّ العِلْــمَ لَــيْسَ يَنَالُــهُ مَنْ هَمُّهُ فــي مَطْعَـــمٍ أو مَلْبَـــسِ

إلاَّ أُخـــو الْعِلْــمِ الَّــذِي يُعْنَــى بِــهِ فِي حَالَتَيْــهِ عَــارِيــا أو مُـــكْتَسِي

فَاجْعَــلْ لِنَفْسِــكَ مِنْــهُ حَظّــا وَافِــراً وَاهْجُــرْ لَــهُ طِيــبَ الرُّقَــادِ وَعَـــبسِ

فَلَعَــلَّ يَوْمــاً إنْ حَضَــرْتَ بِمَجْلِــسٍ كُنْــتَ الــرَّئِيسَ وَفَخْــرَ ذَاكَ المَجْلِــسِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٦١):

## (زانست مایەی شانازی مرۆڤە)

زانســـت، ڕوێنـــەری گشـــت شـــانازیە، دەی شـــانـــــازی كـــــە
لــەو ڕواندنــەی وا لەكیســت چــووە، ئێســتا وریابــە، سـڵی لێ بكـە
زانســـــت هـــــیچ كاتــــــێ، كـەســـــێ پێـــــی نــاگـــــا
كـــــە خـواستـــــــی جـــــل و خـــــــۆراك و بــەرگـــــــە
مەگـــــەر ئـــــــەو كەســــــەی لــــــە هـــــەردوو بـــــارا
كـاتـــــــێ پـۆشتەیـــــــــەو كاتـــــــێ هـــــــــەژارە
كـۆشـــــــــــش دەكـــــــــــات و زانستـــــــــــی دەوێ
هـــــەوڵـــــــی بـــــــۆ دەدا تـــــــا دەستـــــــی كـــــەوێ
بەشـــــە بەركەوتـــــــی خـــۆتـــــــی لێ فێـــــــر بـــــــە
خـــــــۆی بـــــــۆ تـەرخانكـــــــە و لـــــــە چـــــاكەی تێربـــــــە

(١) ص٥٣/ مفخرة الأنسان العلم

رەنگـــــە لـــــە كـــــۆڕێك كـــــە تـــــۆی تێـــــدا بـــــی
ســـــــەركردە و جێـــگـــــــەی شانـــازییـــــــان بـــــی

## دەروازەی هۆنـراوەی ژمارە (٦٢)

لە هـۆنراوەی ژمـارە (٣٥) لـەم دیوانـەدا، پێشـەوا شـافیعی بەرپـەرچـی ئـەوانـە دەداتەوە كە تۆمەتباریان كرد بوو بە (ڕافیزی)، لـەم هۆنراوەیەشـدا كـە هـۆنراوەی ژمارە (٦٣)یە، بە تـەواوەتی بیروڕای خۆی خستووەتە ڕوو، كە باوەڕهێنـانی بەنـدە بە چەند بنەمایەكی عەقیدەی ئیسلامی لەوانەش باوەڕهێنان بە تاك و تەنهایی خودا و زاتی (الله)، هەروەها باوەڕ هێنان بە ڕۆژی دوایی و زیندوبوونەوە، لە دواتردا دێتە سەر باوەڕهێنـانی بـە چـوار جێنشـینەكانی پێغەمبـەر د.خ، كـە هـەموویانی خـۆش دەوێ و جیاوازی ناكات لەنێوانیاندا، بەم هۆنراوەیـەش ئەوانـەی دەمكـوت كـرد كـە بوختانی ڕافیزیەتیان بۆ هەڵبەست بوو، هـەروەها لـە هـۆنراوەی ژمـارە (٦٤) یشـدا دیسان جەخت لەوە دەكاتەوە.[1]

### الخلفاء الراشدون

شَـــهِدْتُ بِـــأنَّ اللهَ لا رَبَّ غَيْـــرَهُ     وَأشْـهَدُ أنَّ الْبَعْـــثَ حَـقٌّ وَأخْلَـصُ
وَأنَّ عُـــرَى الإيمَـــانِ قَـــوْلٌ مُبَـــيَّنٌ     وَفِعْلٌ زَكِـــيٌّ قَـــدْ يَزِيدُ وَيَـنْقُصُ
وَأنَّ أبَـــا بَكْـــرٍ خَلِيفَـــةُ رَبِّـــهِ     وَكَانَ أبُو حَفْصٍ عَلَى الخَيْـرِ يَحْرِصُ
وَأُشْـــهِدُ رَبِّـــي أنَّ عُثْمَـــانَ فَاضِـــلٌ     وَأنَّ عَلِيَّـا فَضْلُـــــهُ مُتَخَـــصِّصُ
أئِمَّـــةُ قَـــوْمٍ يُهْتَـــدَى بِهُـــدَاهُمُ     لَحَـى اللهُ مَـنْ إيَّاهُـــمُ يَتَنَقَّـــصُ

---

(١) ص٥٤/ للخلفاء الراشدون/ شهدت بان الله لا ربّ غيره/

دەقی هۆنراوەی ژمارە (٦٢):

## (جێنشینە ڕاشدیەکان)

بـــــاوەڕم هێنـــاوە، کـەوا، بێجــــگە لـەو زاتــی (الله)یـــە
هــیچ پــەروەردگارێك نیــە، بــۆ ئــــەم گــەردون و دونیـــایــە
دیســان بــاوەڕم وەهـــــایە کـــــە زینـدوو بوونــــەوە ڕاستـــە
وە باوەڕیـــــش وتــەیـەکـــە، ئاشـــکرا لـــە زمانـــایـــە
بـەڵام کـردەی ئـەو بـاوەڕە، دەکـرێ کــــەم و زیـادیش بـکا
دوبـارە بـــاوەڕم وایـە، (أبـوبکر) خەلیفـــەیەکی خـــودایـــە
(بـابی حـەفس) کـــــە (عمـر)ە، سـور بـوو لەسـەر چاکەکاریـــی
شـایەتی لای خـوا بـــۆ دەدەم (عثمـان) بـەرزەو خـاوەن پایــە
گــەورەیی (علــی) تایبەتــــــە، لــە زانسـت و خـــەلافـەتـــا
ئـەمان پێشـەوای گـەلێکن، ڕێـی هیدایەتـیـــــان لـــەلایـــە
ئەمانــەم هــەموو خــۆش دەوێــن، جێنشینـــی پێغەمبـــــــەرن
خودایــە بگــرە ئــەو کەسـەی دڵــی، ڕقــی دژی ئەمانــەی تێدایــە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٦٣)

شـافیعی خ.ل لـەم هۆنراوەیـەدا، دیمـەنی حـەج کـردن و شـەپۆلی جموجـوڵی حاجیان و چوون بۆ مینا نیشان دەدا، لێرەدا بانگی سوارچاکی مەدینە دەکات، کە مەبەستی لە پێغەمبەرە د.خ، تاکو گیـانی شـیرینی ئامـادەی ئـەو مەراسـیمی حـەج کردنە بێ و بانگ بفەرموێت، واتە لە خۆشیانا بانگی سەرکەوتنی ئیسلام بفەرموێت، ئینجا دڵی پڕ دەبێ لـە تاسـەی خۆشەویسـتی بۆ پێغەمبـەر د.خ هـەروەها بـۆ ئـالی پێغەمبەر و سەر لەنوێ جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەگەر خۆشەویستی ئەو زاتە لای

هەندێ کەس ڕافیزی بێ، ئەوا ئەمیش ئەو ڕافزیەتەی قەبوڵە، پاشان لەسەر ئەم باوەڕەیشی مرۆڤ و پەری دەکاتە شایەت.[1]

## حبه لآل البيت

يَا رَاكِباً قِفْ بِالْمُحَصَّبِ مِنْ مِنىً وَاهْتِفْ بِقَاعِدِ خَيْفِهَا وَالنَّاهِضِ

سَحَراً إِذَا فَاضَ الْحَجِيجُ إِلَى مِنىً فَيْضاً كَمُلْتَطِمِ الفُرَاتِ الفَائِضِ

إِنْ كَانَ رَفْضاً حُبُّ آلِ مُحَمَّدٍ فَلْيَشْهَدِ الثَّقَلانِ أَنِّي رَافِضِي

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٦٣):

### (خۆشەویستی بۆ ئالی بەیت)

دەی ئەی سوارچاك، لادە، تۆزێك لە مینادا

بانگێك بدە بە گوێی دانیشتوو، وەستاو دا

سپێدە، ئەو دەمانەی شەپۆلی حاجی بۆ مینا

وەکو شەپۆلی فوراتەو دەهەژێ بە هەموو لادا

گەر خۆشەویستی بۆ ئالی محمد ڕافیزی بێ

من ڕافزیم، با شایەت بێ، چی پەری و ئادەمیزادە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٦٤)

مامۆستای فێرکار و دڵسۆز ئەو مامۆستایەیە، کە قوتابیەکەی خۆشی دەوێ، لە هەموو کاروبارێکیدا پرسی پێ دەکات، هەر کێشەو گرفتێکی بوو ئاگاداری دەکاتەوە، ئەگەر سکاڵای بوو، سکاڵای خۆی لەپێش هەموو کەسدا لای ئەو باس دەکات.

---

(١) ص٥٥/ حبه لآل بيت/ يا راكباً قف بالمحصَّبِ من مِنيً/

وا باس دەكرێت كە (وكیع) مامۆستای شافیعی بووە، كاتێ كە شافیعی هەرزەكار بووە، ڕۆژێكیان شافیعی هەستی كرد كە توانای یادگەو خێرایی لەبەركردنی دەرسەكانی وەكو دوێنێ بەهێز نیە، لەبەرئەوە ئەم كێشەیەی خۆی لای مامۆستاكەی باس كرد، مامۆستاكەیشی ڕێنمایی كرد بەوەی كە خۆی لە گوناه كردن بپارێزێ، جا گوناهەكان ورد بن یان گەورە، هەروەها تێی گەیاند كە زانست نور و ڕوناكییە، نور و ڕوناكی خوداش نابنە مایەی هیدایەتدان و ڕێنمایی كەسانی یاخی و گوناهكار، بۆیە ئەگەر زانستی بەسوودت دەوێ، مانای نوری خودات دەوێ، نوری خوداش لەگەڵ شەڕو گوناهدا لەیەك عەقڵ و مێشك و دڵدا كۆنابنەوە.

زۆربەی خەڵكی ئەم هۆنراوە كەمەیان لەبەرە، چونكە پەیوەندیەكی گەورەی نێوان (فێربوونی زانست) و (ڕەفتاری مرۆڤ)ی پێكەوە گرێ داوە و نهێنیەكی گەورەی ئاشكرا كردووە.[1]

## نور العلم يسطع بترك المعاصي

شَكَوْتُ إلى وَكِيعِ سُوءِ حِفْظِي ... فَأَرْشَدَنِي إلى تَرْكِ المَعَاصِي

وَ أَخْبَرَنِي بِأَنَّ العِلْمَ نُورٌ ... وَنُورُ اللهِ لا يُهْدَى لِعَاصِي

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٦٤):

### (ڕۆشنایی زانست بە وازهێنان لە گوناه دەدرەوشێتەوە)

سكاڵام بردە لای وەكیع، بۆ خراپی توانای لەبەركردنم

ڕێی نیشاندام، بۆ چارەسەر لادەم لە تاوانكردنم

وای پێ گوتم: كەوا زانست ڕووناكی یە

ڕوناكی خواش، ڕابەر نابێ بۆ ئەو كەسەی كە یاخی یە

---

(١) ص٥٤/ نور العلم بترك المعاصي/ شكوت الى وكيع سوءَ حفظي/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٦٥)

شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا ڕوو دەکاتە خەڵکی، بەتایبەت ئەوانەی کە توانا و تەمەن و دەسەڵاتی بەخشندەیی و هاوکارییان هەیە، دەفەرموێت: ئەگەر ئێوە بەخشندە نەبن و تەمەنیش بەسەرتانا ڕابرێ، لە کاتێکدا بەتوانا بوون، دەتانتوانی دەستتان بکەنەوەو بقونجێنن، کاتێ ئێوە پیر بوون، لێکەوتن، بە هەژاری لەسەر جێگەی مەرگ کەوتن، ئیتر چ ئومێدێکتان لێ چاوەڕوان دەکرێت؟ ئەو دەمە دنیا گازی لێ گرتوون.

باشە ئێوە بۆ بەخشندە نابن؟ لە کاتێکدا ڕۆژگار سروشتی وایە هەرچی بیبەخشن بە زیادەوە بۆتان دەگەڕێنێتەوەو وەکو ئەوە وایە قەرزتان دابێ بە زەمانە.(١)

### الجود

إِذَا لَـمْ تَجُـودُوا وَالأُمُـورُ بِكُـم تَمْضِـي — وَقَدْ مَلَكَـتْ أَيْـدِيُكُم البَسْـطَ وَالقَبْـضَا

فَمَــاذَا يُرَجَّــى مِــنْكُمُ إِنْ عَــزَلْتُمُ — وَعَضَّــتْكُمُ الــدُّنْيَا بِأَنْيَابِهَــا عَضَّــا

وَتَسْــتَرْجَعُ الأَيَّــامُ مَــا وَهَبَــتْكُم — وَمِـنْ عَـادَةِ الأَيَّـامِ تَسْـتَرْجِعُ القَرْضَـا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٦٥):

### (دەهەندەیی)

کــە ئێــوە دەهەنــدە نــەبن، دەسەڵاتیشــتان ڕابــــرێ
لــە کاتێکــا دەتــانتوانی دەســتتان کــراوەو داخــراو بــــێ
چ ئومێــدێکتان لێ دەکــرێ، کــە لێکەوتــەیی داوگــرێ(٢)؟
کــە دنیــا بــە کەڵبــەی تیــژی، گــازی خــۆی لــە ئێــوە بگــرێ
ڕۆژگــار پێتــان ئەداتــەوە، ئــەوەی پێشــتر بەخشیوتانــــە
هەروایــە نــەریتی ڕۆژگــار، قــەرزی کــەس لای خــۆی نــاگرێ

(١) ص٥٥/ الجود/ إذا لم تجودوا والأمور بكم تمضي.

(٢) واتە: کە پەککەوتەیی و پیری و هەژاری دایگرتن

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٦٦)

کەسانێك هەیە، خۆیان چاکەکار نین، بەڵام بەهۆی تێکەڵاوبوونیان لەگەڵ چاکەخوازان، دەبنە چاکەکار، یاخود ئەو کەسانەی کە چاکەکارن هەرگیز بە دەمی خۆیان وەسفی خۆیان ناکەن، بەڵکو دەڵێن: ئێمە چاکەکارانمان خۆش دەوێ، شافیعی خ.ل لەسەر زمانی ئەم کەسانە لەم هۆنراوەیەدا دەفەرموێ: من چاکەکارانم خۆش دەوێ، هەرچەندە لەوانیش نیم، ئامانجم ئەوەیە کە بەهۆی تێکەڵاوبوونیان لە دنیادا خێری قیامەتم دەست بکەوێ، هاوکات لە دنیاکەی تریش بەر تکاو شەفاعەتی ئەوان بکەوم و خودای گەورە بەهۆی تکای ئەوانەوە بۆم، لێم ببورێ.

بەڵایەکی گەورەیە مرۆڤ خۆی چاکەخواز نەبێ و تێکەڵاوی چاکەخوازانیش نەبێ.

لە دێڕی دووەمدا دەفەرموێ: من ئەگەر چاکەکارانیشم خۆش نەوێ خراپەکارانم ڕق لێ دەبێتەوە، چونکە خراپەکاران دەڵێی دوکانی گوناه فرۆشتنیان داناوە، بازرگانی و مامەڵە بە تاوان و خراپەکاریەوە دەکەن، دەفەرموێت: گەرچی منیش هەر تاوانبارو گوناهبارم، بابەت و کەرەسەی بازرگانیمان لەیەك دەچێ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خراپەکارانم خۆش ناوێ.

کەسێك کەسێکی خۆشویست گوێڕایەڵی دەکات، سەرەنجام خووی ئەو دەگرێ، بۆیە وا باشە ئەگەر خۆشمان چاکەخواز نەبین، نابێ توخنی خراپەکاران بکەوین و هاوبازرگانیان بین.

مرۆڤ ئەگەر چاکەکار نەبێ و تێکەڵاوی چاکەکارانیش نەبێ، ئەوا سەرەنجام زیانێکی گەورە لە خۆی دەدات و دەشبێتە پشتیوان بۆ خراپەکاریی.[1]

---

(١) ص٥٦/ حب الصالحين/ احبّ الصالحين ولست منهم

## حب الصالحين

أُحِبُّ الصَّالِحِينَ وَلَسْتُ مِنْهُمْ لَعَلِّي أَنْ أَنَالَ بِهِمْ شَفَاعَةْ
وَأَكْرَهُ مَنْ تِجَارَتُهُ الْمَعَاصِي وَلَوْ كُنَّا سَوَاءً فِي الْبِضَاعَةْ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٦٦):

### (خۆشەویستی چاکەکاران)

چاکەکارانم خۆش دەوێ، لەوانیش نیم
بەڵکو بەر شەفاعەت کەوم، لەو دنیادا لە کە لیا نا
ڕقم لە بازرگانێکە، بکڕ، بفرۆشی تاوانە
گەرچی هەردوو، هاو بابەتین، لە کەرەسەی فرۆشمانا

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٦٧)

ڕێنمایی کردن و ئامۆژگاری کردن هونەر و زانستە، هەموو کەسێ شارەزایی نیە لە هونەری ئامۆژگاریکردندا، بۆیە هەندێ لە دایك و باوك و مامۆستاكان و ڕابەر و مامۆستایانی ئاینی لە مینبەرەکانەوە، ئەگەر زانستی ڕێنماکاری و بنەماکانی شارەزا نەبن، ئەوا کاری پەروەردە دەشێوێنن، زانستی ڕێنماکاری ئێستا بووەتە زانستێکی گرنگ لە دەروونزانیدا و لە زانکۆکان دەخوێنرێت، جگە لەوە پزیشکانی دەروونیش دەیخوێنن. کەسی ڕابەر و ڕاهێنەر و ئامۆژگار دەبێ شارەزا بێ.

شافیعی خ.ل زۆر زیرەکانە باسی ئەدەب و شێواز و هونەری ئامۆژگاری کردنی لەم هۆنراوە کورتەدا کردووە. دەفەرموێت: ئەگەر ویستت ئامۆژگاریم بکەیت، ئەوا ڕەچاوی ئەم مەرجانە بکە:

١- بانگم بکەرە لاوە، بە تەنها من و تۆ بین، لەناو خەڵکیدا بە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ئامۆژگاریم مەکە. چونکە ئامۆژگاری کردن لەناو خەڵکیدا شکاندن و

تـەریق کردنـەوەو سەرزەنشـتی کردنـە، شـەڕی زیـاترە لـە خێـری، دڵنیابـە ئەگـەر ڕەچاوی ئەو مەرجە نەکەیت ئەوا چەندە زانا و دڵسـۆزو بەتەمـەن و ئەزمونـدار بـی، هێشتا گوێت لێ ناگرم و بەجێت دەهێڵم، باش وایە ڕەخنە لەم داواکاریەشم نەگریت، بەڕاستی ئەگەر تۆ گوێ بۆ من و کەسانی تـر نـەگریت، دڵنیابـە کـەس ئامـادە نابـێ گوێ لە تۆ بگرێ، گەرچی قسەکانت بەنرخ و زێـڕ و زیـویش بـن. چـونکە هـەمووماں پێویستمان بـە ڕێنمـایی و ئامۆژگـاری یـەکتری هەیـە، کـەس بـە تـەنها تـەواو نیـە. هەموومان پێکەوە یەکتری تەواو دەکەین.[1]

## آداب النصح

| | |
|---|---|
| تَعَمَّـــدْني بِنُصْــــحِكَ في انْفِـــرَادِي | وَجَنِّبْنِـــي النَّصِـــيحَةَ في اَلْجَمَاعَـــه |
| فَـــإِنَّ النُّصْـــحَ بَـيْنَ النَّـــاسِ نَـــوْعٌ | مِـــنَ التَّـــوبِيخِ لا أَرْضَـــى اسْـــتِمَاعَه |
| وَإِنْ خَـــالَفْتَنِي وَعَصِـــيتَ قَـــوْلِي | فَـــلا تَجْـــزَعْ إِذَا لَـــمْ تُعْـــطَ طَاعَـــه |

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٦٧):

## (شێوازی ئامۆژگاری)

بـۆ ئامۆژگـاری، ڕامگـرە، لـە کاتێکـا کـە تـەنهـا بیـن
بمخـەرە لاوە، ئـەو دەمانـە، نابـێ لـەناو خـەڵکیـدا بـین
ئامۆژگـاری لـەناو خـەڵکا، جۆرێکـە لـە سەرزەنشتـی
دڵنیابـە، ئەگـەر وا بـی، گوێـت لێ نـاگرم، وا جێـم هێشـتی
ڕازی نـابـم، لەمەشیـان، ڕەخنـەم لێ بگـری
زویـر مەبـە، گوێـت بـۆ نـاگرن، کـە گـوێ بـۆ خـەڵکی نـاگری

---

(١) ص٥٦/ آداب النصح/ تَعمدّني بنصحك في إنفرادي/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٦٨)

مرۆڤ کە بەڕاستی خواپەرست و ژیر بێ، ئەوا زوو زوو بەخۆیا دەچێتەوە، عەیب و ناتەواویەکانی خۆی دەژمێرێ و هەوڵی خۆی دەخاتە گەڕ، بۆ خۆ چاکردنی، ئەو کەسە ژیرە، کە سەرقاڵە بە گەڕان بە دوای عەیبەکانی خۆیدا، هەروەکو چۆن نەخۆشێك لە تاو ئازاری خۆی نازانێ نەخۆشەکانی تر لە چ ئێش و ئازارێکدان.[1]

### من الورع اشتغالك بعيوبك

| | |
|---|---|
| الْمَــــرءُ إِنْ كَــــانَ عَـــاقِلاً وَرِعَـــا | أشْـغَلَهُ عَـنْ عُيُـوبِ غَيْـرِهِ وَرَعُـه |
| كَمَـــا العَلِيــــلُ السَّـــقِيمُ أشْــغَلَهُ | عَــنْ وَجَــعِ النَّـــاسِ كُلِّهِــم وَجَعُــهُ |

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٦٨):

**لە خواناسیتە کە دەگەڕێی بەدوای کەم و نەنگیەکانی خۆتدا**

کەسێك، کە ژیر و خواناسە، لەبەر گەڕان، بۆ نەنگی خۆی
سەرناپەرژێ، نەنگی ئەم و ئەو بژمێرێ، بیلێتەوە
وەك نەخۆشێك، لە تاو ئێش و ژانەکانی
بێ ئاگایە، خەڵکی لەکام خەم و ژانا، ئەتلێتەوە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٦٩)

خۆشە مرۆڤ لە ئاستی بەرزی زانست و زانیاری دا بێت، چونکە تا زاناتر بێت، چاکتر لە خواداناسی تێدەگەیت و چێژی لێوەردەگریت، بەڵام دەبێ وریا بی ئەوەش بیت کە شەیتان زاناترین کەسە، بۆیە هەمیشە نزا خواز بەو داوا بکە لە خودا ئەوەندە زانیاری و زانستت پێ ببەخشێ کە ئەوەی پێ بناسیت و ئەوی پێ بپەرستیت، لەم هۆنراوەیەدا شافیعی خ.ل دەفەرموێت: ئەوەندەم زانست بەسە کە

---

(١) ص٥٦/ من الورع اشتغالك بورعك/ المرو ان كان عاقلاً ورعا

سوودی بۆم هەبێ و نەبێتە مایەی لەخۆبایی بوون و یاخی بوونم، زەلیلی لە چاوبرسێتی زێدەڕەویدایە، زێدەڕەوییەك كە هەڵت دێرێ، هەر كەسێ بۆ هەر سەفەر و بەرزییەكی مادی یان مەعنەوی بەرز بێتەوە، هەر دەبێ دوایی دابەزێتەوە، چونكە تۆ مرۆڤی و لەگەڵ مرۆڤە ئاساییەكانی سەر زەوی دەژی، وریابە پلەوپایە و بڕوانامە زانستیەكەت تووشی لووت بەرزیت نەكات، بەسەر خەڵكیدا هەڵمەشاخێ و بەكەم و نزم تەماشای خەڵكی مەكە، هەر كەسێك لەژێر دەسەڵات و چاودێری خودا دابێ هەر دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی ئاسایی چوونەكەی خۆی، بۆ نەژادی بنەڕەتی خۆی، كە پاكی و خواپەرستیە، هەروەكو چۆن باڵندە چەندە بە ئاسمانا بەرز بێتەوە، لە كۆتاییدا هەر دەگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی، هەموو بەرزبوونەوەیەك ئاكامەكەی دابەزینە، هەموو دەسەڵاتێكی دنیایی ئاكامەكەی نەمان و بڕانەوەیە، هەموو لەدایك بوونێك مردنێك چاوەڕوانیەتی.[1]

## من راقب الله رجع

حَسْبِي بِعِلْمِي إِنْ نَفَعْ      مَا الذُّلُّ إلاَّ فِي الطَّمَعْ

مَنْ رَاقَبَ اللهَ رَجَعْ      مَا طَارَ طَيْرُ و ارْتَفَعْ

إلاَّ كَمَا طَارَ وَقَعْ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٦٩):

### (ئەوەی خودا چاودێری بێ، دەگەڕێتەوە)

بەسمە زانست، ئەوەی هەمە، كە سوودی بێ
زەلیلی بەشی كەسێكە، چاوی چنۆكە و تێر نەبێ
كەسێ خۆی دابێتە دەست خوا، لە كۆتا، دەگەڕێتەوە
باڵندە، چەندە بەرزە فڕ بێ، بۆ سەر زەوی هەر دێتەوە
وەك هەڵفڕی، ئاوەهاش دەنیشێتەوە

(١) ص٥٧/ من راقب الله رجع/ حسبي بعلمي إن نفع/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٧٠)

لەم دنیایەدا ستەم کۆتایی نایات، بەڵام نزای شەوانەی ستەملێکراوانیش هەر کۆتایی نایات، داماوێك، ستەملێکراوێك، ماف خوراوێك، کاتێ بەکوڵ ڕوو دەکاتە خودا و داوای یارمەتی لێدەکات خوداش دڵی ناشکێنێ، هەر لەم دنیایەدا تۆڵەیەکی بۆ دەسەنێ، جگە لە سزای دوایی، ئیسلامیش بۆ لابردنی ستەم هاتووە، بە هەموو جۆرەکانیەوە، نزای شەوانە وەکو تیری (قەسسی) وایە، کە بەناوبانگترین تیری تیژ لە شاری (قەسی) دروست کراوە و لەو سەردەمەدا و زرێ و قەڵغان نەیدەبڕی، بەسە ئەو تیرانە کۆتایی بەو ستەمکارە بێنن بە خۆیان و هاوکارو یاوەرانیشیان، کە ئەو تیژەش تیری ستەملێکراوەو گەلێك تیژە، لە تیرە دروست کراوەکانی شاری (قەسی).[1]

### اتق دعوة المظلوم

وَرُبَّ ظَلُـــومٍ قَـــدْ كُفِيـــتَ بِحَرْبِـــهِ فَأَوْقَعَـــهُ المَقْـــدُورُ أَيَّ وُقُـــوعِ

فَمَـا كَـانَ لَـي الإِسْـلاَمُ إلاَّ تَعَبُّـداً وَأَدْعَيَـــةً لا تُتَّقَـــى بِـــدُرُوعِ

وَحَسْـبُكَ أَنْ يَنْجُـو الظَّلُـومُ وَخَلْفَـهُ سِـهَامُ دُعَـاءِ مِـنْ قَسِـيِّ رُكُـوعِ

مُرَيَّشَـةٍ بِالْهُـدْبِ مِـنْ كـلِّ سَـاهِرٍ مُنهَلَّـــةٌ أَطْرَافُهَـــا بِـــدُمُوعِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٧٠):

### (خۆت بپارێزە لەنزای ستەملێکراو)

دورنیـــــە، ستەمکارێــــك لـــــەناوچێ، نـزای داماوێـك بیگـرێ

ئیسلامیش بۆ ئەوە هات، نزایەکە، کە هیچ شتێ بەری ناگرێ

مەحاڵــــە ستەمکارو، یاوەرانی ڕزگـاربن، لە ئەو تیر نزایانە

---

(١) ص٥٧/ إتّق دعوة المظلوم/ وَرُبَّ ظلوم قد كفيت بحربة/

کە کارایی لەکارا وەك (تیر قەسی)[1] لە ناو دەبڕێ
پەڕەدارە ئەو تیرە، وەك زیندەوەری ژیرە، بە فرمێسك شۆراوە
ڕووکاتە هەر زاڵمێك، جەرگ و هەناوی دەبڕێ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٧١)

چەند کەس لەناو خەڵکیدا خۆیان وا نیشان دەدەن کە گوایا خوایان زۆر خۆش دەوێ، بە ڕیش و بەرگی ڕوکەشانەشیان خۆیان وەکو خواپەرستێکی دیندار نیشان دەدەن، ئەو کەسانە خۆیان فریو دەدەن، چونکە بە عەقڵی خۆیان وا دەزانن کە ئەگەر خەڵکی بە دیندارو خواناسیان بزانن، مانای ئەوانیش وان، نەخێر خوای گەورە خۆی بەندەکانی دەناسێ، تۆ فرمانی خودا دەشکێنی و لێی یاخی دەبی، کەچی بە ڕواڵەت وا نیشان دەدەی کە خۆشت دەوێ، یاسای ژیان دەڵێ هەر کەسێ کەسێکی خۆش بوێ بە ئاشکراو نهێنی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەکات، تۆ وانیت، ئەوەتا ڕۆژانە ئەو خودایە نازو نیعمەتی نوێت پێ دەبەخشێ، کەچی تۆ سوپاسی ناکەیت.[2]

### نكران الجميل

تَعْصِي اَلإِلـهَ وَأَنْتَ تُظْهِرُ حُبَّهُ ... هـذَا مَحَالٌ فِي القِيَاسِ بَدِيعَ
لَوْ كَانَ حُبُّكَ صَادِقاً لأَطَعْتَهُ ... إِنَّ الْمُحِبَّ لِمَنْ يُحِبُّ مُطِيعُ
فِي كُلِّ يَوْمٍ يَبْتَدِيكَ بِنِعْمَةِ ... مِنْهُ وَأَنْتَ لِشُكْرِ ذَاكَ مُضِيعُ

---

(١) تیر قەسی: ئەو تیرە بەناوبانگەیە کە لە شاری (قەس) دروست دەکران.

(٢) ص٥٨/ نكران الجميل/ تعصي الألة وأنت تظهر حبه/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٧١):

## (نکوڵی کردن لە جوانیەکان)

تــۆ لــە خــودا یــاخی دەبــی و، واش دەنــوێنی خۆشــت دەویَ
مەحاڵــە وابــیَ کەســـــیَ، لــە پێوانــەدا بەدیعــە، زۆر ئەســتەمە
کـــــە بـــــە ڕاســـتی خۆشـــت بـــویَ، گوێڕایـــەڵی ئـــەوت دەویَ
خـــــــۆشەویست، بـــــــۆ ئازیزەکـــەی، گوێڕایـــەڵ و بەرفرمانـــــە
پێـــت دەبەخشـــیَ ئـــەو خودایـــە، ڕۆژانـــە هەرچـــیەکت دەویَ
کـــەچـــــی سوپاســـــگوزاری تـــــۆ، بەرانبـــــەری دەرناکـــــەویَ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٧٢)

ئەوین و خۆشەویستی پاك و بێگەرد کە بە مەبەستی تێرکردنی ئارەزووی بەدو بەدکاریی نەبیَ، بە چەشنێکی پڕ لە ئەدەب و لە سنوری خواناسیدا ڕەوایە، بەڵام نەك وەك ئەو هەموو تاوان و بەدکاریانە نا کە ئەمڕۆ بەناوی خۆشەویستی و دڵداریەوە دەکرێن و (خۆشەویستی ڕاستەقینە و پاك) یان لەکەدار و شەرمەزار کردووە.

(یاقوتی حەمەوی) دەڵێت: پیاوێك هاتەلام و پێی ڕاگەیاندم کە پیاوێك چووە خزمەتی شافیعی، پارچە نوسراوێکی پیَ بوو، تیایدا نوسرا بوو لە موفتی مەککە (واتا لە شافیعی) بپرسە کە کەسێك چی بکات کە تاسەی ئەوین و خۆشەویستی گرتبێتی؟ ئەویش لەوەڵامدا بۆی نوسیبووەوە با تیماری ئارەزووەکانی بکات و تاسەو ئێشی خۆی بشارێتەوەو دەری نەبڕیَ، ئارامبگریَ تا کاروبارەکان دێنە پێش و تێپەڕ دەبن، پیاوەکە ئەم وەڵامەی وەرگرت لە شافیعی و نامەکەی برد بۆ ئەو کەسەی کە پێشتر ئەوەی نوسیبوو، ئینجا کەسەکە سەر لەنویَ بۆ شافیعی نوسیەوە چۆن تیمار بکەم، لە کاتێکدا ئارەزووەکان سەری گەنج دەخۆن، هەموو ڕۆژیَ سەر لەنویَ پێوەم دەدات و دەکولێتەوە؟

دیسان شافیعی خ.ل بۆی نوسیبوو: ئەگەر ئەو کەسە دان بە خۆیا نەگرێ لەسەر ئەو شتانەی تووشی هاتوون لە ئەنجامی ئەو ئارەزووە پیسەیەوە، هیچ شتێ نیە کە هێندەی مەرگ بۆی بەسوود بێ[1].

## الهوى

السائل:

سَلِ المُفْتِـيَ الْمَكِّـيَ مِـنْ آلِ هَاشِـمٍ          إِذَا أشْـتَدَّ وِجْدٌ بِـامْرِيءٍ مَـاذَا يَصْـنَعَ

الشافعي:

يُـدَاوِي هَــوَاهُ ثُــمَّ يَكْـتُمُ وَجْـدَهُ          وَيَصْــبِرُ فِي كُــلِّ الأُمُــورِ وَيَخْضَــعُ

السائل:

فَكَيْـفَ يُـدَاوِي وَالْهَـوى قَاتِـلُ الفَتَـى          وَفِي كُــلِّ يَــوْمٍ غُصَّــةٌ يَتَجَــرَّعُ

الشافعي:

فَـإِنْ هُـوَ لَـمْ يَصْـبِرْ عَلـى مَـا أصَـابَهُ          فَلَـيْسَ لَـهُ شَـيءٌ سِـوَى المَوْتِ أَنْفَـعُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٧٢):

## ئارەزوو

پرسیارکار:

لـــە موفتـــی مـــەککە، کـــە ئـــالی هاشمـــە بپرســـە بـــۆم
چـــی بکـــا کەســـێك، کـــە وا ئـــەوین نـــاخی دڵـــی بکاتـــە چـــۆم؟

شافیعی:

تیمـــاری ئـــارەزووی بکـــا، تاســـــەری ئـــەوینی کـــپ بکـــا
ئارامگربـــێ بـــۆ ڕۆژگـــار و ملـــی خۆیشـــی بـــۆ کـــەچ نـــەکا

پرسیارکار:

چـــۆن تیمـــاری خـــۆی بکـــا، ئـــارەزووی گـــــەنج ئـــاگرە

(١) ص٥٨ ص٥٩، الهوى/ سل المفتي المكي من آل هاشمٍ.

هـــــــەموو ڕۆژێ زامەکـــــــەی قـــــوڕگ و هــــــــــەناسەگرە؟

شافیعی:

ئەگـــــەر لەســــــەر ئـــــەو دەردو کۆســــــپانە خۆڕاگـــــــــــەگرێ

شــــتێك شـــــك نــــــابەم ئــــیتر، وا باشــــترە کــــە بمــــــــرێ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٧٣)

دەشێ تۆ کەسێکت خۆش بوێ، بەڵام ئەو بۆ تۆ وانەبێ، بۆ نمونە ئامادەیت هەموو قوربانیەك بەسەر ماڵت بدەی لە پێناوی هاوڕێکەتدا، بەڵام ئەو وانیە، هاوڕێیەتی ئەگەر لەسەر بنەمای خۆشەویستی نەبێ، بەداواکاری و لێپاڕانەوە نابێ، خۆشەویستی نەرم و نیان و ناسکە، بە حوکمی تۆبزی و زەبر و زۆر دروست ناکرێ، دروستیش بکرێ تەنها شتێکی کاتیيە، ڕووکەشە، سەرناگرێ، زۆر ناخایەنێت، شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا دەفەرموێت:

ئەگەر کەسێك بەخۆشی خۆی چاودێری نەکردیت و نەبووە دۆست و هاوڕێت، تۆش خۆت سووك مەکە، لێی مەپاڕێرەوە، ئاخ و داخ مەخۆ بۆ سپڵەیی و بێ وەڵامی ئەو، هەر کەسێ خۆی چی تێدا بێ ئەوەشی لێ دێتە دەرێ، دەکرێ کەسێکی تر بدۆزیتەوە، هاوچەشنی لە بە جۆری جیاجیا لە مرۆڤەکاندا هەیە، پشوو بە خۆشت بدەو خۆت مەخەرە ژێر باری خەمەوە بۆ باری نالەباری کەسێك کە دەتەوێ بەزۆر بیکەی بە دۆست بۆ خۆت، دڵیش سروشتی وایە ئەو کەسەی کە بە دڵتە خۆشت ئەوێ، گەرچی ئەویش بۆ تۆ وانەبێ، ئەم بارە زۆربەی کات بەدەست خۆت نیە، ناتوانی ڕقت لە خۆشەویستەکەت بێت، دڵ هاوکات جێگەی خۆشەویستی و ئارامگریشی تێدایە، هەروەکو خۆشەویستی تێدایە.

مەرج نیە هەر کەسێ تۆ دڵت لەسەری بێ، ئەویش دڵی لەسەرت بێ، مەرج نیە بەرانبەر هەر کەسێ دڵپاك بی، ئەویش بەرانبەرت وابێ، ئەگەر خۆشەویستیەك

سروشتیانەو خۆڕسکانە نەهاتە دڵتەوە، بە زۆر ڕایمەکێشە، چونکە ئەوە خێری لێ نابینی.

بزانە هاوڕێیەك خێری نیە بۆت، کە ناپاکی بەرانبەر هاوڕێکەی کردبێ، یان بکات، چونکە هەر دوای ئەوەی تۆ سۆز و خۆشەویستی خۆی بۆ دەردەبڕی، ئەو وشك و دڵڕەقانە ڕەفتاری لەگەڵ دەکات، بگرە نکوڵی لەو پێکەوە ژیان و هاوڕێیەتیەی ڕابردووشت لەگەڵ دەکات، ئەو نهێنیەیانەی نێوانی خۆتان کە تا دوێنێ نهێنی بوون لەلاتان، ئەو بڵاویان دەکاتەوەو ئاشکرایان دەکات و ئابڕووت دەبات.

وازهێنان لە دنیایەکی ئاوەها زۆر باشترە کە هاوڕێی سەر ڕاست و پەیمان ڕاست و بە ویژدانی تێدا نەبێ.

تۆش بە خۆتا بچۆرەوە، بزانە هاوڕێی کێیت؟!

چۆنە لەگەڵتا؟ لە کام ئاست و پلەی ڕێز و خۆشەویستی و سۆز و دڵسۆزیدایە بۆت؟[1]

## صفو الوداد والخل الصدوق

إِذَا الْمَــرْءُ لا يَرْعَــاكَ إِلاَّ تَكَلُّفَــا ... فَدَعْـهُ وَ لاَ تُكْثِـرْ عَلَيْـهِ التَّأَسُّـفَا

فَفِـي النَّـاسِ أَبْـدَالٌ وَفِي التَّـرْكِ رَاحَـةٌ ... وَفِي الْقَلْـبِ صَـبْرٌ لِلْحَبِيـبِ وَلَـوْ جَفَـا

فَمَـا كُـلُّ مَـنْ تَهْـوَاهُ يَهْـوَاكَ قَلْبُـهُ ... وَلا كُـلُّ مَـنْ صَـافَيْتَهُ لَـكَ قَـدْ صَـفَا

إِذَا لَـمْ يَكُـنْ صَـفْوُ الْـوِدَادِ طَبِيعَـةً ... فَــلاَ خَيْــرَ فِي خِــلٍّ يَجِــيءُ تَكَلُّفَــا

وَلاَ خَيْــرَ فِي خِــلٍّ يَخُــونُ خَلِيلَــهُ ... وَيَلْقَــاهُ مِــنْ بَعْــدِ الْمَــوَدَّةِ بِالْجَفَــا

وَيُنْكِـرُ عَيْشًـا قَـدْ تَقَـادَمَ عَهْـدُهُ ... وَيُظْهِـرُ سِـرًّا كَـانَ بِـالأَمْسِ قَـدْ خَفَـا

سَـلاَمٌ عَلَـى الـدُّنْيَا إِذَا لَـمْ يَكُـنْ بِهَـا ... صَدِيقٌ صَدُوقٌ صَادِقَ الْوَعْدِ مُنْصِفَا

---

(١) ص٦٠/ صفو الوداد و الخل الصدوق.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٧٣):

## (پاکسۆزیی و هاوڕێی سەر ڕاست)

کەسێـــــک، بـــەبـــێ داخـــوازی خـــۆت، ئـــاوڕێـــکت لێ نەداتەوە

لێـــی دوور کـــــەوە، لـە دڵـتـدا گـەورەی نەکـەی، ئاخ و داخـی بتباتـەوە

ئـــەو خـــەڵـــکانـــە هـــەمـــە جۆرن، هەیە لایدەی پشوویە بۆت

خـۆ دڵیشـت پـڕ خـۆگریی ئازیزانـە، گەرچـی ئـەویش جـەفا[1]ی بـێ بـۆت

مـــەرج نیـــە دڵت بـــە هـــەر کەسێ دابێ، دڵی ئـەویش بـۆ تـۆ وابـێ

یـــان لـــە گـــەڵ کێـــدا دڵپـــاک بـــی، ئـەویش لە دڵا بۆت وابێ

خـــۆشـــەویستـــــی، خۆڕسکانە[2] لە کانگای دڵـەوە نـــەبـــێ

بـێ خێـــرە، هـــاوڕێـــی کەسێك، گـەر بـە زۆر و بـــە تکـا بـــێ

هـــەر بـێ خێـــرە، ئـــەو هاوەڵـەی کـە ناپـاکی بـە هـــاوەڵ کـا[3]

هـــاوڕێ بـــووبـــن، کـــەچی دوای سۆز، سپڵـــەیی بەرانبـەری کا

نـــکوڵـی کـــا[4] لـــەوەی پێـــشتر، کـــە هـــاوەڵ و هـاوژینی بوو

ئـــاشکرای کـــا، چـی تـــا دوێنـــێ، لای پـەنهان و نهێنـی بـوو

بـــڕوا دنیـــا، ماڵـــی ئاوا، کە کـــەس لەنـــاویـــا نەمێنـــێ

هـــاوەڵێـــک ڕاســـــت و ڕاستگۆ بێ، بـە ڕاسـت پـەیمان بـەجێبێنێ

---

(١) جەفا: پێچەوانەی وەفا، پێنەزانی، سپڵەیی، دڵۆشکی.

(٢) خۆڕسکانە: خواڕسکانە، هەر کارێ کە خوا بیڕسکێنێ و بەرپای بکات، واتە سروشتیانە و خوائاسایانە.

(٣) هاوەڵ: هاوڕێ، هاودەم، هەڤاڵ، دۆست، برادەر.

(٤) نکوڵی: ئینکاری، پەرچدانەوە، ڕەتکردنەوە.

## دەروازەی هۆنـراوەی ژمارە (٧٤)

کاتێ کەسێك زانایی و خواناسی تێدا کۆبێتـەوە، نمونەیـەکی بـاڵای مرۆڤایـەتی لێدەردەچێت، ئەو زانا پایە بەرزانەش لە مێژووی ئیسـلامدا زۆرن، یـەکێك لەوانـەش (أبو حنیفه)یە خ.ل، کـە شـافیعی خ.ل شـانازی پێـوە دەکـات و بـە بۆنـەی کۆچـی دواییەوە ئەم هۆنراوەیەی بۆ دانـاوە، کـە دەفـەرموێت وڵات سـەنگ و قورسـاییەکی تری هەیە، کە (ئەبو حەنیفە)ی تێدایە، بەهۆی بەرهەم و نوسـین و فـەتوا و زانسـتە گەورەکەیەوە، کە وەکو بەڵگەو ئایەتەکانی (زەبـور) لەسـەر لاپـەڕەکان پەخشـان و درەخشانن، هاوتای ئەو زانایە نیە، نە لە هەردوولای ڕۆژهەڵات و نـە لـە هـەردوولای ڕۆژئاوای جیهاندا، بگـرە لـە شـاری (کوفـە)ی عێـراقیش نیـە، کـە لـەو سـەردەمەدا مەڵبەند و پێگەی گەورە زانایان بووە، دەی سا خودایە سۆز و میهری خـۆت بڕێـژە بەسەر گیانی بەرزی ئەو زانا پایەدار و خواپەرستەدا کە بە درێژایی ڕۆژگار نوسین و لاپەڕەکانی دەخوێنرێن و دەخوێنرێنەوە[1].

### أبو حنيفة

لَقَـــدْ زَانَ الْـــبِلاَدَ وَمَـــنْ عَلَيْهَـــا ... إِمَـــامُ المُسْـــلِمِينَ أَبُـــو حَنِيفَـــه

بِأَحْكَـــــامٍ وَآثَـــــارٍ وَفِقْـــــهٍ ... كَآيَـــاتِ الزَّبُـــورِ عَلَـــى الصَّـــحِيفَه

فَمَـــا بَالْمَشْـــرِقَيْنِ لَـــهُ نَظِـــيرٌ ... وَلاَ بِـــــالْمَغْرِبَيْنِ ولاَ بِكُوفَـــــه

فَرَحْمَـــةُ رَبِّنَـــا أَبَـــداً عَلَيْـــهِ ... مَـــدَى الأَيَّـــامِ مَـــا قُرِئَـــتْ صَـــحِيفَه

### دەقی هۆنـراوەی ژمارە (٧٤):

### (زانا ئەبو حەنیفە)

قورســـە کێشـــی، ئـــەو وڵاتـــەو، هەرچـــی لەناویشیدایـــە

کـــە پێشـــەوای موســـوڵمانان (ئەبـــوحەنیفە)ی تێدایـــە

---

(١) ص٦١/ أبو حنيفة/ لقد زان البلاد ومن عليها/

بـــــه هــــــــۆی حـوكـــــم و زانســــت و فــــەرموودەكانی
كــه وەك ئایــەتی زەبــوورن، لــــــە ســـەر ڕووی لاپـــەڕەكانی
نــه لـــه هـــەردوو خۆرهــــەلآت و، نەلـــه هـــەردوو خۆرئـــاوادا
نیــه، كەســێ، كــه هاوتــای بــێ، بگـره لـه شـاری (كوفه)شـدا
میهرەبـــانی ئــەو خـــــودایه، هــــەمیشــه بڕژێتــه گیـــانی
هـــــەتاكو دنیـــا بمێنـــــێ، دەخوێنــــــــــرێ زانستــەكانــــــی

## دەروازەی هۆنـراوەی ژمارە (٧٥)

هـەموو لایـەكمان پەرۆشـین، دەڕۆیـن، دەخـوێنین، گەشـت دەكـەین، ژیـانی هاوسەری پێك دێنین، مانـدوو دەبـین، ڕادەوەسـتین، دەدوێـین، دەنـوین، هـەمووی لەپێناوی ئەوەدایە كە بگەینە ئەو ئاسـودەیی و دڵخۆشـیەی كـە لـە نـاخی خۆمانـدا وێنامان كردووە، بـەڵام پێویسـتە بـزانین، ئـەو وێناكردنـەی ناخمـان، ئـەو شـادی و ئاسودەییە كە لە دنیای داهاتووماندا دەستمان دەكەوێ، لەم دنیایەدا تەنها كـەمێك شادی براوە و كاتیمان دەست دەكەوێ، مرۆڤی دانا و مشورخۆر، ئـەو كەسـەیە كـە لە ئێستادا خەمی سبەینێ ڕۆژی دوایی و خۆشیەكانی دەخوات.

شـافیعی خ.ل دەفـەرموێت: چـۆن بتـوانم بگەمـە ئـەو ئاسـودەیی و شـادیەی دەمەوێت؟ لە كاتێكا چەندین چیای سەخت و كۆسپ و ناحـەز لـە ڕێمدایـە، خۆشـم پێ پەتیم و پێڵاوی ئـەو گەشـت و ڕەوەم نیـە، هۆیـەكی گواستنەوەیشـم پـێ نیـە، دەست و پێ سپیم و ڕێگە تاریك و ترسناك و پێچاوپێچە.

واتـا نـاتوانم بەسـەر ئـەو هـەموو كۆسـپانەدا زاڵ بم و بگەمـە ئـەو ئاسـودەییە نموونەییە، لەم دنیایەدا، باش وایە خەریكی ئامادەكـاری بم و بـۆ بەدەسـت هێنـانی ئەو شـادیە لـە دنیاكـەی تـردا، كـە هـەموو شـتەكان تیایـدا بـەردەوامن و لەوپـەڕی

نمونەییدان، باش وایە فیز و لەخۆبایی بوون نەمگریّ و بە شادیەکانی ئەم دنیا ڕازی بم و کار بۆ شادیەکانی ئەولام بکەم.[1]

## التواضع

كَيْـفَ الْوُصُـولُ إلى سُـعَادٍ وَدُونَهَـا      قُلَـلُ الْجِبَـالِ وَدُونَهُـنَّ حُتُـوفُ
وُالرِّجْـلُ حَافِيَـةٌ وَلاَ لـي مَرْكَـبٌ      وَالْكَـفُّ صِـفْرٌ وَالطَّرِيـقُ مَخُـوفُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٧٥):

## بێ فیزیی

چـۆن بگەمـە دڵشـادیەك، کـە چـەندین شـاخ لـە ڕێمدایـە
لـەنێوان لوتکـەی ئـەوانیش، شـیو و نـەیاری تێدایـە؟
مـن پـێ پـەتی و بـێ وڵاخـم، هۆیـەك شـك نـابەم لـەلاوە
بـۆ گواسـتنەوەم، بـن پـێ خـزو ڕێگـەم بـە تـرس گـیراوە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٧٦)

مەرج نیە، هەمیشە هێز و بازوو، دەسەڵات و دڕندەیی مایەی بەدەست هێنانی دەستکەوت و ئاواتە دنیاییەکان و ئاسودەیی دەرون بێ بۆ مرۆڤ، بە پێچەوانەوە دڕندەو ستەمکاران هەمیشە لە ترس و دڵەڕاوکیّ دا دەژین، گەرچی چواردەوریان بە پاسەوان تەنرا بێ، تەنانە لە خەوتنیاندا ئارام و ئاسودەو بێ خەم نین، شافیعی دەفەرموێت: تەماشایەکی باڵندەیەکی وەکو هەڵۆ و واشە بکە، بەو هەموو دەنوکە تیژو چرنوکە بڕندەو بازووە بەهێزەیەوە، گەلێك جار توانای ڕاوکردنی نێچیری گەرم و زیندوو ناکەوێت، لەبەرئەوە بە کەلاکە تۆپیو ڕازیە، کە بەرماوەی گیانەوەرانی ترە، بە پێچەوانەیشەوە، مەگەزێکی لاواز و بێ هێز و کەمتوانای وەکو (مێش)

---

(١) ص٦١/التواضع/ كيف الوصول الى سعاد و دونها/

هەرگیز بە کۆنە خۆراك و گەندە ڕازی نابێ و تا بتوانێت خۆراکی گەش و تەڕ و تازە بۆ خۆی دەستەبەر دەکات، کەواتە نەهێز و دەسەلات هەمووی باشەیەو نە لاوازی و بێ دەسەلاتیش هەمووی خراپەیە، سروشتی (بەهێزی) و (کەمهێزی) هەردوولایان بۆ ژیانمان پێویستن و هەریەکەیان لە کات و شوێنی گونجاوی خۆیاندا سوودی لێ وەردەگرین، بەلام ئەوەش گرنگە کە بزانین هیچیان لەجیاتی ئەوی تریان بەکارنەهێنین و گومانیشمان وا نەبێ کە گوایە لەڕێی هێزەوە دەتوانین هەموو شتێ بکەین. گەورەترین هێز ئەو هێزە ژیریەیە کە فێرمان دەکات بە شێوەیەکی ژیرانە هێزە جۆراو جۆرەکانمان بە باشی بەکاربهێنین[1].

## لیس الأمر بالقوة

أكَلَ الْعُقَابُ بِقُوَّةٍ جِيَفَ الفَلاَ      وَجَنَى الذُّبَابُ الشُّهْدَ وَهْوَ ضَعِيفُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٧٦):

### (کار بەپێی هێز نیە)

هەڵۆ، بە کەلاك ڕازیە، لەگەڵ ئەو هێزە زۆرە

کەچی، مێش، گەرچی لاوازە، هەمیشە تازە خۆرە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٧٧)

مرۆڤ بە ئاسانی دەتوانێ ڕوکەشی کەسێتی خۆی بگۆڕێت و جۆرەها دەمامك بپۆشێ و بەمەش کەسانی سادەو ساویلکە فریو بدات، دەشێ کەسێکی خراپ، لەپێش چاوی خەڵکی خۆی وەك فریشتەو خواپەرست نیشان بدات، بەلام ناخ و ناوەڕۆکی جۆرێکی تر بێ، ئەم کەسانە کە دێنە لات، بە زمانی لوس و بێ فیزی و جل و بەرگ و هەڵسوکەوتیان دەردەکەون، مرۆڤی ژیر و دانا و خواپەرست زۆر چاك ئەم ڕیابازانە دەناسێتەوە، بەلام کێشەکە بۆ خەڵکی ئاسایی کە لە خواپەرستی

---

(١) ص٦١/لیس الأمر بالقوة/ أكلَ العقاب بقوة جيف الفلا/

ڕاستەقینە و مرۆڤناسی دا قووڵ نەبوبنەوە، توانای ناسینەوەی ئەم کەسانەیان زۆر کەمە و بە ئاسانی فریو دەدرێن.

شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا دەفەرموێت: ئەو جۆرە کەسانە وەلانێ، کە بە ڕواڵەت وەکو چاکەخواز و خواناس دێنە لات و کە ڕۆیشتیشن و لای تۆیان بەجێ هێشت، دەچنەوە سەر کەسێتی یە ڕاستەقینەکەی خۆیان کە گورگن لە پێستی مەڕدا.

عبدالله ی کوڕی محمدی کوڕی جعفر، باسی کردو گوتی: عبدالله ی کوڕی محمدی کوڕی یعقوب وتی: ئەبو حاتەم لە (حەرمەلە)ەوە گێڕاویەتەوە کە شافیعی ئەم هۆنراوەیەی فەرموو[1]:

## التنسك المبطن

وَدَعِ الَّــــذِينَ إِذَا أَتَــــوكَ تَنَسَّــــكُوا وَإِذَا خَلَــــوْ فَهُــــمُ ذِئَــــابُ خِــــرَافِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٧٧):

### (خواناسی لە ناخەوە)

وەلانێ[2] ئەو کەسانەی، دێنە لات، وەك چاکەکار خۆدەنوێنن
کاتێ دەڕۆن، گورگن و لە پێستی مەڕدا، بە فریو نەتخەڵەتێنن

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٧٨)

هەندێ کەس هەیە، ئەگەرچی کەسێکی باشەو بەڕێزە، کەچی لە وڵاتی خۆی و لەناو خزم و دۆستانیدا وەك پێویست قەدر و ڕێزی نازانرێ، کەسەکەش بەوە زۆر خەم دەخوات، شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا باسی هەندێ لەو نمونانە دەکات کە لە جێ و خاك و وڵاتی خۆیان قەدر و ڕێزیان نیە، بێ نرخ و سووك تەماشا دەکرێن، بەڵام کاتێ بۆ شوێنێکی تر کۆچ دەکەن، ئینجا نرخ و بەهاو ڕێز و شکۆی خۆیان وەردەگرن.

---

(١) ص٦٢/ التنسك المبطن/ حدث عبدالله بن محمد بن جعفر.

(٢) وەلانێ: بیانخەرە لاوە، فەرامۆشیان بکە.

کەسی وا هەیە لە فەرمانگە یان کۆمپانیایەکە و لەگەڵ هاوپیشەکانیدا ئەو ڕێز و بەهایەی نیە، دەبا بەجێی بهێڵێ و ڕوو بکاتە شوێن و کارێکی تر، مەیکە بە خەم و مەراق بەوەی کە دور دەکەویتەوە لە خزم و منداڵ و کەس و کارت، عەنبەری خاو لە وڵاتای خۆیدا وەکو پاشەڕۆ و تەپاڵە وایە، کە کۆچ دەکات و دەکرێتە بۆن و بەرامە و مت و موور ئەوسا بەرز دەکرێتەوەو دەدرێت لە سنگ و بەرۆك، بە هەمان شێوە (کل) جۆرە بەردێکە و لەملاولای ڕێگە فرێ دراوە، کەچی کە دەکرێتە (کل) چاوەکانمانی پێ جوان دەکەین و شوێنیشی لەنێوان گلێنە و پێڵووی چاودا دەبێ، ئاوا (کل) لە نامۆییدا ڕێز و شکۆ پەیدا دەکات[1].

## الحض على السفر من أرض الذل

ارْحَلْ بِنَفْسِكَ مِنْ أَرْضٍ تُضَامُ بِهَا ... وَلاَ تَكُنْ مِنْ فِرَاقِ الأَهْلِ فِي حُرَقِ
فَالْعَنْبَرُ الْخَامُ رَوْثٌ فِي مَواطِنِهِ ... وِفِي التَّغَرُّبِ مَحْمُولٌ عَلَى الْعُنُقِ
وَالكُحْلُ نَوْعٌ مِنَ الأَحْجَارِ تَنْظُرُهُ ... فِي أَرْضِهِ وَهْوَ مَرمِيٌّ عَلَى الطُّرُقِ
لَمَّا تَغَرَّبَ حَازَ الفَضْلَ أَجْمَعَهُ ... فَصَارَ يُحْمَلُ بَيْنَ الْجَفْنِ وَالْحَدَقِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٧٨):

### (هاندان بۆ بەجێهێشتنی ئەو خاکەی تیایدا سووکیت)

لەو خاکەدا، تێیدا سووکی، کۆچ بکەو سەرت هەڵگرە
بۆ دابڕانی خزمانیش، ئەوەندە مەسوتێ و مەمرە
عەنبەری خاو، لە زێدی[2] خۆی، هەروەکو پاشەڕۆ وایە[3]
بە کۆچ، برەو پەیدا دەکا، کە لە سەر سینە و دڵایە
(کل) لەجێی خۆی، جۆرە بەردێکی ئاسایە
زۆر و زەبەند، فرێدراوی سەر ڕێگایە

(١) ص٦٣/ الحض على السفر من ارض الذل/ ارحل بنفسك من ارض تضام بها

(٢) زێد: نیشتمان، شوێنی لەدایکبوون.

(٣) پاشەڕۆ: تەپاڵە، پیسی، قشپل، تەرس.

کە کۆچ دەکا، ئەوسا ڕێزی لێ دەگیرێ
لە چاوانا، لەنێوان گلێنەو پێڵو، هەڵدەگیرێ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٧٩)

مرۆڤ کە پەرۆشی فێربوونی زانست و خۆ پێگەیاندن بێت، ئەوا بەوپەڕی لەخۆبوردنەوە کارت دەکات، شەو دەخاتە سەر ڕۆژ، زۆر ماندوو دەبێ لەو پێناوەدا، بەڵام بەو ماندوو بوونەی دەحەسێتەوە، چێژ لەو ماندووبوونەی دەکات، لەگەڵ کارەکەیدا دەبێتە یار و دڵدار، تەپ و تۆزی سەر کتێبەکانی ناگۆڕێتەوە، بە وردە زێڕ و زیو، پشت چەماندنەوەو داکۆمانم بەسەر لاپەڕەی کتێبەکانمدا بۆ خوێندنەوەو نووسینەکەم، زۆر زیاتر چێژی لێ وەردەگرم، لە ڕاوەستانم لەگەڵ یار و خۆشەویستەکەمدا، شەو نەخەوم تا بەیانی، زۆر بەلامەوە خۆشترە لەوەی کە لەباوەش و جێگەیەکی گەرمدابم.

بەڕاستی هەر کەسێك بەم جۆرە لە خەمی فێربوون و زانست و زانیاریدا بێ، پێدەگات، بەڵام لە کوردەواریدا گوتراوە کە (کەچەڵ بەزۆر بنێری بۆ مازوو کردن، لە دار هەڵناڕوانێ)[1].

### جلده في طلب العلم

سَهَرِي لَتَنْقِيحِ الْعُلُومِ أَلَذُّ لي ... مِنْ وَصْلِ غَانِيَةٍ وَطِيبِ عِنَاقِ
وَصَرِيرُ أَقْلاَمِي عَلَى صَفَحَاتِهَا ... أَحْلَى مِنَ الدَّوْكاءِ وَالعُشَّاقِ
وَأَلَذُّ مِنْ نَقْرِ الفَتَاةِ لِدَفِّهَا ... نَقْرِي لِأُلْقِي الرَّمْلَ عَنْ أَوْرَاقِي
وَتَمَايُلِي طَرَباً لِحَلِّ عَوِيصَةٍ ... فِي الدَّرْسِ أَشْهَى مِنْ مُدَامَةِ سَاقِ
وَأَبِيتُ سَهْرَانَ الدُّجَا وَتَبِيتُهُ ... نَوْماً وَتَبْغِي بَعْدَ ذَاكَ لِحَاقِي؟

---

(١) ص٦٣ص٦٤/ جاده في طلب العلم/ سهري لتنفتح العلوم الذلي/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٧٩):

## (کۆشش لە پێناوی زانستدا)

شـــــەو بێـداریییـــم، تـــا بـەیـانی، بـەتامترە و خۆشــە وابم
لـــەوەی کــە نــاز پـــەروەر بــم و لـــە ئــامێزێکی گــەرما بم[1]
جــــــڕەی[2] خشـــانـــی قەڵـەمـــم، بەسـەر لاپـەڕەی نوسـیندا
لـە گـۆرانی ئـــەوینــــداران، شیرین تـرە، لـــە دەروونـــــدا
دەنگـــی دەبیستـــم، کــــە دەیکـــێشم، بە بـەرگی کتێبـەکانا
تۆز، دەورێ، خۆشتـرە لەو دەنگە دەفەی لە دەستی گەورە کچانا
چۆمـانەوەم، بـــــەسەر ئـەو کتێبانـەدا، بـۆ وردەکاری پرسیارێ
خۆشـــترە لام، لـــە زرنگـــەی پیـاڵـــەو پـەرداخـــی نـــازدارێ
شـەونـخـونی و تـــۆرانی تـــاریکی شـەوان، کـە خـووی مـن بـێ
کەچی هێشتا، تۆ دەتەوێ، پێمبگەیت و هەمان پایەی منیشت بێ؟

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٨٠)

تێکۆشان گرنگە، بەڵام لەوە گرنگتر بـە (جدّی)، کارکردنـە لـەم تێکۆشـانەدا، بۆیە هەموو ئەگەرێکی باش و گەورە چاوەڕوان دەکرێت لە کەسی (جدّی)، شـافیعی خ.ل دەفـەرموێت: ئەگـەر بیسـتت کـە کەسـێکی (جـدّی) چـڵە نـەمامێك یـان شـوڵە دارێکی لەسەر لەپی دەستی ڕواند و دواتر بەرهەمی گرت و هاتەبەر، باوەڕ بکـە، وە ئەگەر وتیان کەسێکی دەغەڵ و خـۆدزەرەوە لـە ئـیش و تـەوەزەل، گـەڕا بـە دوای دۆزینەوەی ئاودا تاکو لێی بخواتەوە، کردیە دەمیەوەو لـە قـوڕگی گـیرا و نـەیتوانی بیخواتەوە، باوەڕ بکە، دەفەرموێت: ئەگەر منیش بکەومە سەر فروفێڵ، ئـەوا زانـام

(١) جرە: جیڕە جیڕی دەنگی نوکی قەڵەم لە نووسیندا.

(٢) گەرمابم: گەرمدابم.

بەو فێڵانەو دەتوانم خۆم وا نیشان بدەم کە دەستم گەیوەتە ئەستێرەکانی ئاسمان و خۆم پێوە هەڵواسیوە، بەڵام زۆرجار، زانایی دەبێتە هۆی هەژاری، واتە زانایی و دەوڵەمەندی بە دەگمەن پێکەوە کۆدەبنەوە، زۆرجار گەوج و نەزانەکان تێرو تەسەلن و زانایان خەمبار و خەمخۆرن، بەخشندەیی سیفەتێکی گرنگە بۆ مرۆڤ[1].

**الجد**

فَـإذَا سَـمِعْتَ بِـأنَّ مَجْـدُوداً حَـوَى ... عُـوداً فَـأثْمَرَ في يَدَيْـهِ فَصَـدِّقِ
وَإذَا سَـمِعْتَ بِـأنَّ مَحْرُومـاً أتَـى ... مَـاءَ لِيَشْـرَبَهُ فَغَـاصَ فَحَقِّـقِ
لَـوْ كَـانَ بِالْحِيَـلِ الْغِنَـى لَوَجَـدْتَنِي ... بِنُجُـومِ أقْطَـارِ السَّـمَاءِ تَعَلُّقِـي
لكِـنَّ مِـنْ رُزِقَ الحِجـا حُـرِمَ الغِنَـى ... ضِـدَّانِ مُفْتَرِقَـانِ أيَّ تَفَـرُّقِ
وَأحَـقُّ خَلْـقِ اللهِ بِـالْهَمَّ امْـرُؤٌ ... ذُو هِمَّـةٍ يُبْلَـى بِـرِزْقٍ ضَـيِّقِ
وَمِـنَ الـدَليل عَـلَ القَضَـاء وَحُكْمِـهِ ... بُـؤْسُ اللبيـبِ وطيـبُ عَـيْ الأحْمَـقِ
إنَّ الـذي رُزِقَ اليَسَـارَ فَلَـمْ يَنَـلْ ... أجـراً ولاَ حَمْـداً لَغيْـرُ مُوفَّـقِ
وَالجَـدُّ يُـدْنِي كُـلَّ أمـرٍ شَاسِـعٍ ... والجَـدُّ يَفْـتَحُ كُـلَّ بَـابٍ مُغْلَـقِ

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٨٠):

## (بەڕاستی کارکردن)

ئەگەر بیستت تێکۆشەرێك، لقێ داری لەناو دەستیدا داناوە،
باوەڕ بکە، ئەگەر وتیان ئەو دارەبەری گرتووە، ئێستا دارێکی تەواوە
گەر بیستیشت، کار نەکەرێ، لە تینوانا، بۆ کانیەك، دەهات، دەچوو
ئەگەر وتیان: کانی بینی، باوەڕ بکە نەیتوانی دەمی لێ تەڕکا، ئاوڕۆنەچوو[2]

---

(١) ص٦٤ ص٦٥/ الجد/ فاذا سمعت بان مجدوداً حوى/

(٢) ڕۆنەچوو: واتە بەقوڕگیدا نەچووە خوارەوە، لە قوڕگی گیرا.

گەر بە فرت و فێڵ، بمەوێ، مسۆگەر کەم بۆ خۆم، ژیان
دەتبینم چۆن لە ئاسمانا، دەستم دەگەییە ئەستێران
بەڵام هەرکەس کە زانا بێ، ئەوا دەستکورت و هەژارە
دەوڵەمەندیی، بۆ ئەو نابێ، ئەم دوانە، دوو دژی دیارە
خودا، کاری خۆی ڕەوایە، کەسێك کە تاقی کاتەوە
بەهیمەت بێ لە تەنگانەو، کە ڕۆزیشی کەم کاتەوە
بەڵگەش بۆ قەزای خودایی و ویستی یەزدان
کەمدەستی ژیر و زانایان، خۆشبەختی نەزان و گەوجان
کەسێکیش بەبێ ماندووبوون، بەشە ڕۆزی بێتە دەستی
لێشی نەبەخشێ، لەپێناو، پرسینەوەی ڕۆژی سەختی
تەمای نەبێ، بەشی هەبێ، پاداشتی پەسڵانی هەبێ
با بۆ سوپاسی هیچ کەسیش، لەم دنیا چاوەڕێ نەبێ
بەخشندەیی یە، دەتوانێ تەنگانەکان فراوان کا
هەموو دەرگا داخراوەکان، بەڕووی ژینتدا والا کا

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٨١)

وتراوە، ئەو کەسە زۆر گەمژەیە کە کەسێك سوێند دەدات بۆ ئەوەی نهێنی نەدرکێنێ و پاشان نهێنی خۆی بۆ باس دەکات، لە ڕاستیدا نهێنی خۆت، تایبەتە بە خۆت، بەشێکە لە کەسێتیت، کە سنگی خۆت تەسك و تەنگەبەر بێ و نهێنیەکانی خۆت نەگرێتە خۆی، بۆچی پێت وایە کە سنگی خەڵکی تر فراوانترە بۆ پاراستنی نهێنیەکانی خۆت؟

خۆت دڵسۆزترین کەسیت بۆ خودی خۆت، کەس لە خۆت نهێنی پارێزترینە بۆ نهێنیەکانی خۆت، دڵنیابە هیچ کەسێ نیە سنگی لە سنگی خۆت فراوانتر بێ بۆ

هەڵگرتنی نهێنیەکانت، هەڵەی وا مەکە نهێنی خۆت لە سنگی خۆتەوە ڕووناوس مەکەو مەینێرە بۆ سنگی کەسانی تر، خەڵکی دەرگای زمان و دەرگای سنگیان والآیە بۆ تەخشان و پەخشانی نهێنی ئەم و ئەو، ماڵی خۆت بپارێزە و خەڵکی تاوانبار مەکە[1].

## كتمان الأمور

إذَا المَرءُ أفْشَى سِرَّهُ بِلِسَانِهِ ... وَلاَمَ عَلَيهِ غَيْرَهُ فَهوَ أحْمَقُ

إذَا ضَاقَ صَدْرُ المَرءِ عَنْ سِرِّ نَفْسِهِ ... فَصَدْرُ الذي يُستَودَعُ السرَّ أضيَقُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٨١):

## (پاراستنی نهێنی)

کەسێک بەدەم و زاری خۆی، نهێنی خۆی بدرکێنێ

سەرزەنشتی دەکەن خەڵکی، گەمژەیی بەسەرخۆی دێنێ

کە سنگی خۆی تەنگەبەر بێ، بۆ نهێنی و ڕازەکانی

وەرگر زۆر تەنگە بەرترە، پانتایی سنگ و زمانی

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٨٢)

وەك دەبینرێت، ساڵ بۆ ساڵ، خۆزگەم بە پارە، لە ڕابردوودا کەسانی باش و ڕاستگۆ زیاتربوون تاکو ئێستا، شافیعی لە چاخ و سەردەمی خۆیدا دەفەرموێت: لەناو خەڵکیدا کەسە باشەکان نەماون، ئەوانەی ئێستا هەیە کەسە فێڵبازو زمان لووس و ڕووپاما کارەکانن، ئەوانەش لە ڕاستیدا وەك دڕك بڕندەن کە بەرت دەکەون، لە ڕووکەشیشدا وەکو گوڵ و گوڵزار خۆیان دەنوێنن، جا ئەگەر

---

(١) ص٦٥/ كتمان الأمور/ إذا المرأ أفشى سرّه بلسانه/

پێویستیەکت بەوانە هەبوو، ناچار کرای کە تێکەڵاویان بی، ئەوا خۆت بکە دۆزەخێك تاکو دڕکەکان بسوتێنی.

لەم سەردەمەی خۆشماندا کەسە بێگەرد و سینە پاك و چاکەکان کەمن، زۆرینەی خەڵکی دڕکن و وەکو گوڵ خۆیان نیشان دەدەن، بەڵام تۆ گوڵ بە و هەوڵ بدە دڕکەکان بکەیت بە گوڵ، بەڵام لە هەموو سەردەم و کات و شوێنێك دا کەسانی چاك هەر هەیە، ئەگینا دنیا کاول و وێران دەبوو[1].

## فساد طبائع الناس

لَـمْ يَبْـقَ فِي النَّـاسِ إلاَّ المَكْـرُ وَالمَلَـقُ    شَـوْكٌ، إذَا لَمسُـوا، زَهْـرٌ إذَا رمَقُـوا

فَـإنْ دَعَتْـكَ ضَـروراتٌ لِعِشْـرَتِهِم    فَكُـنْ جَحِيْمَـاً لَعَـلَّ الشَّـوكَ يَحْتَـرِقُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٨٢):

## (خراپی سروشتی خەڵکی)

نـــەمان، ئـــەو خەڵکـە چـاکانە، مەگـەر فێڵبـازو ڕیاکـار
نزیکیـان بـی، دڕك ئاسـان، لـە دورەوەش گـوڵ و گـوڵزار
کـە ناچـاریت وا پێویسـت کـا، هـاودەم بـی لەگـەڵ ئەوانـە
ببـە دۆزەخ، تـا بسـوتێن، ئـەو چـقڵ و دڕکـە تیژانـە

(١) ص٦٥/فساد طبائع الناس/ لم يبق في الناس الاّ المكر والعلق

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٨٣)

شافیعی خ.ل زۆر حەزی لە گەشتگەڕی و شارەزایی وڵاتان بووە و گەلێم شوێن گەڕاوە بۆ فێربوونی زانست و بڵاوکردنەوەی ئاین، واتا ژیانی نامۆیی زۆر بینیوە، ئەزمونی ژیانیشی فێری کردووە کە ڕاستە نامۆیی بەسوودە، بەڵام هەندێ کێشەیشی هەیە، لەو گرفت و کێشانەش هەندێکی هەیە، لەو گرفت و کێشانەش هەندێکی لەم هۆنراوەیەدا باس کردوون، لەوانە:

هاتنە سەر ڕێی دزە و جەردەو تاڵانچییەکان، کە ئەو کاتە زۆر باوی هەبووە، لە سەردەمی ئەمڕۆدا لەسەر ئاستی گروپ و ڕێکخراو هەن و پێیان دەوترێت (مافیا)، هەروەها مرۆڤ لە نامۆیی دا پارەو پولی لێ دەبڕێ، ئەوسا وەکو ئێستا بانك و ڕەوانەکردنی پارەو پول نەبووە، ناچار ئەبوایا داوای قەرزی لە کەسێك بکردایا، ئەوەش وای لە وەرگری قەرزەکە دەکرد کە ملکەچی فرمانی چاك و خراپی قەرزدەرەکە بوایە و هەمیشە منەتباری ئەوی لەسەر شان بووە، یەکێکی تر لەو کێشانەی نامۆیی زەلیلی ئەو کەسەی کە متمانەت پێی هەیە، کەسی نامۆیی زۆر بیری زێد و وڵاتی خۆی و هاوڕێ و ئازیزان و ژن و منالی دەکات، هەمیشە دڵی ترپە و کوتەیەتی، وەکو باڵی شکاوی کۆتر[1].

### حب الأهل والبلاد

| | |
|---|---|
| إِنَّ الغَرِيْـــبَ لَـــهُ مَخَافَـــةُ سَـــارِقٍ | وَخُضُـــوعُ مَـــدْيونٍ وَذِلَّـــةُ مُوْثَـــقِ |
| فَـــإِذا تَـــذَكَرَ أَهْلَـــهُ وَبِـــلادَهُ | فَفُـــؤادُهُ كَجَنَـــاحِ طَيْـــرٍ خَـــافِقِ |

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٨٣):

### (خۆشەویستی خاك و کەس و کار)

نـــامۆ، لـــە دز دەترســـێت و لـــە ملکەچـــبوون بـــۆ قـــەرزدەر
دڵـــی لـــەناو مســـتیدایە، لـــە ریسوایـــی متـــمانـــەدەر
ئـــەو دەمانـــەی کـــەوا یـــادی، زێـــد و کـــەس و کـــاری دەکـــا
دڵـــی، وەکـــو باڵشـــکاوێ، کوتـــەی دێ، فرتـــە فـــرت دەکـــا

---

(١) ص٦٦/حب الأهل والبلاد/ إن الغريب له مخافة سارق/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٨٤)

یەکێك لەو شتانەی کە چاوبرسی و تێنەخۆرەکان لەم دنیایەدا لێی دەترسن، ڕزق و ڕۆزیە، وا دەزانن ئەوەی هەیانە، خۆیان پەیدایان کردووە، پشت بە خودا نابەستن و ئەوەیان بیرچۆتەوە کە هەر خودا ڕۆزیدەرە، شافیعی دەفەرموێت: ئەو بەشەی کە ڕزق و ڕۆزی من بێ، ئەوا کەس ناتوانێ بیخوات و هەر بۆ من دەبێ، ئەگەر ئەو بەشەم لە بنی دەریا قوڵەکانیشدا بۆ دانرا بێ، بەلای خوداوە ئاسانە و بۆم دێنێتە سەر وشکایی زەوی، گەرچی من هەر بە زمانیش جوڵەیەکم بۆ نەکرد بێ و داوام نەکردبێ، ئیتر کەواتە چی ماوەتەوە تاکو من خۆزیا و بریای بۆ دەربڕم؟ خۆ خودا بۆ خۆی بەشە ڕۆزی هەموو زیندەوەرانی بڕیوەتەوەو داناوە؟

ڕۆزی نابارێ تا بەدوایدا نەچی، تەڕ نابیت تا نەچیتە بەرباران، ناسوتێی تا نزیکی ئاگر نەبیتەوە، بەڵام بە دوریشی مەزانە کە لە وشکاییشدا تەڕ ببیت و ئاگریش خۆی بەرەو ڕووت بێت و بسوتێیت.

کەواتە ژیان بە یاسا دەڕوات، هەندێ شتیش هەیە دەگمەنن و لە دەرەوەی (باو) و یاسان[١].

### التوكل في طلب الرزق

تَوَكَّلْتُ فِي رِزْقِي عَلَى اللهِ خَالقي ... وَأَيْقَنْتُ أَنَّ اللهَ لاَ شَكَّ رَازِقِي

وَمَا يَكُ مِنْ رِزْقِي فَلَيْسَ يَفُوتَني ... وَلَوْ كَانَ فِي قَاعِ البِحَارِ العَوامِقِ

سَيأْتي بِهِ اللهُ العَظيمُ بِفَضْلِهِ ... وَلَوْ لَمْ يَكُنْ مِني اللِسَانُ بِنَاطِقِ

فَفي أي شيءٍ تَذْهَبُ الْنَفْسُ حَسْرَةً ... وَقَدْ قَسَمَ الرَّحْمَنُ رِزْقَ الخَلاَئِقِ

(١) ص٦٦/ التوكل في طلب الرزق/ توكلت في رزقي على الله خالقي/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٨٤):

## (پشت بە خودا بەستن لە داوای ڕۆزیدا)

لە پەیداکردنی ڕۆزیم، پشتم بە خودام بەستووە، کە منی بەدی هێناوە
زۆر دڵنیـــام، بێگومـــان ئـــەو ڕۆزیـــدەرمە، ئـــاواش دڵـــم ڕاهێنـــاوە
ئەوەی کەوا بەشی من بێ، دڵنیام هەر بۆ من دەبێ، ڕانابورێ بەسەرمدا
نەك لە وشكایی زەوی دا، بەڵكو ئەگەر لەبن دەریای قوڵیشا بۆم دانراوە
خوای گەورە، خۆی بۆم دەنێرێ، بە زمانیـش گــەر داوام لێ نەكرد بێ
ئــیتر بۆچـــی مـــن خـــەم بخـــۆم، ئـــاخ و داخ بێنمـــە ئـــاراوە
كاتـــێ ئـــەو خـــوا میهرەبانـــە، بـــۆ هـــەموان بەشـــی دانـــاوە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٨٥)

ژیری بەهرەیەكی گەورەیە، كە خودا پێی داوین، بەڵام مەرجیش نیە، هەموو شتێ هەر بە ژیری یان بە تەنها بڕیاری عەقڵمان بیكەین، بۆ نموونە: كەسی وا هەیە زۆر ژیر و زیرەكە بەڵام ڕزق و ڕۆزیشی كەمە، هەروەها كەسی تریش هەیە كە بە پێچەوانەوەیە، ئێمە لەچاو زانایی خوداوە، زۆر نەزانین، لە ئاستی شێت و كەم ژیرانین، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا خودا هەر ڕۆزی داوین، ئەوەتا دەژین و نەفەوتاوین.

سۆز و ژیری دوو شتی پێچەوانەن لە ناخماندان و بەردەوام لە ململانێدان، دانایی و دەوڵەمەندیی ئەوەیە بزانین بەشێوەیەكی حەكیمانە (ژیری) و (سۆز)مان بە باشی بەكار بهێنین لە ڕووی بڕ و شوێنەوە[1].

---

(١) ص٦٦ ص٦٧/ ليس كل شيء بالعقل/ لو كنت بالعقل تعطي ما تريد اذن/

## ليس كل شيء بالعقل

لَوْ كُنْتَ بِالعَقْلِ تُعطى مَا تُرِيدُ إِذَنْ  لَمَا ظَفِرتَ مِنَ الدُّنْيا بِمَرْزُوقِ
رزقتَ مَالاً عَلَى فَعِشْتَ بِهِ  فَلستَ أَوَّلَ مَجْنُونٍ ومَرزُوقِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٨٥):

### (هەموو شتێ بە پێی ژیری نییە)

ئەگەر، تۆ، بەپێی ژیری خۆت، ئەوەی هەتە پێت درا بێ
ئەوا، لەم دنیا گەورەدا، تۆزقاڵێ لە ڕۆزیت نابێ
ڕۆزی درای، ئەوا دەژی، بەو نەزانینەی خۆشتەوە
یەکەم کەس نیت، کە نەزان بی و ئاوا ڕۆزیشت درابێ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٨٦)

کەسانێك هەن، هەموو شتێکیان هەر بە پشتبەستنە بە نووسین و کتێب، واتا زانست و زانیاریان وەك پێویست وەرنەگرتووە، یان لەبەر نەکردووە، ئەوە زانستە کە لە سنگت دایە، نەك ئەوەی لە کتێب و نوسراو و کتێبخانەکەت و سیپ (صندوق)ی کتێبەکانتدایە، ئەگەر کتێبەکەت لێ برا، یان لێت ون بوو، مانای ئیتر هیچ نازانی، کەواتە زانست ئەوەیە کە لەبەرتە، لە ژیانتدا ڕەنگی داوەتەوە، جا لە هەر شوێن و جێگایەکیت[1].

## العلم ما حفظت

عِلْمِي مَعِي حَيْثُمَا يَمَّمْتُ يَنْفَعُني  قَلْبِي وِعَاءٌ لَهُ لا بَطْنُ صُنْدوقِ
إن كُنْتُ فِي البَيْتِ كَانَ العِلْمُ فِيهِ مَعِي  أَوْ كُنْتُ فِي السُوقِ كَانَ الْعِلْمُ فِي السُوقِ

---

(١) ص٦٧/ العلم ما حفظت/ علمي معي حيثما يممّت ينفعني/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٨٦):

## (ئەوە زانستە کە لە سنگتدایە)

لـە هـەرجێ بم[1] ، زانستـــی خـــۆم، ئەوەیـە کـە لـە دڵمایـە
بەســـوودە بـۆم، نـەك ئـەوەی لـەناو کتێـب و لـە (سـیپ)ایە[2]
ئـــەو دەمانـەی لـە ماڵـەوەم، وا زانـــستم لـــەلای خۆمـە
کــاتێکیش کــە دەچمــە بـــازاڕ، زانستــم لـە بازاڕایـە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٨٧)

ڕێکدەکەوێت، کەسێك بە مەبەستی کاروباری چاك هەنگاو دەنێ، لە ناخەوە نیازی پاکە، کەچی دواتر بە شەڕ و خراپە بەسەریدا دەشکێتەوە، تۆ خەم لەو بارە مەخۆ، چونکە بە دەستی ئەنقەست ئەوەت نەکردووە، لە نیاز و نیەتیشدا نەتویستووە کە ئەوە، ئاوا، ڕوویدات، ئێستاش خەمباریت و پێت ناخۆشە، کەواتە ئەمە شەڕێکی بەرنامە بۆ داڕێژراو نیە، بەڵکو شەڕێکی لابەلاییەو یەخەی گرتویت، هێشتا دەرفەتی خۆلادانیت ماوە، شەڕ بەرەو ڕووت هات تۆش لێی ڕاکەو خۆی تێوە مەگلێنە.

تەنانەت زۆربەی کات چاکەکاری دەبێتە مایەی ماندووبوون بۆ مرۆڤ، پاداشتەکەش لەوەدایە کە پێوەی ماندوو ببیت[3].

## الضر من غير قصد

رَامَ نَفْعَاً فَضَرَّ مِنْ غَيْرِ قَصْدِ          وَمِنَ البِرِّ مَا يَكُونُ عُقُوقَا

---

(١) لەهەرجێ بم، لە هەر جێگەیەك بم، لە هەر شوێنێ بم.

(٢) سیپ: صندوق.

(٣) ص٦٧/ الضر من غير قصد/ رام نفعاً فضر من غير قصد/

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٨٧):

## (زیان بەبێ ئەنقەست)

من، بۆ خێر، چووم، بێ ویستی خۆم، شەڕ هات و یەخەی پێ گرتم

چـاکەش هـەیـە، بـــۆتە مایـەی، ئـێش و ئـازار و حەسـرەتم

### دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٨٨)

هەموو کەسێ، پێویستی بە کەسانی تر دەبێ، یەکەم کەسیشت کە ئیشت پێی دەبێ، خۆتی. بۆیە هەتا دەتوانی ئەوەی بە خۆت دەکرێت، خۆت بیکە، داوا لە خەڵکی مەکە، بۆ راپەڕاندنی کاروبارت، نینۆکی دەستی هیچ کەسێ هێندەی نینۆکی خۆت بە باشی لەشت ناخورێنێ، کەواتە با کاروبارت لەژێر جڵەوی خۆتا بێت، ئەگەر پێویستیەکت ویست، یەکسەر ڕوو لە خەڵکی مەکە، هانا بۆ خەڵکی مەبە، زۆرن ئەو کەسانەی، کە توانای چاکیان هەیە، بەڵام توانای خۆیا نەدۆزیوەتەوەو نەناسیوە، تۆ هەوڵ بدە تواناکانی خۆت بناسیت و بیانخەیتە گەڕ، قەدر و ڕێزی تواناکانی خۆت بزانە و بە کەم تەماشایان مەکە، پێیان ڕازی بە، هەوڵی بەهێزکردنیان بدە، هەروەکو شافیعی خ.ل دەفەرموێت[١].

**اعمل بنفسك**

مَـا حَـكَّ جِلْـدَكَ مِثْـلُ ظُفْـرِكَ فَتَـوَلَّ أَنْـتَ جَمِيـعَ أَمْـرِكَ

وَإِذَا قَصَـدْتَ لَحاجَـةٍ فَاقْصِـدْ لِمعـترفٍ بِقَـدْرِكَ

---

(١) ص٦٨/ اعمل بنفسك/ ما حكّ جلدك مثل ظفرك/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٨٨):

## (بۆ خۆت کاری خۆت بکە)

نینــۆکی کــەس، بــۆ لەشــخوران، وەکــو نینــۆکی خــۆت نابــێ
دەی کەواتــە، کاروبــارت، بــا هــەمووی لــە دەســت خــــۆتا بــێ
کــــە دامــــای بــۆ پێویســـتیەك، جــــاری بــــە خــــــۆتا بڕوانـــە
تــا خــۆت هــەبی، هانــا مەبــە، ڕێــزی توانــای خــۆت بــزانە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٨٩)

خەڵکی زۆر هەوڵ دەدەن کە بگەنە ئەوپەڕی پلەی بەرزی دەوڵەمەندیی، بـەڵام زۆربەیان بەو داخەوە دەمرن و بـەو ئاواتـە ناگـەن، شـافیعی خ.ل دەفـەرموێت: مـن وای بۆ دەچم کە قەناعەت سەری لوتکەی دەوڵەمەندیە، بۆیـە قەناعـەتم بـەو بەشـە کرد کە هەمە و توند باوەشم کرد بە بەلکەکانی چارۆکەی قەناعەت، بەو هۆیەشـەوە هانـام بـۆ کـەس نـەبرد، داوای پێویسـتیم لـە کـەس نـەکرد، نـە بـە پێـوە، نـە بـە دانیشتنەوە هـیچ کەسـێ منـی لـە بـەردەرگای خـۆی نـەدیوە کـە بـۆ شـتێك لێـی پاڕابمــەوە، بەســاقەو بــە قوربــای کــەس نــەبوم، کــە ئــاوا بــووم، ئــیتر بوومــە دەوڵەمەندترین کەس لە قەناعەتدا، واتـە دەوڵەمەنـدترین کەسـی بـێ پـارەو پـوول، ئیتر خەڵکی وامدەبینن کە پاشام، خۆشم هیچم لە پاشا کەمترە، چونکە ئاسودەم و قەرزدار و منەتباری کەس نیم[1].

### القناعة

رَأَيْــــتُ القَنَاعَــــةَ رَأْسَ الغِنَــــى ... فَصِــــرتُ بِأَذْيَالِهَــــا مُتَمَسِّــــك
فَــــلاَ ذَا يَرَانــــي عَلَــــى بَابِــــهِ ... وَ لاَ ذَا يَرَانــــي بِــــهِ مُنْهمِــــك
فَصِــــرْتُ غَنِيــــاً بِــــلاَ دِرْهَــــمٍ ... أمــــرُّ عَلَــــى النَّــــاسِ شِــبْهَ المَلَــك

(١) ص٦٧/ القناعة/ رأيت القناعة رأس الغنى/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٨٩):

**(قەناعەت)**

مـــن، وام بینـــی کـــە قەناعـــەت، ســـەر لوتکـــەی دەوڵەمەندییـــە

بـــۆیە، دەستـــــــەو دامـانی بـووم، لـە دەسـتم گـرت لکـەکانی

لـە سـایەیدا هـیچ کــــەس، لەبـەر دەرگـای خۆیـدا، منـی نـەدی

کـــە داوایـــەکم لێـــی هـــەبێ، ببمـــە ســـاقەو بـــە قوربـــانی

کـــەس بـــە شـــەکەتی نەیـــدیوم، بـــە چـــۆکەوە لەبـــەردەمیا

بـــەوەش، بـــوومە دەوڵەمەنـدیك، لـــە بـــێ پـــارەیی و ســـامانی

لـــەلای خـەڵکـــیش نیمچـــە پاشـــام، وا دێمـــە بـــەر نیگاکـــانی

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٩٠)

زۆر خەمبار دەبیت، کە تۆ بە کوڵ، لە نـاخی دڵتـەوە کەسێکت خـۆش دەوێ، کەچی ئەو بۆ تۆ وا نیە، بەڵکو ئەو کەسێکی تـری خـۆش دەوێ، یـاخود تـۆ خێـر و بێر و قازانجت بۆ کەسێك بوێ، کەچی ئەو هەمیشە زیان و نوشوسـتی تـۆی بـۆی و بە سەرنەکەوتنت دڵخۆش بێ[1].

### رد الجميل بالسيء

وَمِـــــنَ الشَّـــــقَاوَةِ أن تُحِـــــبَّ      وَمَـــــنْ تُحِـــبُّ يُحِـــبُّ غَيْـــرَكَ

أو أنْ تُرِيـــــدَ الخَـــــيرَ للإنـــــ      ســـانِ وَهُـــوَ يُرِيْـــدُ ضَـــيْرَكَ

(١) ص٦٨/ ردّ الجميل بالسيء/ ومن الشقاوة ان تُحبَ/

دەقی هۆنراوەی ژمارە (٩٠):

(خراپ کاردانەوە بەرانبەر چاکەکاری)

لاساریە، خۆشت بویّ، کەچی ئەوەی خۆشت دەویّ، ئەو تۆی نەویّ
یان خێرت بۆ کەسێ بویّ، ئەو، نشوستی و زیانتی بویّ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٩١)

زانا ئەو کەسەیە کە کردارەکانی زانایانەیە، نەك ئەو کەسەی کە لێزانە لە قسەو وتارداناو دەمی گەرمە لە قسەکردندا، سەرۆکیش ئەو کەسەیە کە ڕەوشتی سەرکردانەیەو ڕەوشت بەرزە، نەك ئەو کەسەی کە خاوەن دەسەلات و گەل و پیاوی زۆر و پاسەوانە، دەولەمەند ئەو کەسەیە کە حاڵ و گوزەران و دڵی دەولەمەندانەیە، نەك ئەو کەسەی کە سەروەت و ماڵ و سامانی زۆرە[1].

## تعريف الفقيه وارئيس والغني

إِنَّ الفَقِيْـهَ هُـوَ الفَقِيـهُ بِفِعْلِـهِ — لَـيْسَ الفَقِيْـهُ بِنُطْقِـهِ وَ مَقَالِـهِ
وَكَـذَا الـرَّئِيسُ هُـوَ الـرَّئِيسُ بِخُلْقِـهِ — لَـيْسَ الـرَّئِيسُ بِقَومِـهِ وَرِجَالِـهِ
وَكَـذَا الغَـنِيُ هُـوَ الغَـنِيُ بِحَالِـهِ — لَـيسَ الغَـنِيُ بِمُلْكِـهِ وَبِمَالِـهِ

دەقی هۆنراوەی ژمارە (٩١):

(پێناسەی زانا و سەرۆك و دەولەمەند)

زانا، کەسێکە، کە کرداری بێ
نەك، وەستای بێژە، یا وتاری بێ

(١) ص٦٩/ تعريف الفقيه و الرئيس والغني/ ان الفقيه هو الفقيه بفعله/

ســـــــەرۆك ئەوەيـــــــە، ڕەوشـــــــتى هەيـــــە
نـــــەك، ئـــــەوەی هـــــۆز و كـــــەس و كـــــاری بـــــێ
دەوڵەمەنـــــد، ئـــــەوەی كـــــە دانـــــای حاڵـــــە
نـــــەك، كەســـــێ پـــــارەو موڵـــــك و مـــــاڵی بـــــێ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٩٢)

(ڕەبیع) دەڵێ: گوێم لێ بوو كە شافیعی خ.ل فەرمووی: لە دوای پێغەمبەر د.خ باشترین كەس (أبوبكره)ە، دوای ئەو (عمر) ئینجا (عثمان) پاشان (علی)، (ربیع) دەڵێ شافیعی ئەم هۆنراوەیەی بۆ گوتم:

با خەڵكی لە خۆیانەوە فەتوان نەدەن، بۆ ئەوەی داهێنانی خراپ (بیدعە) نەكەن لە ئایندا و لە خۆیانە و ڕاوبۆچوونی خۆیان بەبێ بنەما تێكەڵی ئاین نەكەن لە بارەی ئەو شتانەوە كە بە پێغەمبەر د.خ ڕانەگەیەنراوە.
با سوكایەتی بە مافی خودا نەكرێ، وە هاوكات شتی زیادەو باری گرانیش نەخرێتە سەر شانی خەڵكی[1].

لَـمْ يَفْتَـا النَّـاسُ حتَّـى أحـدثُوا بِـدَعاً ... في الدِّينِ بِالرَّأْيِ لَمْ يَبْعَـثْ بِهَـا الرُّسُـلُ
حَتَّـــى اســـتَخَفَّ بِحـــقِّ اللهِ أكثَـــرُهُمْ ... وَفِـي الَّـذي حَمَلُـوا مِـنْ حَقِـهِ شُـغُلُ

(١) ص٦٩/وقال الربيع سمعت الشافعي يقول: افضل الناس...

دەقی هۆنراوەی ژمارە (٩٢):

## (لەخۆڕا فەتوا مەدەن)

بـــا لــــە خـــــۆڕا فـــەتـــــوا نــــەدرێ
نـــەبــــــادا بیدعـــــــــە داهێنــــــــرێ
یـا ئـــەم دینـــە، ئــارەزووی تێکـــەڵاو بـــــکرێ
لــــــە کـــــاتێـکـــــا لـــــــەو بـــــارەوە
هـــیچ نیگایـــێ بـــۆ پێغەمبـــەر نـــەهاتبــــێ
نـــەبــــــادا، زۆربـــــــەی ئـــــــەو خەڵکــــــە
سوکایەتــــی بـــە مـــافی خـــودا پـــێ بـــــکرێ
یـــــا کـــــەسێ شایســـــتەی مـــــاف بـــێ و
بـــەڵام مافـــــی لـــەبن پێـــدا شکســـت بکـــرێ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٩٣)

هەنـدێ مـرۆڤ هەیـە، حـەز دەکـات زۆر خـۆی مانـدوو بکـات، زێـدەڕەوی لـە بەکارهێنانی توانا جۆراو جۆرەکانی خۆیدا دەکات، زێدەڕەوی لە عەقڵ و جەسـتە و دینی خۆیدا دەکات، تاکو وای لێ دێت دەبێتە کەسێکی توندڕەو و خۆیشی بەدیندار و خواناسی دەزانێ، بەڵام وردە وردە لـە دیـن دور دەکەوێتـەوە و لـە تونـدو تیژیـدا قـووڵ دەبێتـەوە، ئەوسـا نـەك سـوود بـەخۆی نەگەیـەنێ، بـەڵکو نـاوەڕکی ئـاینی ئیسلامیش ناشیرین دەکات، بۆیە شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا بە جوانی ڕێنماییان دەکات بەوەی کە باری گران نەکەیتە کۆڵمـان، جەسـتەو گیـان و دەرون و ژیریمـان ئەوەندەیان ئەرك لەسەر دابنێین کە لە تواناماندایە، بـەوەش لـەش و تەندروسـتی و ژیانت ئاسودەییانە و سەلامەت دەبێ، وتەو قسەکانت جوان و شیرین و نەرم دەبێ، کوێخایەتی و سەرکردایەتی خەڵکی مەکە، مەگەر کاتێك دڵنیا بـی کـە لـە تـۆ باشـتر نیە و ئەگەر ئەرکی بەرپرسیارێتی نەگریتە خۆت، گوناهبار دەبی، یان بۆ (مجاملـە)

لەگەڵ دۆستانت ئەوە بکە، چونکە بەدور نازانرێ ڕوداوی زەمانە لە بەرژەوەندی تۆ نەبێ، یان هاوەڵێکت بێ وەفاییت بەرانبەر بکات.

که ڕزق و قازانج و ڕۆزی ئەمڕۆ، کەم هات بە دەستتەوە، پەلە مەکەو چاوەڕێ بە بۆ سبەینێ، لەوانەیە نەگبەتی و کێچەڵی زۆرت بەو هۆیەوە لەسەر لابچێت، هاوڕێیەتی و تێکەڵاوی مرۆڤی هەمەڕەنگی، هەمە ڕووی، هەمە ڕەفتار مەکە، چونکە ئەو جۆرە کەسانە لە کوێوە (با) بێت لەوێوە شەن دەکات. واتە خۆ هەڵدەقورتێننە هەموو کاروبارێکەوە، قازانج و بەرژەوەندییان چۆن بێ وا دەکەن، لە پەندی کوردیشماندا بەو جۆرە کەسانەو لەسەر زمانی ئەوان وتراوە (هەڵدەپەڕم، سەما دەکەم، زەمانە چۆن بێ، وا دەکەم) بە زۆری ژمارەی هاوڕێکانت فریو مەخۆ، کە لە ڕاستیدا لە کاتی هاودەمی و تەنگانەدا کە من و نایەت بەدەمتەوە[1].

## حمل النفس على ما يزينها

صُنِ النَّفْسِ وَاحْمِلَهَا عَلَى مَا يَزِينُهَا ... تَعِشْ سَالِماً وَالقولُ فيكَ جَمِيلُ
وَلا تُولِيَنَّ النَّاسَ إلاَّ تَجمُّلاً ... نَبا بِكَ دَهْرٌ أو جَفَاكَ خليلُ
وإنْ ضَاقَ رِزْقُ اليومِ فَاصْبِرْ إلى غَدٍ ... عَسى نَكَبَاتُ الدَّهْرِ عَنْكَ تَزولُ
وَلا خَيْرَ في وِدِّ امرِيءٍ مُتلوِّنٍ ... إذَا الرِّيحُ مالَتْ، مَالَ حيْثُ تَميلُ
وَما أكثَرَ الإِخْوانِ حِينَ تَعُدُّهُمْ ... وَلكِنَّهم في النَائِبَاتِ قَلِيلُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٩٣):

## (کۆڵێك هەڵبگرە، کە بەرگەی بگریت)

دەروونی خۆت بپارێزە، بە کێشی خۆی ئەرکی بەرێ
بێوەی دەبی، وشەی زێڕین، لە ناختدا دێتە دەرێ
مەبە، بڕیاردەر بۆ خەڵکی، مەگەر کۆدەنگی پێت بڵێ

---

(١) ص٧٠/ حمل النفس على ما يزينها/ صن النفس واحملها على ما يزينها

وریـــای خـــۆت بـــە، لـــە زەمانـــەو لـــە هـــاورێی خـــراپ و نـــەرێ
ئـــەمڕۆ، کـــە ڕۆژیـــت بـــــەرتەنگە، ئارامێـــك بگـــرە تـــا ســـبەی
دوورنیـــــە، دەوری زەمانـــــە، ئـــەو خەمـــەت لەســـــەر لابـــەرێ
لـــە تێکـــەڵاوی، کەسێـــــــکی هـــــــەمەباردا، خێـــر نـــابینی
کـــە (بـــا) لادا، بەهـــەر لادا، چـــــی هـــــەیە، دەیداتـــە بـــەرێ[1]
بـــە زۆریـــی ژمـــارەی دۆستـــــــان، فریـــــــو نـــــەخـــــــۆی
کـــە مـــن، ئـــەو کەســـە چـــاکانەی، لـــە تەنگانـــە بێنـــە بـــەرێ[2]

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٩٤)

زەمانە و ڕۆژگار، مامۆستان بۆ پەند دادان و فێربوونمان، تا زیاتر بژین، زیاتر پەند و وانە لە ئەزموونی ژیانەوە فێر دەبین، تا ئەزموونیشمان زیاتر بێ، زیاتر زانا دەبین، تا زاناتر بین، زیاتر وردەکاریەکان پەی پێ دەبەین و هەست بە کەموکورتیەکانی خۆمان دەکەین، بە تایبەتی بە چاکی هەست بەوە دەکەین کە لە ئاستێکی زۆر نزمی زانیندایین، بە بەراورد لەگەڵ زانایی خودای میهرەبان، ئەوەش پلەیەکی بەرزە کە تواناکانی خۆی، پاشان هەوڵ بدات بۆ گەشەپێدانی خۆی، هەمیشە زانایانن کە خۆیان بە نەزان دەزانن و تێدەکۆشن، نەزانەکانیش خۆیان بە زانا دەزانن و بێ خەم لێی دادەنیشن[3].

### تواضع العلماء

| | |
|---|---|
| كُلَّمَـــا أدَبَـــني الدَهْـــــــ | ـــرُ أرَانـــي نَقْـــصَ عَقْلِـــي |
| وَإِذَا مَـــــا ازْدَدْتُ عِلْمَـــــاً | زَادَنِـــــي عِلْمَـــاً بِجَهْلِـــي |

(١) دەیداتە بەرێ: دەیداتە بەر خۆی، لەگەڵ خۆی دەیبات و لەپێش خۆیەوە ڕایدەماڵێ.

(٢) بێنە بەرێ: واتە بێنە بەر نیگا، بێنە بەرەوە، بێنە ناو کایەی گۆڕەپانی فریاکەوتن لە تەنگانەدا.

(٣) ص٧٠/ تواضع العلماء/ كلما أدبني الدهر

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٩٤):

## (خۆبەکەم زانی زانایان)

هـــــەتاکو زەمانـــــە زیـــــاتر، پەنـــــدی باشـــــتری دادابم
بەکـــــەم و کـــــورتی ژیـــــری خـــــۆم، ئاشـــــناتر بـــــووم
هـــــەتا زیـــــاتر، لەفێربوونـــــی زانـــــستا بـــــووم
بـــــە زانینـــــی، نـــــەزانینـــــم، زانـــــاتر بـــــووم

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٩٥)

گەلێك جار، کەسێك زۆر خەم دەخوات لەوەی کە نەیتوانیوە ببێتە کەسێکی خوێندەوار و خاوەن بڕوانامە، لە کاتێکدا خۆی بەرپرسە لە خۆی و ئێستاش دەرفەتی ئەوەی لە بەردەستا ماوە کە بخوێنێ و خۆی شارەزا بکات، چونکە لە بنەڕەتدا هیچ کەسێ بە زانایی و فێربوویی لەدایك نابێت، بەڵکو ژیان و سروشت مرۆڤ فێر دەکات، هەوڵدە، فێربە، خۆشت دەزانی کە هەرگیز زانا و نەزان وەکو یەك نین، کەسێك کە زانا و ژیر و خوێندەوار بێ، لەناو خەڵکیدا زۆر گەورەیە گەرچی بە بالا و جەستەش بچووك بێ، بێ هێز و بێ هۆز و بێ کەس و کاریش بێ، بە پێچەوانەوە گەورەی هۆز و گەل و سەرکردەو بەرپرس کە نەزان بوو، لەپێش چاوی خەڵکی هەر بە کەم و بچوك دێتە بەرچاو، بچوکترین کەسی گەل و هۆز و تیرەش ئەگەر خوێندەوار و زانابێ ئەوا دەبێتە کەسێکی گەورە.

فێربوون، بە هەوڵدان و کۆششە، گەورەترین و پیرۆزترین کارە لە ژیانی مرۆڤدا، ئەگەر نەتتوانی بخوێنی و فێر بی ئەوا هاندەرێکی باش بە بۆ ئەوەی خەڵکی لە هەوڵی فێربوونی زانست و ئاین و ڕۆشنبیری و پیشەیی دا بن[1].

---

(١) ص٧٠ ص٧١/ المرء بما یعلمه/ تعلم فلیس المرء یولد عالماً

## المرء بما يعلمه

تَعْلَّمُ فَلَيْسَ المَرْءُ يُولَدُ عَالِماً ... وَلَيْسَ أخو عِلْمٍ كَمَنْ هُوَ جَاهِلُ

وإنَّ كَبِيرَ القَوْمِ لاَ عِلْمَ عِنْدَهُ ... صَغِيرٌ إذا الْتَفَّتْ عَلَيهِ الجَحَافِلُ

وَإنَّ صَغيرَ القَومِ إنْ كَانَ عَالِماً ... كَبيرٌ إذَا رُدَتْ إليهِ المَحافِلُ

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٩٥):

## (مرۆڤ بە زانینە)

فێربە، هیچ کەس، بە زانایی، نەهاتۆتە ئەم دنیایە

سەرنجێ دە، کەی زانا، وەك نەزان وایە

گەر زانایی لە ناخیدا نەبێ، سەر هۆز

گچکەیە لە ئاست ئەوانەی گەنجی زانیاریان لایە

گچکەی هۆزیش، کە زانا و ژیر و دانا بێ

زۆر گەورەیە، لەو کۆڕەی گەورەی تێدایە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٩٦)

هەموومان حەز دەکەین، کاروبارمان بەجێ و جوان بێ، وتەمان بەهێز و زمانمان ڕەوان بێ، واتە شارەزای حیکمەت بین، بەڵام هەوڵیشی بۆ نادەین، هەموو هۆش و کۆشمان بۆ ماڵداری و خێزانداریە، ساتێك خەریکی پێگەیاندنی خودی خۆمان نابین، هەتا وابین، دڵنیابین، کە خێری حیکمەت نابین، گەنج و لاویش ئەگەر هۆش و بیری بە زانست و فێربوونەوە سەرقاڵ نەکرد، مێشکی دایە شتی لابەلایی ئەوا فێری زانست نابێ، یەکێکی تر لە کۆسپەکانی ڕێی خوێندن و فێربوون، هەژاری و دەست کورتیە، شافیعی خ.ل دەفەرموێ: تەنانەت ئەو لوقمانی حەکیمەی کە گەورەترین حەکیم زانا لەبن شکۆی پڕ لە حیکمەتی ئەودا بوو، نەیدەتوانی بەو

جۆره بوایە، ئەگەر هەژار و دەست کورت بوایە، بەڕادەیەك نەزان دەبوو کە جیاوازی نەدەکرد لەنێوان پاقلەو توێکڵە پاقلەدا، کەواتە توانای ماددی و پارەو پول هۆیەکن بۆ فێربوونی مرۆڤ بە حیکمەت، هاوکات حیکمەتیش هۆیەکی ترە بۆ پارەو پەیداکردن و کاسبی سەرکەوتووانەو فێربوونی زانست و زانیاری بە مەرجێ کەسەکە خۆی ئارەزووی فێربوونی زانستی هەبێ و هەوڵی بۆ بدات[1].

## يأتي العلم بالتفرغ

لاَ يُــدْرِكُ الحِكْمَــةَ مِــنْ عُمْــرُهُ  يَكْــدَحُ فِي مَصْــلَحةِ الأهــلِ
وَلا يَنَــالُ العِلْــمَ إلاَ فَتــىً  خَــالٍ مِــنَ الأفْكَــارِ وَالشُّــغْلِ
لَــوْ أنَّ لُقْمَــانَ الحَكِــيمَ الــذي  سَــارَتْ بِــهِ الرُّكْبَــانُ بِالفَضْــلِ
بُلــي بِفَقْــرٍ وَعِيَــالٍ لَمَــا  فَــرَّقَ بَــيْنَ الــتِّبنِ وَالبَقْــلِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٩٦):

### (زانست دابڕانی دەوێ)

نـاگـاتـە حیکمەت، ئـەو کەسەی کەوا تەمەن و ژینی خۆی
مـانـدوو دەکـا، تـەنـهـا بـۆ متـاڵ و خـزمی خـۆی
بـۆی گـەلاڵـە نابـێ زانسـت، ئـەو مرۆڤـە تێنەکۆشـەی
لە لاویدا دەست پێنەکا، سەرقاڵ نەکا، تەرخان نەکا، بۆی بیری خۆی
گەر ئەو لوقمانی حەکیمەی سوارچاك لەبەر شکۆی دابوو، هەژار بایا[2]
نـەیدەزانـی کـامە (توێکڵ)ەو کامەشیان (پاقلە)ەکەیە خۆی

---

(١) ص٧١/ يأتي العلم بالتفرغ/ لا يدرك الحكمة من عمره/

(٢) هەژار بایا: هەژار بوایا.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٩٧)

پاشا و فەرمانڕەواکان هەمیشە بەڵاو گێچەڵن، تا لە حوکمدان ستەمکارن، کە لابران و ڕووخان وڵاتێکی وێران لەدوای خۆیان بەجێ دەهێڵن، جا تۆ ئەگەر خۆت بەلاوە بەنرخە مەبە ماستاوچی و پیاوی ئەوان، هەرگیز لە بەردەرگای کۆشکیان مەکەوە، دامەنیشە، چاوەڕێ مەبە، نەهێڵی سێبەری دەرك و دەروازە و کۆشك و تەلاری ئەوانە بێتە سەر سەرت، ئەو پاشایانە بە خۆیان و دەست و پێوەند و کەسوکارخانەوا دەیانەوە خێرو بێریان لێ چاوەڕوان ناکرێ، چونکە کاتێك تووڕە دەبن هەڵمەتت بۆ دێنن، کە ڕەخنەیان لێ دەگری تووڕە دەبن، تووڕەت دەکەن، کە دەتەوێ ڕازیشیان بکەیت هەرگیز ڕازی نابن، بەوەی تۆ بۆت کردون، هەمیشە بە چاوی کەمتر لە خۆیان سەیری تۆ دەکەن، ئەوان وەکو مرۆڤی ژمارە دوو، سەیری تۆ دەکەن، دەرون و کەسێتی خۆت لەوانە بەرزتر ڕابگرە، شانازی مەکە بەوەوە کە ئەوانە دەناسیت و تێکەڵاویت هەیە لەگەڵیاندا، ئەوانە وەکو سڵەمارن، هەر کاتێ ویستیان دەتگەزن، کە کاریان پێتە بەرزت دەکەنەوە، کە کاریان پێت نەما ڕیسواو سوکت دەکەن، ئینجا لەناوت دەبەن.

تەنها شوێنێك کە قەدر و ڕێزی مرۆڤی چاکەکاری تێدا بێ، دەرك و دەروازە پڕ لە شکۆو میهرەبانیەکانی خودای گەورەیە، فەرموو تۆش ڕووبکەرە دەروازەکانی خودای گەورە و واز لەو دەرکە شکاوانەی کۆشکی پاشایان بێنە.(١)

### البعد عن أبواب الملوك

إِنَّ المُلــوكَ بَــلاءٌ حَيْثُمَــا حَلُّــوا ... فَــلا يَكُــنْ لَــكَ فِي أَبْــوابِهِمْ ظِــلُّ

مَــاذَا تُؤَمِّــلُ مَــنْ قَــوْمٍ إِذَا غَضِــبُوا ... جَــارُوا عَلَيْــكَ وَإِنْ أَرْضَــيْتَهُم مَلُّــوا

فَاسْــتَغْنِ بِــاللهِ عَــنْ أَبْــوَابِهِمْ كَرَمَــا ... إِنَّ الوقُــــوفَ عَلَـــى أَبْــــوَابِهِم ذُلُّ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (٩٧):

---

(١) ص٧١/ البعد عن ابواب الملوك/ ان الملوك بلاء حيثما حلّوا/

## (دورکەوتنەوە لە دەرگای میر و پاشایان)

میر و پاشایان، هەر بەلان، دەسەلاتیان لە هەرجێ بێ

نەهێڵی سایەی دەرگایان، هیچ کاتێ لەسەر سەرت بێ

لەو (گەل پاشا)[1] چی چاوەڕێی، کە هەڵدەچێ

وەلات دەنێ[2]؟ ڕازیشی کەی، ڕازی نابێ

پشت بەو خودایە ببەستە، دەرگای میهری کراوەیە

(لارەمل)[3]ی بەردەرگای (شا) بەشی هەر ڕیسوایی دەبێ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٩٨)

هەندێ نەیار، ویستیان کە شافیعی ڕابکێشنە ناو گێچەڵی لێکدابڕانی خەلیفە ڕاشیدیەکانەوە، ئەوە بوو ئەو دەنگۆیەیان بڵاوکردەوە، کە گوایە شافیعی بووەتە کەسێکی (ڕافزی) و تەنها (عەلی کوڕی ئەبی تالب)ی خۆش دەوێ و ئەوانی تری خۆش ناوێ، (شافیعی)ش خ.ل کە ئەم دەنگۆیەی بیست، بەم هۆنراوەیە ئەو ناحەزانەی دەمکوت کرد[4].

### حبه لآل البيت والخلفاء الراشدين

إِذَا نَحْـنُ فَضَـلْنَا عَلِيـاً فَإِنَّنَـا ... رَوَافِضُ بِالتَفْضِيلِ عِنْدَ ذوي الْجَهْلِ

وَفَضْـلَ أَبـي بَكْـرٍ إِذَا مَـا ذَكَرْتُـهُ ... رُمِيـتُ بِنصْب عِنْـدَ ذِكـري للفَضْـلِ

فَـلاَ زِلْـتُ ذَا رَفْـضٍ وَنَصْـبٍ كِلاهُمَـا ... بِحبيهِمَـا حَتَّـى أَوَسَّـدَ في الرَّمْـلِ

---

(١) گەل پاشا: خانەوادەو کەس و کار و پیاوانی دەوری پاشا.

(٢) وەلات دەنێ: فەرامۆشت دەکات.

(٣) لارەمل: ئەو کەسەی ملی لار دەکاتەوە لەبەردەمی کەسانی تردا بۆ داوایەک.

(٤) ص٧٢/ حبه لآل البيت وخلفاء الراشدين/ إذا نحن فضلنا علياً فأننا/

دەقی هۆنراوەی ژمارە (٩٨):

(خۆشەویستی بۆ خانەوادەی پێغەمبەر و جێنشینە ڕاشدیەکان)

ئەگـــەر، ئێمـــە، شـــکۆی عـــەلی وا دابنـــێین لـــە بـــەرزی
ئـــەوا ئێمـــە لای نـــەفامان پێمـــان دەوتـــرێ ڕافـــــزی
وە شـــکۆی (أبـــوبکر)یش، کاتـــێ کـــە نـــاوی دەبـــەم
بـــە گـــەورە نـــاوی دەهێـــنم، هـــەر لەبـــەر پلـــە بـــەرزیی
هـــەردوولایان، لـــەلای مـــن، لـــە پلـــەی بـــالآدایە
هـــەردوکیانم خـــۆش دەوێـــن، تـــا دەخرێمـــە بـــن ئـــەرزی

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (٩٩)

دیسانەوە لەم هۆنراوەیەدا شافیعی خ.ل ڕوونی دەکاتەوە کە خۆشەویستی خانەوادەی پێغەمبەرو یارویاوەرانی، بە دەقی ئایەتی قورئانی پیرۆز واجبە لەسەر موسولّمانان، ئەو شانازیەش زۆر گەورەیە بۆ ئەوان، کە تەنانەت لە هەموو نوێژەکانماندا دەبێ سلاو بنێرین بۆ ئەوان، ئەگەر وانەکەین ئەوا نوێژمان دروست نیە، هەروەکو لە (تەحیاتی) هەموو نوێژەکانماندا دەبێ بلّێین: (اللهم صلی علی محمد و علی آل محمد)[1]

حب آل البيت فرض من الله

يَـا آلَ بَيْـتِ رَسُـولِ اللهِ حُـبُّكُمُ      فَـرْضٌ مِـنَ اللهِ فِي القُـرآنِ أَنْزَلَـهُ
يَكْفِـيكُمُ مِـنْ عَظِـيْمِ الفَخْـرِ أَنَّكُـمُ      مِـنْ لَـمْ يُصَـلِّ عَلَـيْكُمْ لاَ صَـلاَةَ لَـهُ

(١) ص٧٢/ حب آل البيت فرض من الله/ يا آل بيت رسول الله حبكم/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (٩٩):

### (خۆشەویستی بۆ خانەوادەو یارانی پێغەمبەر د.خ)

ئـــەی خانـــەوادەی پێغەمبـــەر، خۆشەویســـتیتان ڕەوایـــــە
بـــە دەقـــی ئایـــەتی قورئـــان، فەرزێکـــە، فـــــەرمانی خوایـــە
هێنـــدە بەســـە، بـــۆ شـــانازیی، ســـەروەریتان وا مـــەزن بـــێ
نوێـــژ، بـــێ ســـەڵاوات لەســـەرتان، نەویســـتراو و ناڕەوایـــــە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٠٠)

کەسێك کە چاکەخوازە، هەر با چاکەخواز ناوی دەڕوات و دەناسرێت، تەنانـەت چاکەی وا دەدەنە پاڵی کە ئەو هەر ئاگایشی لێ نیە و نەیشی کردووە، کەچی مـرۆڤ بەدبـەخت و نـەگریس و خراپـەکار چـەند شـرەی بـۆ پینـە بکرێـت، چـەند خـەڵکی کەموکوڕیی بۆ داپۆشن، هێشتا هەر زیاتر لەسەر بەدکاری و لاساری خۆی بەردەوام دەبێ و خراپەی ئـەم و ئـەویش دەخاتـە ئەسـتۆی خـۆی، بەڕاسـتی سـوکایەتیەکی گەورەیە کەسێك شـانازی بـە خراپەکاریـەکانی کەسـێکی تـرەوە بکـات و بـە دەمـی خۆی بۆ هەر مەبەستێك بێ، خۆی بکاتە هاوبەشی ئەو[1].

### علو الذكر

المَـــرءُ يَحْظَـــى ثُـــمَّ يَعْلُـــو ذِكْـــرُهُ      حَتَّـــى يُـــزَيَّن بِالـــذي لَـــمْ يَفْعَـــلِ
وَتَـــرَى الشَّـــقِيَّ إذَا تَكَامَـــلَ عِيْبُـــهُ      يَشْـقَى وَيَنْحَـلُ كُـلَ مَـا لَـمْ يَعْمَـلِ

---

(١) ص٧٣/ علو الذكر/ المرأ يخظي ثم يعلو ذكره/

دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٠٠):

(بەرزی ناوبانگ)

مــــرۆڤ دەژی، لـەم ژینـەدا، بـە بـاش، کـە ناوبـانگ پەیـدا دەکـا
لـــەناو خـــەڵکا، ڕازاوەیـــە، بـــەو چاکانـــەی[1] کـــە ناشـــیکا
کەچـی کەسێ کـە نەگریسـە، چـاکیش بکـا (کەچـیی)[2] لـە خـۆی
لاســـارە، خـــراپەی خـەڵکیش بـە مـاڵ دەکـا، گـەر نەشـیکا[3]

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٠١)

گفتوگـۆ و لەگـەڵ یـەکتردا دوانـدن بـۆ یـەکلایی کردنـەوەی دۆز و کێشـە و گیروگرفتی هەمـەجۆر، بـە درێـژایی مێـژوو لـە نێـوان توێـژی زانایـان و بیرمەنـدان و دەسەڵاتداران و خەڵك و نوێنەران و ڕۆشـنبیران و هاوڕێیـان و دادوەرانـدا هـەبووە و هـەر بـەردەوامیش دەبـێ، کـە بـەو ڕووبـەڕوو دانیشـتنەش دەوترێـت لێکـدوان (المناظرة)، لەم سەردەمەدا گەلێ چەشنی تری بۆ پەیدا بووە، وەکو کۆڕ و سیمینار و دیبەت و (مێزگرد)دا پێشکەشی دەکەن، کە لـە نێـوان دوو کـەس یـان زیـاتر، دوو گروپ یان زیاتردایە، بەڵام لە سەردەمی ڕابردوودا کەسە بەرانبەرەکان دوو سیفەتی گرنگیان تێدا بـوو، کـە لـە هـی ئێسـتادا کـەمتر هەیـە، ئـەویش (توانـای زانسـتی و شارەزایی لۆژیك) لەگەڵ (ڕێزگرتنی بەرانبەر) لە چوارچێوەی هونەری ڕەخنـەگری و گەڕان بەدوای دۆزینەوەی ڕاستیدا، بەڵام ئێستا زیاتر لە دەمەقاڵێ و شەڕە جنێـو و یـەکتر تاوانبـار کـردن و سـەنگەر سـەنگەرێنەدایە. کـە هـەرگیز ئاکـامی باشـی لێ ناکەوێتەوە و ڕاستیەکەش بە تەواوەتی ڕوون و دیار نابێ.

---

(١) بەو چاکەی: بەو کردەوە چاکانەی.

(٢) واتە کەسێك کە بەدبەختە، نەنگی و کەم و کوڕی خۆیشی چاك بکات لە خۆیدا.

(٣) خراپەی خەڵکیش لەسەر خۆی بە ماڵ دەکات و دەیانگرێتە ئەستۆی و خۆی بە دەمی خۆی دەکاتە شەریکە بەشیان، یان خەڵکی وای ناودەبەن.

شافیعی کەوتووەتە ناو جۆرە لێکدوانێکی بەم جۆرەوە و لەو بارەیەوە ئەم هۆنراوەیەی نوسیوە، کە دەفەرموێت نیاز درێژیم منی بەرەو ماڵی نامۆیی و دابڕاند برد لە کاتێکا بمویستایە دەستم دەگرت بەکڵاوەکەی خۆمەوە و خۆم نەدەخستە ناو ئەو هەموو هەراو زەنایەوە، یان بەرانبەرەکەم وا دەگەوجاند کە خەڵکی وا بزانن گەوجێتی سیفەتێکی بنەڕەتیە لە خودی کەسەکەی بەرامبەردا، خۆ ئەگەر ئەو کەسە ژیر بوایە، ئەوا هەر بە بەڵگە ژیریەکانی خۆی دەمبەستەوە، بەڵام بەداخەوە ژیر نیە، ناخۆشترین گفتوگۆ و لێکداونیش ئەوەیە کە بەرانبەرەکەت کەسێکی ناو ماڵی و نەشارەزاو ناژیر و کەللە ڕەق بێ و پێی وابێ کە هەر خۆی ڕاست دەکات و ڕاستیش هەر لای ئەوە...![1]

## مناظرة

وأنزَلَنِي طُولُ النَّوى دَارَ غُرْبَةٍ إذا شِئْتُ لاَقَيْتُ أمرأً لاَ أُشَاكِلُهُ
أُحَامِقُه حَتَّى تُقَالَ سَجِيَّةٌ وَلَوْ كَانَ ذَا عَقْلٍ لَكُنْتُ أُعاقِلُهُ

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٠١):

## (لێکدوان)

نیاز بەرزیم، وای لێ کردم، لە ماڵی نامۆییدا بم
بمویستایا، دەکرا لەگەڵ کارێکی بێ کێشەدابم
ئەوانیشم، وا دەگەمژاند، وەك گەمژە بێنە هەستەوە
گومان وابێ، کە زگماکین، هەر بە ژیریی دەمبەستەوە

(١) ص٧٣/ مناظرة/ وأنزلني طول النوى دارغربة/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٠٢)

ئێرەیی بردن و چاوچنۆکی و حەسوودی، سیفەتی زۆر ناشیرنین لە مرۆڤدا، شافیعی خ.ل لەگەڵ هەموو جۆرە کەسێك توانیم خۆم بگونجێنم و هەڵبکەم، بەڵام نەمتوانی لەگەڵ مرۆڤی حەسوود نەمتوانی بژیم و هاورێیەتی و تێکەڵاوی بکەم، چونکە سیفەتی سەرەکی حەسوود ئەوەیە کە چاوی لەسەر هەر شتێکە کە تۆ هەتە، ئاواتیشی ئەوەیە ئەوەی کە تۆ هەتە نەتمێنێ و لە دەستی بدەیت، واتە تەنها بەوە دڵی ئاو دەخواتەوە، کە تۆ ئەوەی هەتە، نەتمێنێ، جا ئەو شتە ماڵ و سامانە، پلەوپایەیە، جوانی و تەمەنە، قاد و باڵایە، تەندروستیەیە، ناوبانگە...هتد.

کەسانی تر هەیە کە حەز دەکەن، ئەوەی تۆ هەتە، ئەویش وەکو تۆ هەیبێ، بەبێ ئەوەی حەز بکات کە تۆش ئەوەی هەتە، لەدەستی بدەی، بەڵام حەسوود، بەوە دڵ خۆش دەبێ کە ئەوەی هەتە نەتمێنێ، ئیتر ئەوە گرنگ نیە بەلایەوە ئاخۆ خۆی هەیبێ یان نەیبێ[1].

**مدارة الحساد**

وَدَارَيْتُ كُلَّ النَّاسِ لَكِنْ حَاسِدي ... مُدَارَاتُهُ عَزَّتْ وَعَزَّ مَنَالُهَا

وَكَيْفَ يُدَارِي المرءُ حَاسِدَ نِعْمَةٍ ... إِذَا كَانَ لاَ يُرْضِيه إلاَّ زَوَالُهَا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٠٢):

### (هەڵکردن لەگەڵ چاوچنۆك)

لەگەڵ هەموو کەس، هەڵمکرد[2]، بەس چاوچنۆکی ئێرەبەر
ژین لەگەڵیا نەچێتە سەر، سەختە خۆی و ئەوتە مایەی گرتویەبەر
ئاخر، چۆن کەسێ دەتوانێ، لەگەڵ چاوچنۆك بمێنێ؟
ئەو تەنها بەوە ڕازیە، هەرچی تۆ هەتە نەتمێنێ

(١) ص٧٣/ مداراة الحساد/ وداريت كلّ الناس لكن حاسدي/

(٢) هەڵمکرد: گوزەرام، گونجام، ژیام، یاوەربووم.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٠٣)

فێربوونی زانست و زانیاری، پەیوەندی بەوەوە نیە، ئاخۆ ئەم کەسە لە کام خێزان و تیرەیە، یا دایك و باوکی چاکن یان خراپن، بەڵکو زانست پلەو پایەو شکۆ دەدات بەو کەسەکە، گرنگ نیە کێیەو کوڕی کێ یان کچی کێیە..!

کەسی ژیر و زانیار و مشوخۆر کەسێکی پێشەنگ و بڕیار بەدەستە و کەسانی تر لە خزم و بێگانە لە دەوری کۆ دەبنەوە.

ئێمەش هەر بە هۆی زانستەوەیە کە زرنگ و هۆشیارین، دەتوانین چاك و خراپ، ڕەواو ناڕەوا، حەڵاڵ و حەرام لە یەکتری جیابکەینەوە لەسەر بنەمای ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر د.خ[1].

### بالعلم تبنى الأمجاد

رَأَيْـــتُ العِلْـــمَ صَـــاحِبُهُ كَـــرِيمٌ     وَلَـــوْ وَلَدَتْـــهُ آبَـــاءٌ لِئَـــامُ

وَ لَـــيْسَ يَـــزَالُ يَرْفَعُـــهُ إلى أنْ     يُعَظِّـــمَ أمْـــرَهُ القَـــومُ الكِـــرَامُ

وَ يَتْبِعُونَـــــهُ فِي كُـــلِّ حَـــالٍ     لَراعِـــي الضَـــأْنِ تَتبَعُـــهُ السَّـــوَاء

فَلَـــولاَ العِلْـــمُ مَـــا سَـــعِدَتْ رِجَـــالٌ     وَلاَ عُـــرِفُ الحَـــلاَلُ وَلاَ الحَـــرَام

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٠٣):

### (بە زانست سەروەریەکان بونیاد دەنرێن)

وا دەبیـــنم کەســـی زانـــا، شـــکۆدارە، دەهەندەیـــە[2]، بـــەڕێزە
گەرچـــی لـــە باوانێکیـــش[3] بـــێ، کـــەوا بەدنـــاو و کرێـــزە[4]
هـــەر زانستـــە، کـــە بـــەردەوام بـــەرەو پلـــەی بـــەرزی دەبـــات

---

(١) ص٧٤/ بالعلم تبنى الأمجاد/ رأيت العلم صاحبه كريم/

(٢) دەهەندە: زۆر بەخشندە.

(٣) باوان: دایك و باوك

(٤) کرێز: بێ فەڕ، لئیم.

تــا دەبێتــە، گــەورە کــەسێك، کــە نــاوی ســەردار[1]ی هــۆزە

لــە گشــت بارێــك، ئــەو خــەڵکانە لــە دووی دەبــن[2]

چــۆن مــەڕەکان، لــەدوای شوانــن، لــە دەشــتایێ، یــا لــە کــۆزا[3]

زانــســت نــەبــا، ئــەو خەڵکانــە، بــە ئاســودەیی نــەدەژیان

حــەڵاڵ، حــەرام، نــەدەزانرا، لــە فەرمایشــتی پــیرۆزا

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٠٤)

شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا، ئاماژە بۆ سێ شت دەکات، کە دەبنە مایەی بەرپابوونی نەخۆشی و تەمەن کورتی مرۆڤ و چوونی لەشی ساخ بەرەو دەردەداریی، ئەوانیش بریتین لەمانە: هۆگربوون خوو پێوەگرتن بەشتێکی خراپ کە بەردەوامی هەبێت، زۆر سەرجێی و جووت بوونی هاوسەران، کە لە سنور تێپەڕی کردبێ، با حەڵاڵی یەکتریش بن، هەروەها پشوونەدان بە گەدەو ریخۆڵە، بە چەشنێك کە بەدوای خواردنی خۆراکێکدا خۆراکێکی تر راستەوخۆ بیخۆیت، بەبێ ئەوەی مەودایەك لە کاتت خستبێتە نێوان ئەو دوو خواردنەوە، ئەڵێی و زگت کردووە بە عەمار، هەر خواردنی تێ فرێدەدەیت و بەزەییت بە حاڵی خۆتا نایات، ئەدی نازانیت زۆر خواردن خەو و لەشگرانی بەدوای خۆیدا دەهێنێ.[4]

## الأمراض من ثلاث

ثَــلاثٌ هُــنَّ مُهْلِكَــةُ الأَنَــامِ وَدَاعِيَــةُ الصَّــحِيحِ إلى السِّــقَامِ

دَوامُ مُدَامَــــةٍ وَدَوَامُ وَطَــــأٍ وَإِدْخَــالُ الطَّعَــامِ عَلَــى الطَّعَــامِ

(١) سەرداری هۆز: گەورەی هۆز و دەستە.

(٢) لەدووی دەبن: بەدوایەوە دەبن، لەگەڵیا دەبن.

(٣) کۆز: حەوشی مەڕ و بزن، حەسار.

(٤ ) ص٧٤/ الأمراض من ثلاث/ ثلاث هنّ مهلكة الأنام/

دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٠٤):

## (نەخۆشیەکان لە سێ شتەوە)

ســــــێ شـــــت لــــــــەناو دەبـــــەن مـــــرۆڤ
لــــــــەش ســــــاغ، دەکەنــــــــە دەردەدار
هۆگـــــــر بوونێــــــــك وەك ماخــــــــۆلان
زۆر ســــــــەرجێی[1] دوو هاوســــــــــەردار
بــــــــەدوای یــەکتـــــرا دوو خـــــــواردن
وەکـــــــو دان[2] بکەیــــــتە عــــەمبــــــار

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٠٥)

(عثمـان کـوڕی محمـد العثمـاني) کـە (أبـو محمـد کـوڕی حیـان) لـەوەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: (ئەبو عەلی نەسابوری) لە بەغدا گێڕایەوە لە سەر زاری هەندێ لە هاوەڵانیەوە، کە محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی کاتێك بە سەردان چووە بۆ (میسر) کۆمەڵێ لە هاوڕێیانی ئیمامی مالك هاتنە لای و پێشوازیان لێ کرد، لەوێدا ئەم هۆنراوەیەی فەرموو، کە دەڵێت:

بۆچی مـن لـە شـوێنانی تـر، کـە قـەدری نـەزانرێ بێم دوڕ و وردە زێڕ بڕێژمـە بەرپێیان، وەك ئـەوە وایـە کـە وردە زێـڕ و دوڕ بڕێژمـە بـەرپێی ئـەو کەسانەی کە شوانی مەڕ و گاو گۆڵن، یان بێم شیعر و پەخشان بەسەر ئەو شوانەدا بڵێم کـە لێـی تێناگات، پەیمان بێ ئەگەر لەناو خراپترین شاردا بم واز لـە هـۆنراوە بێـژی و وتـار خوێندنـەوەم نـاهێنم، تەنانـەت ئەگـەر تیاچـوو بم، ئومێـدەوارم خـودا بمخاتـە نـاو کەسـانی شـارەزاو دانـاوە (وەکـو ئێـوە)، دیـارە ئـەو هاوڕێیانـەی مالـك خ.ل زۆر دەبەرێکراچوون و مشتومڕییان لەگـەڵ کـردووەو هەندێکیشیان وەك پێویست لێـی

(١) سەرجێی: کاری نێوان دوو هاوسەر.

(٢) دان: دانەوێڵە، وەکو گەنم و جۆ، کە دەکرێتە کەندووەوە.

تێنەگەیشتوون بۆیە زۆرێك لە جەواهێری بیری خۆی بۆیپان دەرنەبڕیوەو هەر لە مێشك و دڵی خۆیدا هێشتوویەتەوە، چونکە حەیفە مرۆڤ زانست بە کەسێ ببەخشێ کە شایستەی نەبێ و قەدری نەزانێ، هاوکات ئەو زانایەش ستەمکارە، کە زانست و زانیاری هەر لای خۆی بەند دەکات و نایبەخشێ بەکەسانی شیاو و گونجاو.[1]

أخبر عثمان بن محمد العثماني و حدث عنه أبو محمد بن حيان قال: حدثنا أبو علي النسابوري –ببغداد– حدثني بعض أصحابنا أن محمد بن إدريس الشافعي لما دخل نصر أتاه جلة أصحاب مالك وأقبلوا عليه فابتدأ يخالف أصحابه ثم أنشد قائلاً:

أَأَنْثُـــرُ دُرّاً بَـــيْنَ سَـــارِحَةِ الــبَهْمِ ... وَأَنْظِـــمُ مَنْثُـــوراً لِراعِيَـــةِ الغَـــنَمِ؟
لَعَمْـرِي لَـئِنْ ضُـيِّعتُ فِي شَـرِّ بَلْـدَة ... فَلَسْـتُ مُضِـيعاً فـيُهم غـرر الكَلِـم
لَـــئِنْ سَـــهّل اللهُ العَزِيـــزُ بِلطفِـــهِ ... وَصَـــادَفْتُ أهـــلاً للعُلـــوم وللحِكَـــمُ
بَثَثْـــتُ مُفيـــداً واســـتَفَدْتُ وِدَادَهُـــم ... وإلاَّ فَمَكْنُـــونٌ لَـــدَيّ ومُكْتُـــتم
وَمَـــنْ مَـــنَحَ الجهّـــالَ عِلْمـــاً أَضَـــاعَهُ ... وَمَـــنْ مَنَـــعَ المســـتوجِبين فَقَـــدْ ظَلَـــم

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٠٥):

### (ڕەنجی بەفیڕۆدراو)

ئـــــەرێ، بـــۆ دوڕڕ، پەخشـان بکـەم، لەبـەر پێـی خـەڵکی گاوانا
وەیـاخـــود، پەخشـــان بنووســـم، بەســـەر شـــوانی مـــەڕەکانا؟
ســوێند بــێ، ئـــەگەر لەناوجەرگـــەی خـراپترین شـار، تیاچـووم
ناهێڵـــم کــــە لــــە دەســـــتم چـــــێ، شـــاوتارم لــــەناویانا
گــەر خـــوا، لــە ڕووی میهرەبــانی، کــاری بــۆ ئاســان دەکــردم
ڕێـــم دەکەوتـــە، نـــاو کەســـانی، بـــە حیکمـــەت و زانـــا و دانـــا
ئـــەوسا نـــاوبانگم دەڕۆیـــی، ســـودم لـــە ســـۆزیان دەبینـــی

---

(١) ص٧٥/ اخبر عثمان بن محمد العثماني و حدث عنه أبو محمد...

(کەوانــە بــوو)، گەنجینــەی شــاراوەی بــیرم لای خــۆم دانــا
هـــەرکەسێ زانســتی بەخشــی، بــە کەســانی گێــل و گەمــژە
بەفیڕۆیدا،کـە بـە شایستەشـی نـەدا،ڕێی سـتەمی بـۆ خـۆی دانـا

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٠٦)

ئەگەر یەکێك لە ئەندامانی خانەوادەکەت، یان خزمەکانت وەك پێویست داوێن پاك نەبوو، پەلە مەکە، گازندەو گلەیی لەویش مەکە، توڕە مەبە، نەرم نەرم بە خۆت و ڕەفتارە نهێنیەکانی خۆتدا بچۆرەوە، تۆ خۆت داوێن پاك بە دڵنیابە کچ و ژن و منداڵیشت وا دەبێ، دەبێ مرۆڤی موسوڵمان دەست و دەم و داوێن پاك بێ، خۆتان لەو بەدکاریە لادەن، چونکە زینا و داوێن پیسی وەك وەرگرتنی قەرز وایە، هەر دەبێ بیدەیتەوە، جا ئەو زینایە چۆن بێ و لە کام جۆر بێ، دەبێ لەو جۆرەش بیدەیتەوە بەو کەسەی لێت قەرز کردووە، یان کەسێکی تر، پەنا بە خوا لەو تاوانە دزێوە، جا ئەگەر تۆش خۆت گیف بکەیتەوە و بەردەوام چاودێری ماڵ و منالت بکەیت و پێت وابێ خانەوادەشت وا ئەکەن، ئەوا دڵنیابە خانەوادەکەت زۆر دڵسۆز و بە وەفان بۆ دانەوەی ئەو قەرزانەی کە پێشتر کردووتە.[١]

### عفوا تعف نساءكم

عُفّوا تَعُفُّ نِسَاؤكُمْ فِي المَحْرَمِ     وتجنّبوا مَا لاَ يَلِيقُ بِمُسْلِمِ
إنَّ الزنَا دَيْنٌ فَإنْ أقرضْتَهُ     كَانَ الوَفَا مِنْ أهلِ بَيْتِكِ فَاعْلَمِ

(١) ص٧٦/ عفوا تعف نساءكم/ عفوا تعفا نساءكم في المحرم.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٠٦):

## (داوێن پاکبن)

داوێـــن پـــاك بـــن، دڵنیـــابن، ئافرەتانیشـــتان وا دەبـــن
خـــۆ ببـــوێرن، لـــەو شـــتانەی، نابـــێ لـــە موســـڵمانابن
داوێـــــن پیســـــی، ئـــــەو قەرزەیـــــە وەری دەگـــــرن
خانـــەوادەت، بـــۆ دانـــەوەی لـــە خۆتـــان بـــەوەفاترن

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٠٧)

بەخشندەیی یەکێکە لە ڕەوشتە جوانەکانی مرۆڤ، بەڵام ئەوەی بەخشندەیی جوانتر دەکات، ئەوەیە کە لەسەر هەژاری خۆتەوە ئینجا بەخشندەبی، باشترین شت ببەخشی نەکەی ئەوەی کە بۆ فرێدانت داناوە، شافیعی خ.ل دەفەرموێت: من چیم هەیە، ئەوە دەبەخشم، ناڵێم نیمە بۆیە نابەخشم، ناڵێم کە بووم، لێم زیاد بوو، ئینجا دەبەخشم، ناڵێم کە داوام لێ کرا ئینجا دەبەخشم.

دەبەخشم لەو ڕۆزی و خۆراکەی کە هەمە، گەرچی لە برسانا زگم ژان بکات و لە بەتاڵیدا گەدەم بە پەراسوومەوە بنوسێ، هەمیشە خۆم بە دەوڵەمەند پیشان دەدەم، چونکە دڵم دەوڵەمەندە، باری هەژاری و کڕوزانەوە لە خۆمدا دەرناحەم و دەیشارمەوە، سکاڵای نەبونی و هەژاری خۆم تەنها لەلای خودا دەکەم، چونکە هەر ئەو بەڕاستی و بە تەواوەتی زانا و بەئاگادارە لەماڵی من، ئەو دەزانێ من لە چیدا هەژارم و چیم دەوێ، ئەویش ئەوەم دەداتێ کە بەسوودە بۆم، نەك تەنها ئەوەی کە حەزم لێیەتی، ئەو خودایە زانا و نهێنی پارێزە و ئاگای لە حاڵم هەیە، جا ئەو حاڵەی خۆم دەربڕم، یان دەرنەبڕم، من ئیسار ئەکەم.(١)

---

(١) ص٧٦/ الأثرة والجود/ أجود بموجود ولو بت طاوياً/

## الأثرة والجود

أجُـودُ بِموجُـودٍ ولَـوْ بِـتُ طَاوِيـاً عَلَـى الجُـوعِ كَشْـحَا والحَشَـا يَتَـأَلَّمُ
وأُظْهِـرُ أسـبَابَ الغِنَـى بَـيْنَ رِفْقَـتِي لَيَخفَـاهُمُ حَـالِي وإنَّـي لَمُعْـدَمُ
وَبَينِـي وَبَـيْنَ اللهِ أشْـكُو فَـاقَتِي حَقِيقَـاً فَـإنَّ اللهَ بالحَـالِ أعْلَـمُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٠٧):

### (دەوڵەمەندی و دەهەندەیی)

دەبەخشـم لـەوەی کـە هەمـە، گەرچـی خـۆم برسـی وەمێـنم
زگـــم بـــە پـــەراسووم نوسـێ، هەناویشـم بـەژان بێـنم
هێمـــاکـــانی دەوڵەمەنـــدی، لـــەنێو دۆســـتانم دەردەخـــەم
حاڵـــی خۆمیـان لێ ون دەکـــەم، وەکـو (نـــەبوو) خۆنـــانوێنم
تاکـــو ســـکاڵای هـــەژاریم، هـــەر لـەنێوان مـن و خـوا بـێ
هـــەر ئـەو، ئاگایـە، بـە حـاڵم، بیلێـــم، وە یـــا نەیـدرکێنم

### دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٠٨)

شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا، بانگی ئەو کەسانە دەکات کە سوکایەتی بە ڕێز و شکۆی کەسانی مەرد دەکات و خۆیشی پەیوەندی خزمانەو دۆستانەی پساندووەو بە ژیانێکی زۆر بێڕێزانە دەژی و وای داناوە کە ئەو کەسە دیلی دەستی حەز و ئارەزووە خراپەکانیەتی، دەفەرموێت: ئەگەر تۆ کەسێکی ئازاد بویتایە، لە تیرە و پشتێکی چاک و نەجیب زادە بوویتایە، هەرگیز سوکایەتیت بە خەڵکانی موسوڵمان نەدەکرد، هەر کەسێك بەدکار و چاو لەدەر و زیناکار بێ، ئەوا ئەو زینایەی هەر بەرانبەر دەکرێتەوە، تەنانەت ئەگەر بە دیواری خانوەکەی و بەردو خشتی حەوشەو ماڵەکەیشی بێ، جا فلانە کەس، ئەگەر ژیر و هۆشمەندی، چاك تێدەگەی چی دەڵێم و لەگەڵ کێمە، باش گوێم بۆ بگرە چاك لێم تێبگە.

ئەم ڕووداوە ئەگەر ڕووی دابێ یان ڕووی نەدابێ، هەمیشە کەسانی داوێن پیس، وا دەزانن هەر ئەوان بێ ئابڕوویی لەگەڵ خەڵکی دەکەن و خەڵکی ئەوە ناکاتەوە بەرانبەریان، بەڵام با دڵنیابێ چی بەرانبەر کێ بکات، ئەوەی بەرانبەر دەکرێتەوە، لەلایەن هەمان کەس یان کەسێکی ئەو کەسەوە، خراپترین بێ ناموسیش ئەو کەسەیە کە بەدکارو زیناکارەو بەلایشیەوە ئاساییە هەمان شت بەرانبەر خوشك و دایك و کچی خۆی و خزمانی بکرێ، دواهەمین پلەی بێ ناموسیش ئەوەیە کە کەسە شانازی بەو کارانەیەوە بکات و باسیان بکات و تەوبە نەکات.[1]

## من هتك حرمة أخيه هتك الله حرمته

يَـا هَاتِكَـاً حُـرَمَ الرِّجَـالِ وَقَاطِعَـاً سُـبُلَ المَـوَدَّةِ عِشْـتَ غَيْـرَ مُكَـرَّمِ

لَـوْ كُنْـتَ حُـرَّاً مِـنْ سُـلالَةِ مَاجِـدٍ مَـا كُنْـتَ هَتَّاكَـاً لِحُرْمَـةِ مُسْـلِمِ

مَـنْ يَـزنِ يُـزنَ بِـهِ وَلَـوْ بِجِـدارِهِ إنْ كُنْـتَ يَـا هَـذَا لَبِيبَـاً فَـافْهَمِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٠٨):

## (هەرکەسێ بێ ڕێزی بەرانبەر کەسێك بکات،

## خوداش بێڕێزی دەکات)

ئـــەی ڕێـــز شکێنی ئەو خەڵکەو، پسێنی داوی ســـۆزداریی
کە بڕیوتە، پەیوەندی خزمایەتیت و ، ئێستاکـــە بێ ڕێز دیاری
کـــە ئـــازاد و ســـەربەخـــۆ بـــای[2] لـــە بنەماڵێـــکی خانـــەدان
وا نـــەدەبـــووی، نـــەتدەشکانـــد، ڕێـــزی خەڵـــکی بـــاوەڕداری
ئـــەو کـــەسەی داوێـــن پیســـی کـــا[3]، وەهایشـــی لێ دەکرێتـــەوە
تـــەنـــانـــەت ئەگـــەر بشـــکرێ، لـــەگەڵ بلـــۆکی دیـــواری

---

(١) ص٧٧/ من هتك حرمة أخيه هتك الله حرمته/ ياهاتك حرمة الرجال و قاطعاً

(٢) سەربەخۆبای، سەربەخۆ بویتایە.

(٣) داوێن پیسی کا، داوێن پیسی بکا.

وا مــن ڕاســتیەکەم پـــێ وتــی، ئــەی فلانــی لێـــم تــێ بگــە
دەی وازبێنــە، چـــاك دەزانــی، مــن چــی دەڵــێم کــە هۆشیـــاری

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٠٩)

ئەسپەهانی دەڵێ: محمدی کوڕی ئیبراهیم وتی: حسین کوڕی محمـدی غەوسـی دیمەشـقی وتــی: گــوێم لێ بــوو کــە (المزنــی) وتــی: لــە هەنــدێ بابەتــەوە شــافیعی دەهێنرایە قسەو دەیفەرموو:

من تۆم تاقیکردۆتەوە، تۆش خوی منت دا لە ئەزموون
ئەوەت بەسە بە خۆت بلێی فێربوونـــەکەم مامۆستامە[1]

وَلَقَــدْ بَلَوتُــكَ وابْتَلَيْــتَ خَلِــيقَتِي وَلَقَــدْ كَفَــاكَ مُعَلِّمِــي تَعْلِيمِــي

### دەقی هۆنـراوەی ژمارە (١٠٩):

شیمـکردیـــــەوە، شیتکردمـــــەوە، چیـــــم تێـــــدا بـــــێ
بـــەســــە فێــربـــــوون بــــۆ هــــەردوولا مامۆســــتا بــــێ

کەواتە بۆ هەریەکەمان شیکردنەوە بوو بە مامۆستا و سودمان لێ وەرگرت

## دەروازەی هۆنـراوەی ژمارە (١١٠)

لەم هۆنراوەیەدا شافیعی لە خودا دەپاڕێتەوە و باسی کەمی و بچووکی خۆی و گەورەیی خودای میهرەبان دەکات، لە بەشێکی هۆنراوەکەی دا ئاماژەی بۆ ئایـەتی (ألست بربکم؟) کردووە، کە بە ئایەتی پەیمان نوسراوە، چونکە خودای گەورە بـەر لەوەی گیان بـە جەسـتەی گیانەوەرانـدا لـە جیهـانی (أزل) دا خـۆی بـە هـەموومان ناساندووە بە ناو و سیفەتەکانیەوە، پاشان جەختی لەوە کردۆتەوە کە ئێمـە دڵنیـا بین کە هەر ئـەو پەروەردگارمانـە، بۆیـە هـەموو گیانـەوەران بەیـەك دەنـگ وتیـان:

---

(١) ص٧٧/ قال الأصبهاني حدثنا محمد بن ابراهيم/

بەڵێ، تۆ پەروەردگارمانیت، لە دوا دێڕی هۆنراوەکەیدا دەفەرموێت: خودایە خۆشەویستی و هۆگربوونی خۆتمان زیاتر بکە لە دڵەکانماندا، چونکە ئێمە تینوی خۆشەویستی تۆین و تەنها بەوە تینوێتیمان دەشکێ کە هۆگری خۆتمان بکەیت.[1]

## تذلل واستغاثة

بموقفِ ذُلي دُونَ عِزَتِكَ العُظْمَى ... بِمَخفيّ سِرٍّ لاَ أحِيطُ بِهِ عِلْمَا

بِإطرَاقِ رَأسي، باعْترَافي بِذلَتي ... بمدِّ يَدي، استَمْطِرُ الجُودَ والرُّحْمَى

بأسْمَائِكَ الحسنَى التي بَعْضُ وصْفِهَا ... لعِزَتِهَا يَسْتَغْرِقُ النَثْرَ وَالنَظْمَا

بَعَهْدٍ قَدِيْمٍ مِن ألستُ بِربِّكُمْ؟ ... بِمَنْ كَانَ مَجْهُولاً فَعُرِّف بالأسمْا

أذِقْنَا شَرَابَ الأُنْسِ يَا مَن إذَا سَقَى ... مُحِباً شَرَاباً لاَ يُضَامُ ولاَ يَظْمَا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١١٠):

### (زەلیلی و داوای پاڕانەوە)

خوایە گیان، ئەمن زەلیل و، شکۆ و گەورەیی، بۆ تۆیە

نایاتە بازنەی زانستم، ئەو نهێنیانەی، لای تۆیە

من بەلارە ملی خۆم و، دەربڕینی زەلیلیما

دەڵێم، خودا بباریێنە، ئەو سۆز و میهرەی ئی تۆیە

لەبەر خاتری ناوی جوانت، کە هەندێکیشیان سیفەتە

لە خۆشی شکۆی بەرزتە، شیعرم وا بەڕەنگ و بۆیە

هەر لە بەر ئایەی (ألستُ) کە بەو ناوانە داناسرای

لە پەردەی نادیاریتا، بە ئێمە خۆت ناسان ئەتۆ

نۆشکە پێمان، ئەو شەرابی هۆگربوونەی

کە هەر بەندەیەك لێی بخوا، تینوی نابێ لە خزمەت تۆ

---

(١) ص٧٧ ص٧٨/ تذلل و استغاثة/ بموقف ذلي دون عزتك العظمي/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١١١)

(باوکی ئیبراهیم) کە (اسماعیل)ی کوڕی (یەحیا)یەو بە (المزنی) ناسراوە دەڵێت: چووم بۆ سەردانی ئیمامی شافیعی، لەو نەخۆشیەیدا کە تیایدا کۆچی دوایی کرد، پێم گوت: چیتە؟ فەرمووی: لە دنیا کۆچ دەکەن، لە برایانم دادەبڕێم، بادەی مەرگ دەنۆشم، بەرەو لای خودا –جل جلالە– دەڕۆم، دەی سا بە خوا نازانم ئایا گیانم بەرەو بەهەشت یان بەرەو دۆزەخ دەچێت و سزا دەدرێتن ئینجا ئەم هۆنراوەیەی فەرموو.[1]

کاتێك دڵم ڕەق بوو، هەستەکانم و پایەکانم بەرتەنگ بوو، هێز و وزەیان نەما، تکاکاری و نزا خوازیم لە خودا کردە پلەی پەیژە بۆ لێبوردنی ئەو خودایە لە گوناهەکانم، گوناهەکنم گەورەن، بەڵام کە بەراوردم کردن بە گەورەیی بەزەیی و لێبوردنی تۆ، ئەوا لێبوردنت زۆر زیاتر و گەورەتربوو لە قەبارەی گوناهەکانم، تا ئێستاش کە لە سەرەمەرگدام لێخۆشبوونت یەکێك لە بەندە گەورەکانت کە (ئادەم)ە نەیدەتوانی لەبەرانبەر شەیتان خۆڕاگر بێ، بەڵام فریوی دا، ئیتر من چۆن فریو نادرێم؟ دەستخۆشی و سەرفرازی بۆ کەسێك کە لە گوناهەکانی پەشیمانەو بەهۆی دڵ گەرمیەوە لەجیاتی فرمێسك، خوێن لە چاوی دەبارێ، هەر کە تاریکی شەو داهات ئەو دەست دەکات بە شەو نوێژکردن، بەهۆی لەخواترسانیەوە، بیر لە ڕۆژگار و تەمەنی لاوێتی ڕابردووی بکاتەوە کە بەهۆی کەف و کوڵی هەرزەکاریەوە بە نەزانی هەڵەو تاوانی کردووە، تەوبە لەو ڕابردووە دەکات، دەڵێت: خودایە تۆم خۆش دەوێ و لە تۆ دەپاڕێمەوە، ئەوەش بەسە کە تۆ پەنای داواکارو تکاکاران دەدەیت، ئەی ئەوە هەر تۆ نیت کە ڕۆزی و خۆراك و پۆشاکت پێ بەخشیم، ژیریت پێدام، ڕێی ڕاستی دینداریت نیشان دام؟ هەتا ئێستاش هەر تۆی کە بەرانبەرم بەخشندەیت و نیعمەتەکانت بەسەرما دەڕێژی سا بەڵکو بەهۆی کەسێکەوە کە

---

(١) ئەمە دواهەمین هۆنراوەی شافیعی یە کە چەند سانێك پێش کۆچی دوایی فەرمووی.

چاکەی لەسەرمە لە هەڵەو تاوانم ببوری و گوناهەکانم داپۆشیت کە لە ڕابردوودا کردومە.

لە دێڕی یەکەمی هۆنراوەکەدا دەفەرموێت کاتێ دڵم ڕەق بوو، واتە کاتێ بەهۆی پیری و نەخۆشی مەرگمەوە نەمتوانی خواپەرستی تەواو بکەم، کەسێکیش لە خواپەرستی دوور بکەوێتەوە دڵی ڕەق دەبێ، یان بەهۆی نەخۆشی مەرگیەوە جەستەو دڵی لەکار خاوبوونەوە و دڵی وشك هەڵاتووە، هەستەکانیشی یان پەل و پۆی سست و لاواز بووە و بەرتەنگ بوون، گوڕ و تینی ڕابردوویان نەماوە. بۆیە هەر زمانی زیندووە، بە زمانیش نزا و تکا دەکات لە خودا تاکو لێی خۆش بێت.(١)

## وداع الدنيا والتأهب للآخرة

وَلَمَّا قَسَا قَلْبي، وَضَاقَتْ مَذَاهِبي ... جَعَلْتُ الرَّجَا مِنِّي لِعَفْوِكَ سُلَّمَا

تَعَاظَمَني ذَنْبي فَلَمَّا قَرَنْتُهُ ... بِعَفْوكَ رَبي كَانَ عَفْوكَ أعْظَمَا

فَمَا زِلْتَ ذَا عَفْوٍ عَنِ الذَّنْبِ لَمْ تَزَلْ ... تَجُودُ وَتَعْفُو مِنَّةً وتَكَرُّمَا

فَلَولاكَ لَمْ يَصْمُدْ لإبْلِيسَ عَابِدٌ ... فَكَيْقَ وَقَدْ أغْوى صَفِيَّكَ آدَمَا

فَلِلّهِ درُّ العَارِفِ النّدبِ إنَّهُ ... تفيض لِفُرْطِ الوَجْدِ أجفَانُهُ دَمَا

يُقيمُ إذَا مَا الليلُ مَدَّ ظَلامَهُ ... عَلَى نَفسهِ مِنْ شِدَّةِ الخَوفِ مَأْتَمَا

فَصِيْحاً إذَا مَا كَانَ في ذِكْرِ رَبِّهِ ... وَفي مَا سِواهُ في الوَرَى كَانَ أعْجَمَا

وَيَذكُرُ أيَامَاً مَضَت مِنْ شَبَابِهِ ... وَمَا كَانَ فِيهَا بِالجَهَالَةِ أجْرَمَا

فَصَارَ، قَرينَ الهَمِّ طُولَ نَهَارِهِ ... أخَا الشُّهْدِ والنَّجْوى إذَا اللّيلُ أظْلَمَا

يَقولُ حَبيبي أنْتَ سُؤْلي وبُغْيَتي ... كَفَى بِكَ للرَّاجِينَ سُؤْلاً وَمَغْنَمَا

ألَسْتَ الَّذي غَذَّيتَني وَهَدَيْتَني ... وَلاَ زِلْتَ مَنَّانَاً عَلَيَّ وَمُنْعِمَا

عَسَى مَنْ لَهُ الإحْسَانُ يَغْفِرُ زَلَتي ... وَيَسْتُرُ أوزَاري وَمَا قَدْ تَقَدَّمَا

---

(١) ص٧٨/وداع الدنيا والتأهب للآخرة/ حدث المزني وهو

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١١١):

## (ماڵئاوایی کردن لە دنیاو
## خۆئامادەکردن بۆ ڕۆژی دوایی)

کە دڵ، ڕەق وو، هەست و پام، لێکەوت، نزیک بوویەوە مردنم
(تکا)م کردۆتە پەیژەیەك، بۆ گەیین بە لێبوردنم
گەلێ زۆر بوون، گوناهی من، کاتێ بەراوردم کردن
لەگەڵ لێبوردنی تۆدا، زۆر گەورەتر بوو، لێبوردن
هەتا ئێستاش، لەگەڵ ئەو گوناهانەمدا، تۆم لێبوردەی
لێخۆشبوونت، لە گەورەیی خۆتەوەیە، کە بەخشندەی
تۆ نەبویتا، چۆن خواناسێك بە فێڵ و کەڵەکی شەیتان
دەیتوانی فریوی بدا، ئادەمی بژاردەی یەزدان؟
دەستی خۆش بێ، خوداناس و پەشیمان و تۆبەکارێ[1]
بە توانەوەی لە عیشقی خوا، خوێن لە چاوانی دەبارێ
لە ترسی خوا، شەو بێدارە، تاریکی لە ئەو دەترسێ
زمان ڕەوانە لە زیکرا، بەڵام لاڵە کە لە شتی تر دەپرسێ
بیری ئەو ڕۆژانە دەکا، کە لاوی تێدا بەسەر برد
پەشیمانە، لەوەی بۆچی خراپەی تێدا بەرپا کرد
بە درێژایی ڕوناکی ڕۆژ، سەرقاڵی کاری دنیایی
تاریکی شەو چ بەهرەیە! بۆ چرپەو تکای خودایی
خوا دەفەرموێ، بپارێوە، ئەوەت بەسە دەستکەوتت بێ
خۆ هەر تۆ بووی ڕۆزیت پێدام، هیدایەتیش لای تۆ دەبێ
هەتا ئێستاش، وا باوەڕم دامەزراوە، وا دڵی خۆم ڕاهێناوە

---

(١) تۆبەکارێ: تۆبەکارێك.

هـــەر منـــەتباری چـاکەی تـۆم، تـۆش نیعمــەتت بــە مــن داوە
بەڵکـــو ببــورێ ئــەو خوایــە، چــون[1] هــەر چـاکەیێ کردوومــە
بــۆ ئــەو بــووە، یــا داپۆشــێ، هەرچــی هەڵــەی ڕابردوومـــە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١١٢)

زانست پێگەو بایەخی گرنگی خۆی هەیە، بەخۆی نرخ و بەها و بەلاکەیەوە، ڕێز و شکۆ دەدات بەو کەسەش کە کاری تێدا دەکات و کاری پێ دەکات و کاری بۆ دەکات و زانستخوازە، تەنانەت خەڵکی لە خزمەتی ئەو کەسەشدا دەبن کە لە خزمەتی زانستدایە، وە لەسەر خەڵکی پێویستە کە خوێن و ئابڕوو ژیانی ئەو کەسە بپارێزن و بەرگری لێ بکەن، بە پێچەوانەیشەوە کەسێکی زانا کە زانستی بەخشی بە کەسانی خراپ و نەشیاو، یان زانستی بەکارهێنا لە شتی خراپدا ئەوا ئەو کەسە نەزان و نەفامە و ستەمێکی گەورەی کردووە.[2]

### الناس خدم للعلم

العِلْـمُ مِــنْ فَضْــلِهِ ، لِمَــنْ خَدَمَــهُ     أنْ يَجْعَــلَ النَّــاسَ كُلَّهُــمْ خَدَمَــهُ
فَوَاجِــبٌ صَــوْنَهُ عَلَيــهِ كَمَــا     يَصــونُ فِــي النَّــاسِ عِرْضَــهُ وَدَمَــهُ
فَمَــنْ حَــوىَ العِلْــمَ ثُــمَّ أودَعَــهُ     بِجهلِــهِ غيــرَ أهلِــهِ ظَلَمَــهُ

---

(١) چون: چونکە

(٢) ص٨٠/ الناس خدم للعلم/ العلم من فضله، لمن خدمه/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١١٢):

## (خەڵکی لە خزمەتی زانستدان)

بـــۆ ئـــەو کەســـەیە، زانســـت، کـــەوا خزمەتـــی دەکـــا
لـــە پـــای ئـــەوە، خـــەڵکیش خزمـــەتی ئـــەو ئـــەکا
بـــۆ زانیـــار، وا پێویســـت دەکـــا، لـــە ســـەر هـــەموو
بیپـــــارێزن، وەك پـــــارێزی خوێـــــن و ئـــــابڕوو
کەســـێ کـــە زانســـتی گـــرت و لـــە پاشـــا فەرامۆشـــی کـــرد
نـــەزانی کـــرد، کـــە دایـــە دەســـتی نـــەزانێ، ســـتەمی کـــرد

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١١٣)

کەسانێك هەن، کە زۆر هەوڵی فێربوونی زانست دەدەن و زۆریش خۆیان ماندوو دەکەن، بەڵام هەروەکو پێویست ناگەن بەو ئاستەی کە پێویستە، هۆکاری ئەمەش زۆرن، پێشەوا شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا شەش هۆکار دەخاتە ڕوو، یان شەش مەرج دیاری دەکات لەو مەرجانەی کە گرنگن بۆ ئەوەی کەسێك بگا بە دەست هێنانی زانست و زانیاری، ئەوانەش بریتین لەمانە:

یەکەم: زیرەکی، پێویستە ئەو کەسە توانا جۆراوجۆرەکانی بەهێزکردنی زیرەکی خۆی بخاتەکار لە ڕووی مادی و جەستەیی و مەعنەوی و کاتەوە، چونکە زیرەکی ناخی مرۆڤ هەر لە خۆیەوە ناکەوێتە کار، ئەگەر هان نەدرێت، لەبەرئەوە چەندەها کەس هەبووە کە زۆر زیرەك بوون، بەڵام نەیانزانیوە کە ئەو توانا شاراوەیان تێدایە، بۆیە هاتونە دنیاو کۆچی دوایشیان کردووە و زیرەکیەکەیان بردۆتە ژێر خاکەوە. لەبەرئەوە گرنگە مرۆڤ توانای خۆی بدۆزێتەوەو بە زیرەکیانە بەکاری بێنێ.

دووەم: بەردەوامی، واتە سوور بوون و درێژەدان بەو هەوڵانەت کە لە فێربوونی زانست و زانیاری نزیکت دەکەنەوە، نابێ مرۆڤ بێزار بێ و نەفەسی کورت بێ، چونکە فێربوونی زانست و زانیاری کارێکی گران و پڕ لە کێشەیەو هەموو کەسێ بەرگەی ناگرێ، یەکێك لەو هۆکارانەی کە زانایانیش پلەوپایەو پاداشتیان لە هەردوو دنیادا زۆر بەرزە، ئەم بەردەوامی و زەحمەت و شەونخونیەیە.

سێهەم: کۆشش کردن و هەوڵدان، بە چەندەها جۆر و چەشن کە ئەمەش دەبیچتە مایەی ماندوکردنی مێشك و جەستەو مرۆڤی هەموو تەمەنی جوانی و هەرزەکاری و لاوێتی خۆی لە پێناویدا دادەنێ، کاتێك دەبێتە زانا و دانا کە تەمەنی لاوێتی نەماوەو تێپەڕیوە.

چوارەم: ڕەوانبێژی و کامڵی و زمانپاراوی، کەسێك بیەوێ لە هەر زانستێکدا سەرکەوتوو بێ و بۆ خۆی فەرهەنگێك بێ لە ڕێزمان و وشەسازی و زاراوەناسی ئەو زمانە زانستیە، هەروەها پەراوەو خۆڕاهێنان لەسەر زمانڕەوانی و زمانپاراوی و هونەرەکانی بەکارهێنانی وشەو زاراوە و یاساکانی ڕێزمان و زانستی دەنگ و گەلێ لایەنی تر کە دەبنە مایەی دەوڵەمەندی لایەنی زمانەوانی ئەو کەسە.

پێنجەم: هاوڕێیەتی کردنی مامۆستا، چونکە بۆ فێرخواز تەنها ئەوەندە بەس نیە کە هەر لە کاتی وانە خوێندنەکەیدا لەگەڵ مامۆستاکەیدا بێ، بەڵکو پێویستە لە گەشت و سەیران و چوونە دەرەوە و ژیانی کۆمەڵایەتی و پیشەییشیدا لێی نزیك بێ، سود و پەند و وانە لە ژیانی کرداریانەو مەیدانیانەی ئەزمونی ژیانی مامۆستا وەربگرێ، ئەم خاڵە یەکێکە لەو مەرجە گرنگانەی کە دەبێ ڕەچاو بکرێ، بۆ نموونە فەقێکانی حوجرە بۆچی زیرەکترن لە قوتابیانی قوتابخانەکان لەم سەردەمەداو لە سەردەمی ڕابردووشدا فەقێکان بوون کە بوون بە شاعیر و زانا و ئەدیب و مێژوونووس و ...هتد، چونکە ئەوان هاوژیان بوون لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەی مامۆستادا، پێکەوەبوونی مامۆستا و قوتابی لە مەیدانی ژیاندا و لەڕووی پراکتیکیەوە، زۆر جیاواز ترە لە وانە خوێندنێکی وشك لەسەر کورسی ڕەق و تەق بە شێوەی تیۆری.

شەشەم: تەرخان کردنی کاتی پێویست و تەواو بۆ فێربوون، واتە خشتە دانانێت بۆ دابەش کردنی کات بەسەر وانەکاندا بەڵکو ئامانج دیاری دەکەیت، کە ئامانجەکەش بریتیە لە فێربوونی تەواوەتی ئەو زانستە، کەواتە هەر دەبێ کەسەکە بە تەواوەتی ئەو زانستە فێر بێ، ئیتر کاتی کەم یان زۆری دەوێ ئەوە کێشە نیە، تەنانەت زۆرجار وا پێویست دەکات کە مرۆڤ لە هەموو چێژ و خۆشی و پەیوەندیە خێزانی و کۆمەڵایەتی و خزمایەتیەکانی دابڕێت و بە تەواوەتی خۆی تەرخان بکات بۆ فێربوونی زانست و زانیاری.[1]

## شروط تحصيل العلم ستة

أخـــي لَـــنْ تَنَـــالَ العِلْـــمَ إلاَّ بِسِـــتَّةٍ سَـــأُنبيك عِـــنْ تَفصِـــيلهَا بِبَيَـــانِ

ذَكـــاءُ، وَحِـــرْصٌ، واجْتِهَـــادٌ وَبُلْغَـــةٌ وَصُـــحبَةُ أُسْـــتَاذٍ، وَطُـــولُ زَمَـــانِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١١٣):

### (شەش مەرجەکانی فێربوونی زانست و زانیاری)

بـــــــرام، زانســـــــت بـــــــەدەست ناخـــــــەی

بـــــــێ بـــــــوونی، ئـــــــەم شـــــــەش مەرجانـــــــە

وا پێـــــــت ئەڵێـــــــم: زۆر بـــــــە کورتـــــــی

تـــــــۆش هـــــــەموویان بـــــــاش بـــــزانـــــــە

زیرەکـــــــی، بـــــــەردەوامی، کۆشـــــــش، زمانپـــــــاراوی

هاورێیـــــــەتی مامۆســـــــتا، تـــــــەرخانکاتیی تـــــــەواوی

(١) ص٨١/شروط تحصيل العلم ستة/ أخي لن تنال العلم إلا بستة.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١١٤)

کەسی وا هەیە زۆر هەوڵ دەدات بۆ گەیشتن بە شتێك، بە تایبەتی پارەو پول، بەڵام هەر ناگات بەوەی کە دەیەوێ، لەبەرئەوە لە ناخی خۆیدا زۆر خەم و خەفەتی بۆ دەخوات، هەمیشە خەمبار و کۆستکەوتووە، بزەیەك لەسەر لێوانی نابینی، بەڵام پێشەوا شافیعی خ.ل چارەسەرێکی زۆر باشتری لەم هۆنراوەیەدا دیاری کردووە، کە ئەویش قەناعەتە، مرۆڤ کە ڕازی بوو بەو بەشەی هەیەتی و لە هەوڵی باشیشدا بوو، بۆ زیادکردنی بەشەکەی، ئەوا دەوڵەمەندترین کەسە، پاراستنی کەسێتی و ڕێزگرتنی دەروونی خۆت زۆر باشترە لە دنیایەکی خەیاڵی بێ قەناعەتی پڕ لە ناڕازی بوون، شافیعی دەفەرموێت:

داوام لە کەس نەکردووە تاکو هاوکاریم بکات، بۆ ئەوەی سبەینێ نەیداتەوە بە چاومداو منەتبارم نەکات، خەڵکەکەش نەڵێن: فلانە کەس چاکە و پیاوەتی زۆری بەسەر فلانە کەسی ترەوە هەیە، من نامەوێ لە کەسێتی خۆم کەمتر سەیر بکرێم، جا ئەگەر کەسێك بە کەم و بچووکتر لە کێشی خۆم بۆی ڕوانیم، ئەوا منیش بە هەمان شێوە بۆی دەڕوانم، بەڵام ئەگەر کەسێك بە ڕێز و حورمەتەوە بە تەواوەتی من ببینێ و بە کەم و سووك سەیرم نەکات، ئەوا منیش وا بۆی دەڕوانم، خۆم لە کەس بە کەمتر نازانم، ڕێگەش نادەم هەر من بچوك بکرێمەوەو کەچی بە گەورەش سەیری کەسانی تر بکەم، بە کورتی چۆن بۆم دەڕوانی، منیش وا بۆت دەڕوانم.[1]

### اكرام النفس

قَنعْتُ بالقُوتِ مِنْ زَمَاني ... وَصُنْتُ نَفْسِي عَنِ الهَوانِ
خَوفاً مِنَ النَّاسِ أنْ يَقولُوا ... فَضْلُ فُلانِ عَلى فُلانِ
مَنْ كُنْتُ عَنْ مَالِهِ غَنِيّاً ... فَلاَ أُبَالي إذَا جَفَاني
وَ مَنْ رَآنِي بِعَينِ نَقْصٍ ... رَأَيْتُهُ بالَّتي رَآنِي
وَ مَنْ رَآنِي بِعَينِ تَمٍّ ... رَأَيْتُهُ كَامِلَ المَعَانِي

(١) ص٨١/ اكرم النفس/ قنعت بالقوت من زماني/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١١٤):

## (ڕێزگرتنی خود)

قەناعـــەتم بـــەو قووتـــە کـــرد، کـــە هەمـــە لـــە چـــاخی خۆمـــدا
پاراســـتم لـــە کـــاری بـــەدی، ئـــەو دەرونـــەی لـــە ناخمـــدا
لـــە ترســـی ئـــەوەی، کـــە خـــەڵکی هـــەرگیـــز نەڵێـــن:
زۆرە چـــاکەی فـــلانی بەســـەر فیســـاردا
کـــە بـــە مـــاڵ دەوڵەمەنـــدتر بم، لـــە کەســـێك
گـــوێ نـــادەمێ هـــەرچـــی دێ بەســـەر گیانمـــدا
کەســـێك کـــە بەچـــاوی (کـــەمیی) بـــۆم بڕوانـــێ
ئـــەویش وایـــە لـــە تێـــڕوانینـــی ئـــەمندا
بـــەڵام کەسێـــك وەکـــو تـــەواو مـــن دەبینـــێ
ئـــەوا دیومـــە لەوپـــەڕی مانـــای تـــەواودا

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١١٥)

بەشـی هـەرەزۆری تـاوان و خراپـەکانمان بەرهـەمی خـراپ بـەکارهێنانی زمانمانـە، زمانمان لەودیوی دوو دەرگاوە وازناهێنێ، دەرگای یەکەم لێوەکانە، دەرگای دووەم پـوك و ددانەکانمانـە، کەواتـە ئـەو جۆرە زمانـە ئەگـەر نەیبەستیتەوە، هـەروەکو لایـەکی خـودا بەستویەتیەوە بـە مەلاشـومانەوە، لایەکـەی تریشـی دەبـێ خۆمـان بیبەستینەو، ئەوا وەکو ماری هار وایە، پێمانەوە دەدات، توشمان دەکات.

شافیعی خ.ل دەفەرموێ: بڕۆ سەردانی گۆڕسـتان بکـە، زۆربـەی ئەوانـەی مـردوون بەهۆی کەتنی زمانیانەوە بووە، یاخود ئێستا لەناو گۆڕەکانیان سزا دەدرێن بەهۆی بەدا بەکارهێنانی زمانیانەوەیە لە دنیادا. بەتایبەتیش زمانی کەسی نزیك و دۆست و هاوڕێ.[1]

---

(١) ص٨٢/ حصاد الألسن/ احفظ لسانك ايها الأنسان/

## حصاد الألسن

احْفَــظْ لِسَــانَكَ أَيُّهَــا الأنْسَــانُ    لاَ يَلْـــدَغَنَّكَ إِنَّـــهُ ثُعْبَـــانُ

كَـمْ فِي المَقَـابِرِ مِـنْ قَتِيـلِ لِسَـانِهِ    كَانَـــتْ تَهَـــابُ لِقَـــاءَهُ الأَقْـــرانُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١١٥):

### (بەرهەمی زمان)

بپـارێـــــزە، زمــــــانی خـــــۆت، ئـــــادەمیزاد

ئــــەوە مــــارە، وریابــــــە پێتــــەوە نــــەدات

گـــــەلێ گــــۆڕ هــــەن، کــــە کــــوژراوی زمانیانــــە

بــــە کــــەتنی زمــــانی دۆســــتی گیــــانی دەرهــــات

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١١٦)

زۆربەی ئەو کەسانەی کە وەك پێویست هەوڵ نادەن و کارناکەن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی خۆیان، سەرەنجام شکستی دێنن، ئیتر دەکەونە بڕوبیانوو هێنانەوەی نەگونجاو، هەندێ لەوانە دەڵێن: شانس و بەختم نیە، یان خەتای زەمانەیەو.. هتد بەڵام شافیعی خ.ل دەفەرموێ: ئەوە خۆمانین کە بیانوی سەرنەکەوتنی کارەکانمان لە خۆمان دادەڕنین و زمان و کات تاوانبار دەکەین و دەڵێیت: خەتای ئێمە نیە و خەتای زەمانەیە، لە ڕاستیدا کەچی و نەنگی و خەتا و کەم و کوڕییەکە لە خۆمانەوەیە، چەرخی زەمانە بۆ هەموو کەسێ وەکو یەکە، ئەی بۆچی کەسانی تر هەر لەو زەمانەی خۆتدا توانیویانە بگەنە سەرکەوتن و هێنانەدی خواست و ئامانجەکانیان؟

ئێمە زمانمان هەیە، توانای قسەو ڕەخنەگرتنمان هەیەو بە ئارەزووی خۆمان ڕەخنە لە زەمانە دەگرین، بەڵام چونکە زەمان زمانی نییە، بێ دەنگە، ئەگەر ئەویش زمانی هەبووایە دنیایەك ڕەخنەی لە ئێمە دەبوو، سکاڵای لە دەست ئێمە

دەکرد، هیچ نەبێ دەیگوت: گورگ گۆشتی گورگ ناخوات، کەچی ئێوەی مرۆڤ بە ئاشکرا لەنێو خۆتانا بوونەتە چەندین گروپ و دەستەو لایەن و دوژمنایەتی یەکتری دەکەن و یەکتری دەکوژن و دەبڕن.[1]

## البلاء من أنفسنا

نَعِيْـــبُ زَمَانَنَـــا وَالعَيْـــبُ فِيْنَـــا    وَمَـــا لِزَمَانِنَـــا عَيْـــبٌ سِـــوَانَا
وَنَهجُـــوا ذَا الزَّمـــانِ بِغَـــيرِ ذَنْـــبِ    وَلَـــوْ نَطَـــقَ الزَّمَـــانُ لَنَـــا هَجَانَـــا
وَلَـــيْسَ الـــذِّئْبُ يَأْكُـــلُ لَحْـــمَ ذِئـــبٍ    وَيَأْكُـــلُ بَعْضُـــنَا بَعْضـــاً عَيَانَـــا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١١٦):

## (بەڵاکە، لە خۆماندایە)

تانـــە، لـــە زەمانـــە دەگـــرین، کەچـــی کـــەمیش لـــە خۆمانـــە
چـــەرخی زەمانـــە، بـــێ کەچـــە، هـــەمووی تـــاوانی خۆمانـــە
تـــاوان، دەپێچینـــە زەمـــان، لـــە کاتێکـــا بـــێ گوناهـــە
گـــەر زمـــانی هـــەبا[2] زەمـــان، ســـکاڵای بـــوو، لـــەڕوومانا
گـــورگ، گـــۆشتی گـــورگ نـــاخوا، لێـــی لادەدا
کەچـــی، ئێمـــە یـــەکتر دەخـــۆین، ئاشـــکرا لەنێـــو خۆمانـــا

---

(١) ص٨٢/ البلاء من أنفسنا/ نعيب زماننا والعيب فينا/

(٢) هەبا: هەبووایا.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١١٧)

کەسانێك بوون بە پاشا، بەرپرس، دەسەڵاتدار، درێژەیان بە دەسەڵاتی خۆیاندا و ماوەیەکی زۆری خایاند، کەمێك لەوانە نەبێ، کە لە خۆیان بایی نەبوون و وایان دادەنا کە هەر پاشا و دەسەڵاتداریش نین، بەڵکو وەکو کەسێکی ئاسایی و سادە دەژیان و بە دادپەروەری حوکمیان دەکرد، بەڵام زۆرینەی کاربەدەست و بەرپرسان وانەبوون، بەڵکو پلەوپایە و دەسەڵاتی خۆیان بەکارهێنا بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان و دەستیانکرد بە ستەم و کوشت و بڕ و نادادی.

جا ئەگەر ئەم بەرپرس و کاربەدەستانە، لە کاتی دەسەڵاتی خۆیاندا بە ویژدان و قەدرەوە مامەڵە دەکەن، بەڵام زۆربەیان زێدەڕەوییان کرد، ستەمیان کرد، بۆیە سزای زەمانە و دەسەڵاتی خودا توشی کوێرەوەری و ڕیسوایی و خەم و ئازاری کردن، وایان لێ هات بەرانبەر هەر تاوانێکی ڕابردوویان سزایەکی هاوشێوەو گونجاویان چەشت، وەکو ئەوەی کە بە زمانی حاڵ پێیان گوترا بێ، ئەمەش بەرانبەرە بەوە هەروەکو چۆن خوای گەورە (صدام حسین)ی لەناو نەبرد هەتا بە چاوی خۆی مەرگی کوڕەکانی خۆی بینی، ئەمەش لە بەرانبەر ئەو تاوانەی کە هەزاران دایك و باوکی جەرگبڕاو کرد، ئەمە جگە لە سزای قیامەتی ستەمکاران.

ئیتر لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە زەمان دەسەڵاتی نیە و نابێ کەس تانە لە زەمانە بدات، ستەم قەرزێکە و هەر دەبێ بیدەیتەوە، ئەگەر لەو دنیاش بێ.[١]

### مثلما تدين تدان

تَحكَّمُــوا فَاســتَطَالُوا في تَحكُّمِهِــم وَعَمَّــا قَليـلٍ كَـأنَّ الأمْـرَ لَـمْ يَكُـنِ

لَوْ أنْصَفُوا، أُنصفو لكِنْ بغَـوا فَبَغَـى عَلَــيهِمُ الــدَّهرُ بــالأحزانِ والمحَــنِ

فَأَصْـبَحُوا وَلِســانُ الحَــالِ يُنْشِــدُهُمْ هَــذَا بِــذَاكَ وَلاَ عتــبٌ عَلَــى لــزَمَنِ

---

(١) ص٨٢/مثلما تدين تدان/ تحكموا فستطالوا في تحكمهم/

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١١٧):

### (قەرزدانەوەی دەوڵ)

فـــــەرمانڕەوا بـــوون، درێــــژەی بـــوو، دەسەڵاتیـــــان
کــەمێك نــەبێ لـــەو کەســانە، لـــە ســتەما، نــەبوو نـــاویان
ویـــژدانیـــــان بـــــا، ویـــــژدان دەهاتــــــەوە ڕێیـــــان
ســـتەمیانکرد، بۆیـــە ڕۆژگـــار، خـــەم و ژانـــی تۆشـــی پێیـــان
وایـــان لێ هـــات، بـــەزاری حـــاڵ، کـــە دەیـانگـــوت:
تۆڵـــە، بەرانبـــەر تۆڵەیـــە، کـــەس چـــاخی تاوانبـــار نـــەکرد

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١١٨):

ئەگەر دەتـەوێ سـەلامەت و بێ وەی بـژی لـەم دنیایـەداو بـاوەڕ و ئابڕووشـت پارێزراو بن، ئەوا هەرگیز زمانت بە خراپ مەهێنە گۆ، عەیب و ناتـەواوی ئـەم و ئـەو باس مەکە، لە کاتێکدا خۆت هەموو لەشت کـەم و کـوڕی و ناتەواویـە، جـا خـۆ ئـەو خەڵکانەش وەکو تۆ چاویان هەیـەو کـەم و کـوڕی تـۆ دەبیـنن و زمانیشـیان هەیـە، تاکو بڵاوی بکەنەوە و ڕایگەیەنن چاو بۆ کەم و کوڕیی خەڵکی مەگێڕە، بەڵام ئەگەر چاوەکانی خۆت بۆ دۆزینەوەی ناتەواویەکانی خودی خـۆت گـەڕان لـە خۆتـدا، ئـەوا جڵەو بۆ چاوەکانت شل بکە، با بەوردی کەم و کوڕییـەکانی خـۆت بـۆ دەستنیشـان بکەن، بە چاوەکانی خۆشت بڵێ: ئەی چاوەکانم، خەڵکیش چـاوی هەیـە، بـە چـاکە کاریانـە لەگـەڵ خەڵکیـدا هەڵسـوکەوت بکـە، لێبـوردە بـە بەرانبـەر ئـەو کەسـانەی مافەکانت دەخۆن، بەڵام ئەوەش لە سنوری ڕەواداو بـە جـۆرێ کـە ئـەو لێبوردنـەت قازانجی زیاتری دنیایی یان قیامەتی تێدا بێ بۆ خۆت لە لێنەبوردنەکەت، خۆ ئەگەر وانەبوو ئەوا بەرگری لە خـۆت و مافـەکانت بکـە، وریابـە لـەم بەرگریکردنەشـدا هـەر

شێوازی چاك و چاكەخوازانە هەڵبـژێرە، چـونكە هـەرگیز مـرۆڤ ناتوانـێ لـە ڕێگـەی خراپەوە داوای چاكە بكات.[1]

## كلك سوءات وللناس أعين

إذَا رُمْـتَ أنْ تَحْيَـا سَـلِيْمًا مَـنَ الـرَّدَى وَدِينُــكَ مَوفُــورٌ وَعِرْضُــكَ صَــيِّنُ

فَـلاَ يَـنْطقنْ مِنْـكَ اللِسَـانُ بِسـوأةِ فَكلّــكُ سَــوءَاتٌ وَلِلنَّــاسِ ألسُــنْ

وَعَيْنَــاكَ إنْ أبـدَت إليــكَ مَعَائبـاً فَـدعْهَا، وَقُـلْ يَـا عَـينُ لِلنَّـاسِ أعْـينُ

وَعَاشِرِ بمَعْروفِ، وسَـامِحْ مَـنِ تعتَـدَى وَدَّافِـعْ وَلكِـنْ بـالتي هِـي أحْسَـنُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١١٨):

## (هەموو لەشت نەنگییە، ئەو خەڵكەش چاویان هەیە)

دەتــــەوێ، بــــێ وەی بــژی، دوور لـــە گێچـــەڵ، لـــە ژینـــا
ئـاینـــــت خـــــاوێن بێــــــت و، ئابڕوشـــــت لـــــە پـــــەرژینا
زمـــــان هـەڵمەسوڕێنــــــــە، بڵێــــــی خــــــەڵكی لەكەیــــــە
كـە بـۆ خـۆت هـەر لەكـەی و، ئـەو خەڵكـەش چـاوی هەیـە
كـــە زانیــت ئــەوا چـــاوت، بــۆ لەكــەی خــۆت دەگــەڕێ
بڵــــێ: ئــاخر ئــەو خەڵكــەش، چـــاوی هەیـــە، لێگــەڕێ
بـــاش بـــە، لـــە پەیوەنــدیتا، ببـــورە لـــە مـــافخۆران
بـــــەڵام بـــــەرگریش بكــــە، بــــە شـــــێوازێكی زۆر جـــوان

---

(١) ص٨٤/ كلك سوءات وللناس أعين/ اذا رمت ان تحيا سليما من الردى/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١١٩)

جەوهەری گومان وایە، هەمیشە بەلای خراپی دایە، لەناو بیری مرۆڤیش دا بەهێزترین توانا، بریتیە لە توانای (بەدگومان)ی، بۆ نمونە: کە گومان بە خراپی ڕەوشتی کەسێك دەبەی، ئەوا مێشك و بیرت سەدان بەڵگەو وێنەی خراپی ئەو کەسەت بۆ دەخاتە بەر بیرو نیگا، کەچی کە بتەوێ گومانی باش بە کەسێك بەریت، بیرت ئەوەندە بە دەمتەوە نایات بەڵکو تەنها کەمێك وێنەو ڕەفتاری باشی ئەو کەسە دەبینی و هێشتا دڵت هەر ترپەی دێت بۆ لای گومانە خراپەکە.

کەچی لە ڕاستیدا هیچ کەسێك نیە، کە لە ڕێی گومانی خراپی خۆی و کردەوە دزێو و خراپەکانیەوە گەیشتبێتە پلەو ئاستی چاك و پڕ بە دڵی خۆی، کە چێژی ئاسودەیی خۆی لێ ببینێ.[1]

### مساءة الظن

لاَ يَكُــــــنْ إلاَّ سَــــــيِّئَنَا　　إنَّ سـوءَ الظَّـنِ مِـنْ أقْـوى الفِطَـنْ

مَــا رَمَــى الإنْســانَ فِي مَخْمَصَــةٍ　　غَيْـرُ حُسْـنِ الظَّـنِ وَالقَـولِ الحَسَـنْ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١١٩):

### (بەدگومانیی)

گومانـــــی تـــــۆ، هــــەر بـــــەلای خراپـــــی دایـــــە

لــــە بیـرتــــدا (بـــەد گومـــانی) بـــەهێزترینی توانایـــە

کــــەسیش نیـــــە، بـــــە خواســــتی خــــۆی گەیشــــتبێ

مەگــــەر ئـــەوەی گومــــان بـــاش و کـــاری باشیشـــی کردبـــێ

(١) ص٨٤/ مساءة الظن/ لايكن ظنك الا سَيئاً/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٢٠)

کەسانێك هەیە، لەناو بەندەکانی خودادا، کە هێندە پەرۆشی ئەوەن خودا لێیان ڕازی بێت و دواتر پاداشتی بەهەشتی نەبڕاوەیان دەست بکەوێ، زۆر بایەخ بە دنیا نەدەن، بگرە بە تەواوەتی وازیان لە باق و بریقی دنیا هێناوە، بەو ئومێدەی پارێزراو بن لە بەلاو گێچەڵەکانی دنیا و لە کاری قیامەتیانەیان سارد نەبنەوە، ئەو کەسانە بە وردی لە دنیا وردبوونەوەو، ناسیویانەو، چاك هەڵیان سەنگاندووە، بۆیان ڕوون بووەتەوە کە، ئەم دنیایە بۆ ئەوە نابێ، وەکو ماڵ و نیشتمان تەماشا بکرێ، لەبەرئەوە وەکو زەلکاوێکی لێخن دایاننناوەو خواپەرستی و کاری چاکەشیان کردووە بە بەلەم، یان کەشتیەك و بە هۆیەوە لەم زەلکاوە پەڕیونەتەوەو خۆیان گەیاندووەتە، ئەوبەری ئەم دنیایە، کە بریتیە لە دنیاکەی تر.[1]

### سفينة المؤمن

إِنَّ للهِ عِبَــــــــــاداً فُطَنَـــــــــا تَرَكُــوا الــدُّنيَا وَخَــافوا الفِتَنَــا
نَظَــرُوُا فِيهَـــا فَلَمّـــا عَلِمُـــوا أنهَـــا لَيْسَـــتْ لِحَـــيٍّ وَطَنَـــا
جعَلُوهَــــــا لُجَّــــةً واتَّخَــــذُوا صَـــالِحَ الأَعْمَـــالِ فيهَـــا سُـــفُنَا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٢٠):

### (کەشتی باوەڕدار)

خـــودا، کەســـی ژیـــری هەیـــە، لـــە بەنـــدەکان
تەرکـــە دنیـــا، هـــەر لەبـــەر ترســـی فیتنـــەکان
وردبوونـــــــەوە.. ! کـــــــە زانیـــــــان
دنیـــــا، ناشـــــێ بـــــۆ نیشـــــتمان
ســـــــــدایاننا، کـــــــە دەریایەکـــــــە
کـــــاری باشـــــیش، وەك (کەشـــــتی)یان

---

(١) ص٨٤ ص٨٥/ سفينة المؤمن/ ان الله عباداً فطناً/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٢١):

لە خۆتەوە لەگەڵ خەڵکی مەبەرە هاوڕێ، خەڵکی بە باشی هەڵبسەنگێنە، بیانکێشە، بیانپێوە، بزانە لە کام ئاست و کێش و نرخدان، چونکە خەڵکی تۆیان کێشاوە تۆش بەو کێشانەو تەرازووە ئەوان بکێشە، کە تۆیان پێ کێشایت، تەنانەت تۆ ئەو شتەش، یان ئەو سەنگەش بکێشە کە تۆی پێ کێشراویت، یان کە خەڵکی پێ دەکێشیت.

بۆ نموونە لە ئەنجامدا بۆت دەردەکەوێ کە پێویستە هاتوچۆی ئەو کەسانە بکەیت، کە هات و چۆت دەکەن، ئەوەی کە بێ وەفایە تۆش بەرانبەری وابە. هەرکەسێ گومانی وابوو کە بوونی تۆ بەندە بە بوونی ئەوەوە، ئەوا مانای وایە تۆی بە سفر داناوە، تۆش لێی دروبکەوەرەوە، تێکەڵاوی مەبە، وازی لێ بێنە، چونکە لەژێر چەتری ئەو بۆچوونە خۆپەرستانەیەدا درەختی کەسێتی ئازاد و سەربەخۆ دروست نابێ، با ئەو بۆچوونە هەڵەیەی خۆی هەر لە ناخی خۆیدا بێ و بەو خەم و گومانەوە بمرێ.

باش وایە کەس لە خۆت بە گەورەتر نەبینی و بگەڕێرەوە بۆ لای خودای گەورە، کە گەورەیی ئەو جیاوازە لە خۆبەگەورە زانینی مرۆڤ، بچووکی لە ئاستی گەورەیی خوادا گەورەت دەکات، بەڵام بچوکی لە ئاستی گەورەیی خەڵکیدا بچوکت دەکاتەوە.

دڵنیابە هەرچی هەیتە، هی خودایە و کەس ناتوانێ هیچت بداتێ هیچت لێ بسەنێ.[1]

---

(١) ص٨٥/ زن بما وزنت به/ ذن بمن وزنك بما/

### زن بما وزنت به

زِنْ مَـــنْ وَزَنْــكَ، بِمَــا وَزَ نْــك وَمَــا وَزَنْــكَ بِـــهِ فَزِنْـــهُ
مَـــنْ جَـا إليــكَ فَـرُحْ إليــــه ومَـــنْ جَفَــاكَ فَصُــدَّ عَنْــهُ
مَـــنْ ظَـــنَّ أنَّـــكَ دُونَـــهُ فَـــاترُكْ هَـــوَاهُ إذَنْ وهِنْـــهُ
وارْجِـــعُ إلَـــى رَبِّ العِبَـــا دِ فَكُـــلُّ مَــا يَأتِيــكَ مِنْـــهُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٢١):

### (بکێشە بەوەی پێی کێشرایت)

بکێشـــە کەســـێ، کـــە کێشاویـــــە، تـــۆ
ئـــەوەی پێـــی کێشـــرای، ئـــەویش بکێشـــە
کـــێ سەردانـــت کـــا ، ســـەردانی کـــە تـــۆ
لـــە بـــێ جەفایـــان هـــامشـــۆ ببـــڕە
کەســـێ، پێـــی وابـــێ، بـــێ ئـــەو، هیچـــی تـــۆ
وازی لێ بێنـــــە، خـــــۆی و گومـــانی
بگـــەڕێرەوە، لای خـــــودا، ئـــەتـــۆ
هـــی ئـــەوە، هەرچـــیت هـــەیە ئێســـتاکە
یـــان، کـــە پێـــی داوی، وەیـــان دێ بـــۆ تـــۆ

### دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٢٢):

تـەماح و چاوچـنۆکی نـاهێڵن سـاتێك ئاسـودە بـین، لـەم بارەیـەوە شـافیعی خ.ل دەفـەرموێت: حـەز و ئـارەزووە چاوچـنۆکیەکانم سـەرکوت کـرد، بـەوە دەروونم حەسایەوە، چونکە دەروون سروشتی وایە، هەتا زیاتر تەماعی بخەیتە بەردەم زیاتر خۆی بۆ سوك و سەلیم دەکات. هـاتم قەناعـەتم بوژاندەوە، کـە مـرد بـوو، چـونکە

بەهۆی زیندوویی ئەوەوە ئابڕویەکی پارێزراومان دەبێ کەسێك چاوچنۆکی ناو جەرگەی دڵی داگیر بکات، ئەوا دڵی سوك و بێ نرخی دەکا، ڕیسوای دەکا.[1]

## تأتي العزة بالقناعة

أَمَتُّ مَطَامِعي فَأَرْحتُ نَفْسِي فَإِنَّ النَّفْسَ مَا طَمِعَتْ تَهُونُ

وَأَحيَيْتُ القُنُوعَ وكَانَ مَيْتَاً فَفِي إحيائِهِ عِرْضٌ مَصونُ

إذَا طَمَعٌ يَحلُّ بِقَلبِ عَبْدٍ عَلَتْهُ مَهَانَةٌ وَعَلاَهُ هُونُ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٣٢):

### (سەروەری بە قەناعەت دێتە دەست)

ئارەزووە چڵێسەکانم، لە دەروون، لە بێخ دەرهێنا

ئەوسا زانیم چەند دەرونم حەسایەوە

ئەم دەروونە هەر خووی وایە

هەتا زیاتر چاوچنۆك بوو، زیاتر ڕیسوا کرایەوە

قەناعەتم بوژاندەوە، لە کاتێکدا کە مرد بوو

(پاراستنی ڕێز و ئابڕوو) بەو بوژانە، بوژایەوە

کەسێ کەوا (چاوچنۆکی)، ناوجەرگەی دڵی داگیرکا

دڵی هەر سووکتری دەکا، ڕیسوایی بۆ کرایەوە

(١) ص٨٦/ تأتي العزة بالقناعة/ أمت مطامعي فأرحت نفسي/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٢٣)

قسەکردن، هونەر و زانستی خۆی هەیە، کەسی وا هەیە، زۆر قسە دەکات، بەڵام قسەکانی هەموویان شتی زیادەن و پێویست نین، بەڵکو شێوازی سەرکەوتوو ئەوەیە کە بە کورتی و بە چەند وشەیەك ئامانجەکەت بپێکیت و زوو بگەیتە سەرچاوەکەو بە جۆگەلەکاندا نەڕۆیت، ئەگەر کەسێ قسەی زۆری تێکهەڵکیش دەکرد، نەیدەزانی چۆن قسەکانی کورت بکاتەوە، ئەوا باشتر وایە بێ دەنگ بێت، نەك نەزانێ لە کات و شوێنی خۆیدا قسە بکات، هەر کەسە و کەسێتی و سیمای تایبەت بە خۆی هەیە، شێوازی قسەکردن هۆیەکە بۆ نیشاندانی سیمای کەسێتیەکەی.[1]

### الصمت خير من حشو الكلام

لاَ خَيْــرَ فِي حَشْــوِ الكَــلا ... مِ إِذَا اهْتَــدَيْتَ إِلى عُيونِــه

والصَّــمْتُ أَجْمَــلُ بــالفَتَى ... مِــنْ مَنْطــقٍ فِي غَــيرِ حِيْنِــه

وَعَلَــى الفَتَــى لِطبَاعِــهِ ... سِــمَةٌ تَلُــوحُ عَلَــى جَبِينِــه

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٢٣):

### (بێ دەنگی باشترە لە قسە فڕێدان)

گەر دەتەوێ بچیەوە سەر سەرچاوەی ڕاستەقینە

بێ دەنگی گەلێ باشترە لە وتەو قسە فڕێدان

بۆ لاو، چەند جوانە بێ دەنگی و زۆرنەبێژی

دەم داخستن زۆر باشترە لە بێ جێی قسە وەشان

هەموو کەسێ، سروشتی سیمای خۆی هەیە

چەندێ جوانە ئەو سیمایە دەرکەوتوو بێ لەناوچاوان

---

(١) ص٨٦/ الصمت خير من حشو الكلام/ لا خير في حشو الكلام/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٢٤):

ناچارین، هەموومان دەبێ چاوەڕوانی مەرگ بکەین، ئێستا دێت، ئێستاش نەیەت، دواتر هەر دێت، ئەگەر من ئەم جارەشیان بەرنەکەوتم، ئەوا خۆشەویستێکم بەر دەکەوێ، مەرگی ئازیز و خۆشەویستانیش هەر خۆی جۆرە مەرگێکە و هیچی وای کەمتر نیە لە مردنی خۆمان.[1]

### موت الأحبة

سَأَصْـــبِرُ للحِمَـــامِ وَقَـــدْ أَتَـــاني وإِلاَّ فهـــو آتٍ بَعْـــدَ حِـــين

وإِنْ أَسْـــلَم يمـــتُ قَبْلـــي حبيـــبٌ ومـــوتُ أحِـــبَّتي قَبْلـــي يَســـوني

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٢٤):

### (مەرگی ئازیزان)

چـــاوەڕوانی مـــەرگم دەکـــەم، کـــە ئێســـتا هـــات
ئێســـتا نـــەبێ، لـــەدوای ئێســـتا هـــەر ســـەر ئـــەدات
کـــە مۆڵەتـــم پـــێ درا بـــێ، جـــارێ نـــەمرم
لـــەپێش خۆمـــدا مـــەرگ خۆشەویســـتان دەبـــات
بینینـــــــی مـــــــەرگی ئـــــــازیزان
مردنێـــــکە، هـــــەمان تـــــام و واتـــــا دەدات

---

(١) ص٨٦/ موت الأحبة/ سأصبر للحمام وقد أتاني/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٢٥):

کەسی وا هەیە، وا دەزانێ کەسانی بەرانبەری، فەرمانبەرەکانی بەردەستی، ئەندامەکانی خێزانەکەی، هەموویان منەتباری ئەون، لە هەودای منەت دروست کراون، وەکو ئەوەی کە بنەڕەتیەکە ئەوەو ئەوانی تر نانخۆرو منەتهەڵگری ئەون هەر لە ڕۆژی دروست بونیەوە، دە ئیتر واز لەو منەتە زۆرو خراپەی خۆت بێنە، من بۆ خۆم بە پاروە نانێك دەژیم و بەسمە، لە ئێستاوە تا دەخرێمە ناو کفنەکەمەوە.(١)

### المنة

رَأَيْتُكَ تكويني بِمِيْسَمِ مِنَّةٍ ... كَأَنَّكَ كُنْتَ الأَصلَ فِي يَومِ تكْويني

فَدَعْني مِنَ المنِّ الوخيم فَلقمَةٌ ... مِنَ العَيْش تَكفِيني إِلَى يَومِ تَكْفيني

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٢٥):

### (منەتکردن)

وات تێت گەیاند کە پێت وابێ، لە هەودای منەت چنراوم

گوایە ڕەسەنەکە منم، لەو ڕۆژەی دروست کراوم

منەتی ناشرین و پیسی خۆتم لێ لادە

بە یەك پاروو دەژیم لە ئێستا تا ئەو دەمەی کەلە کفنم نراوم

---

(١) ص٨٧/ المنة/ رأيت تكويني بميسم منة/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٢٦):

کارێك مەکە کە خەڵکی منەتیان بەسەرتەوە هەبێ، تەنها خۆت بە منەتباری خودا بزانە، بەختی چاکت بۆ دەرونت بوێ، ئارام بگرە لەسەر پێویستیەکانت، ئارام بگرە، چونکە ئارامگری و دان بەخۆداگرتن، وەکو قەڵا وایە بۆ ئەو کەسانەی کە منەتباری هیچ کەسێ نین، چونکە منەتباری بارێکی گران و قورسە لەسەر دڵ، ئازارەکەیشی بەژان تر و بەئێش ترە لەوەی ددانت کیس بکات، هەو بکات، خۆزگە بەو کەسانەی کارێك ناکەن کە منەتباری ئەم و ئەو بن.(١)

### مرارة تحميل الجميل

لاَ تَحْمِلَنَّ لِمَنْ يَمُنّ ... مِنَ الأَنَامِ عَلَيكَ مِنَّه

وَاخْتَرْ لِنَفْسِكَ حَظَّهَا ... واصْبِرْ فَإنَّ الصَبْرَ جُنَّه

مِنَنُ الرِّجَالِ عَلَى القُلُوبِ أشَدُّ مِنْ وَقْعِ الأسِنَّه

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٢٦):

### (تاڵیی هەڵگرتنەوەی جوانی)

منەتی هیچ کەس، هەڵمەگرە

کەوا منەتباری خودای

بەشە بەختت، بە دەرونده

ئارامگربە، ئارامگریی بۆتە قەڵای

ئەو کەسانەی منەتبار نین

منەتباری لەسەر دڵان، قورسە واتای

بەژانترە لە (دان کەوتن)، ژان و هەوای(٢)

---

(١) ص٨٧/ مرارة تحميل الجميل/ لاتحملن لمن يمن/

(٢) هەوای: هەوکردن و هەڵاوسانی پوك و ددان و کیس کردن.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٢٧):

کەسێك کێشەو کۆسپێکی بەسەر دێت، ئازیزێکی دەمرێت و پرسەدار دەبن، منیش دەچم سەرەخۆشی لێ دەکەم، دڵنەوایی دەکەم، ئەوەش لەبەرئەوە نیە، کە گوایە وا هەست بکەم، کە من نامرم، یان گوایە چاوم بریوەتە (هەرمان)و نەمریی، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە سونەتێکی ئاینە، ئەگینا نە خاوەن پرسە و نە ئەو کەسەش کە دڵنەوایی خاوەن پرسەکە دەکات لە ژیاندا بەردەوام دەبن، بەڵکو هەریەکەیان ماوەیەك دەژین و ئەوانیش وەکو مردووەکەی پێش خۆیان کۆچی دوایی دەکەن، کەواتە دڵنەوایی خۆت بکە، توێشووی ڕۆژی خۆت ئامادە بکە.(١)

### تعزية

إنِّـي أُعَزِّيـكَ لاَ أنـيٍّ عَلَـى طَمَـعٍ ... مِـنَ الخلـودِ وَلَكِـنْ سُـنَّةُ الـدِّينِ

فَمـا المُعَـزَّى بِبَـاقٍ بَعْـدَ صَـاحِبِه ... وَلاَ المُعَـزِّي وإنْ عَاشَـا إلَـى حِـينِ

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٢٧):

### (پرسە و دڵدانەوە)

دڵنەواییـت دەکـەم، بـەو مانـا، نـا، کـە پـێم وابـێ

(نـەمر)م مـن، سـونەتی دینـە، ئاوایـە، دەبـێ وابـێ

نـە دڵنەوایـی کـراو، دوای هاوەڵەکـەی دەمێنـێ

نـە دڵنەواکاریـش، گەرچـی ژینیـان کـەمێ مابـێ

(١) ص٨٧/ تعزية/ إنيّ اعزيك لا أني على طمع/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٢٨)

ئەسفەهانی دەڵێ: محمدی کوڕی عبدالرحمن گوتی: گوێم لێ بوو کە (محمدی کوڕی بەشیری ئابری) دەڵێت: گوێم لێ بوو (الربیع) گوتی: لە خزمەتی شافیعی دانیشتبووم، پیاوێك هات و قسەیەکی لەگەڵ ئیمامی شافیعی کرد، شافیعیش ئەم هۆنراوەیەی فەرموو، (مەبەست لە دێڕی یەکەمی هۆنراوەکەیە)، هەروەها دەڵێت: محمدی کوڕی ئیبراهیم دەڵێ: (عبدالعزیز)ی کوڕی (أبي رجاء) دەڵێ: (ربیع کوڕی سلیمان) وتی: بۆ (البویطي) نووسیبوویان کە لە بەندیخانەدا بوو، ڕەوشتت جوان بێ لەگەڵ کەسانی نامۆ و بێگانەدا لە بەندیخانەداو ئارامگریە، خۆت ڕابێنە، من گەلێك جار بیستوومە کە شافیعی دەیفەرموو: (لێرەدا دڕێی دووەمی هۆنراوەکەی مەبەستە).[1]

جُنُونكَ مَجْنُونٌ وَلَستَ بِوَاجِدٍ    طَبيباً يُدَاوِي مِنْ جنون جنونَ

* * *

أُهِينُ لَهُمْ نَفْسِي وَأكرِمُهَا بِهِمْ    وَلاَ تُكْرَمُ النَّفْسُ التي لا تُهِينُهَا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٢٨):

شەیدایی تۆ، شێتیە، حەکیمێ بەدی ناکەی

تا دەرمانی شەیدایی، شێتانەی لا پەیداکەی

* * *

دەروون دەشکێنم بۆیان، کە ئەوان ڕێزیان لابێ

دەروونێك ڕێزی نابێ، جاروبار نەشکێنرا بێ

---

(١) ص٨٨ ص٨٩/ قال الأصفهاني حدثنا محمد بن عبدالرحمن.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٢٩):

شافیعی خ.ل بەوە تۆمەتبار دەکرا کە (ڕافیزی)یەو زیاتر هۆگری بنەماڵەی (علی کوڕی أبی تالب)ە، بەڵام شافیعی ئەوە ڕەت دەکاتەوە، لە کاتێکدا لە باوانەوە خۆی دەچێتە وەسەر ئەو بنەماڵەیەو دەفەرموێ: با ئەوانە هەر قسەلۆکی خۆیان بڵێن، من ئەگەر بە دەربڕینی خۆشەویستی بۆ ئەوان ببمە ڕافیزی ئەوا جێگەی شانازیمە.[1]

### حب علي و بسطيه و فاطمة

إذَا فِـي مَجْلِـسٍ نَـذْكُرْ عَلِيـاً ... وَسِـبْطَيْهِ و فَاطِمَـةَ الزَّكِيَـة

يُقَـالُ تَجَـاوزُوا يَـا قَـوْمُ هَـذَا ... فَهـذَا مِـنْ حَـدِيثِ الرَّافِضِيَّة

بَرِئْـتَ إلَـى المُهَيمنِ مِـنْ أُنَـاسٍ ... يَـرونَ الـرَّفْضَ حُـبَّ الفَاطِمِيَّـه

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٢٩):

### (خۆشەویستی

### بۆ علی و دوو جگەرگۆشەکەی و فاطمە)

لــە کۆڕێکــدا، کــە بــاسی عــەلی دەکــرێ

وە، یــا، دوو جگــەر گۆشــەکــەی

وە یــا فاطمــەی پــاکیزە، کاتــێ کــە نــاوی دەبــرێ

لــەو قسـانە کــە دەوتــرێ، دەواز بێــنن، ئــەی خەڵکینــە

ئــەم قسانــە، لای ڕافیــزیەکان بــاس دەکــرێ

بــێ بــەریم مــن، لــەو خەڵــکانەی پێیــان وایــە

خۆشەویســتی، بــۆ فاطمــە، لایەنــی ڕافیــزی دەگــرێ

---

(١) ص٩٠/ حب علي و بسطيه و فاطمة/ إذا في مجلس نذكر علياً/

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٣٠):

نەفام و دووڕوو، هەر شتێکی خراپ دەڵێ، ئەوە لە بنەڕەتدا لە خۆیدا هەیە، ئەو کەسانە چەند تۆمەت و قسەی خراپ بە کەسانی باش بڵێن، هیچ زیانێکی نیە، هەروەکو چۆن چەند سەگێك بکەونە ئاوی فوراتەوە پیس نابێ.[1]

### الأعراض عن الجاهل

أعْـرِضْ عـنِ الجَاهـلِ السَـفيه     فَكُـلُّ مَـا قَـالَ فَهُـوَ فيـه

مَـا ضَـرَّ بَحْـرَ الفُـراتِ يومَـاً     إن خَـاضَ بَعْـضَ الكِـلاَب فِيـهِ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٣٠):

### (ڕەخنەگرتن لە نەفام)

ڕەخنە بگرە، لەو کاڵ فامە

کە هەرچی گوت، لە خۆیدا هەیە بیزانە

هیچ کاتێ فورات پیس نابێ

گەرچەند سەگێکی تێدا بێ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٣١):

کەسانی ناشایستە و نا خانەدان زۆرجار دەبنە خاوەن دەسەڵات و پارەوپول، تێرن، بێ کێشەن، کەچی کەسانی باش و خوناس و خانەزادە برسی و داماون، بەڵام کەسانی دی، کە بێ نرخ و سووکن گەدەیان پڕە لە خۆراکی نایابی وەکو گەزۆو گۆشتی باڵندەیەکی وەکو مێلاقە، کە وەکو کەوی سوێسکە وایە و تامێکی خۆشی هەیە.

---

(١) ص٩٠/الأعراض عن الجاهل/ اعرض عن الجاهل السفيه/

ئەمانە خودا لێیان بەئاگایەو قەدەرو بڕیاری ئەو وا بوو کە دنیا خۆران، لە دنیاو قیامەت بێ بەش نەکات کەسیش نیە کە بتوانێ دەسکاری بڕیاری خودا بدات.
شافیعی ئەمانەی لە نمونەی ئاژەڵاندا هێناوەتەوە لەم هۆنراوەیەدا.[1]

## حياة الأشراف واللئام

أرَى حَمْراً تَرْعَى وتُعْلَفُ مَا تَهْوى — وَأُسْداً جِيَاعَاً تَظْمَأُ الدَّهرَ لاتُرْوى
وأشْرَافَ قَوْمٍ لا يَنَالونَ قُتَهُمْ — وَقَوْمَاً لِئَامَا تَأكُلُ المَنَّ والسَلْوى
قَضَاءُ لِدّيان الخلائِقِ سَابِقٌ — وَلَيْسَ عَلَى مُرِّ القَضَا أحدٌ يَقْوى
فَمَنْ عَرَفَ الدَهْرَ الخؤُونَ وَصَرْفَه — تَصَبّرَ لِلبَلْوى وَلَمْ سُظْهِرِ الشَّكْوَى

دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٣١):

### (ژیانی خانەدان و ژیانی بێ وێڵ)

دەبینم، کەرگەل، لە پاوەن[2]، هەرچی حەز لێ بێ، لێی تێرە
کەچی ڕەوەی شێرەکانیش، تینو، برسین، لە جەنگەڵا، لە زەنوێرا
خانەدانی هۆزەکان و سەردارانی، بێ بژێون، داماون
گەدەی کەسانی بێ بەهاش، لە گەزۆ و مێلاقە[3] تێرە
ئەوەش بڕیاری پێشوەختی، خوای تاك و بەدیهێنەرە
کەسێ نیە، بەهێز تر بێ، لە قەزای خودا، کە دێرە[4]

---

(١) ص٩١/ حياة الأشراف واللئام/ أرى حمراً ترعى و تعلف ما تهوى/
(٢) پاوەن: شوێنی لەوەڕ، دەشتودەری پڕ گژوگیا.
(٣) مێلاقە: باڵندەیەکە وەکو سوێسکە وایە.
(٤) دێرە: دێرینە، کۆنە.

## خوێنەری بەڕێزم..!

تا ئێرە، ئەو هۆنراوانە بوون کە لەو دیوانەدا هەیە، کە (الزعبی) لە چاپی چوارەمدا، ساڵی ١٩٧١ چاپ و پەخشی کردووە، بەڵام هۆنراوەی تری شافیعی خ.ل لە نوسخەی تری دیوانەکانی تریدا هەیە، بەتایبەتی ئەو دیوانەی کە مامۆستا (مختار فوزی النعال) لەم ساڵانەی دوایی دا چاپی کردووە تا ئێستاش نوسخەکەی لە کتێبخانەکاندا هەیە، ئەم دیوانە گەلێك لە هۆنراوەکانی نوسخەی (الزعبی) تێدایە و هاوکات چەندین هۆنراوەی تریشی تێدایە کە لەویاندا نین، لەبەرئەوە لە ئێرە بەرەو دواوەی ئەم دیوانە، تایبەتە بەو هۆنراوانەی کە ساخم کردوونەتەوەو لە نوسخەکەی (مختار فوزی)دا یان لە ئەنتەرنێت و سەرچاوەی ترەوە دەستم کەوتوون و لە پەراوێزدا ئاماژەم بە سەرچاوەکان داوە، ڕیزبەندی ژمارەی هۆنراوەکانم نەپچڕاندووە، هەروەها بەپێی پێویست دەروازەی لێکدانەوەم بۆ هەریەکە لەو هۆنراوانە داناوە، بەڵام دەقە عەرەبیەکەم دانەناوەتەوە، ئەویش لەبەر دوو هۆکار:

یەکەم: هێشتا دیوانە عەرەبیەکەی نوسخەی (مختار فوزی) لە کتێبخانەکاندا هەیە و تازەیە، مەترسی تیاچوونی لەسەر نیە.

دووەم: ئەگەر ئەمیشیان دیسانەوە هەر دەقی هۆنراوە عەرەبیەکان بنووسمەوە، کارێکی زیادەیەو قەبارەی دیوانەکەش زۆر گەورە دەردەچێت و دەبێتە ئەرکێکی زیادە بۆ خوێنەران.[1]

---

(١) کاتی تەواوبوونم لە وەرگێڕانی ئەم دیوانەیان کە (الزعبی) کۆی کردووەتەوەو چاپی کردووە، لە چاپی چوارەمیدا، لە ساڵی ١٩٧١، بریتیە لە شەوی شەممە ٢٠١٣/١٠/٢٥زاینی، کاتژمێر (١١,٣٠)ی شەو لە شاری سلێمانی، هەروەها ڕۆژی دووشەممە ٢٠١٣/١٢/٢٣ لێ بوومەوە لە لێکدانەوەی هۆنراوەکانی.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٣٢)

تەمەنی لاوی، قورسترین تەمەنی مرۆڤە، چونکە لە هەموو لایەکەوە جموجوڵی گەشەو بونیاتنانی دەست پێدەکات، زۆرترین گرفت و کێشە لەو تەمەنەدا ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە، کە زۆربەی جار شادی و خۆشیەکانی لێ تاڵ دەبێ، بەتایبەتی کۆچی دوایی هاوڕێ و هاوتەمەن و خۆشەویستانی، لەم کاتانەشدا ئەگەر گەنجەکە تەمەنی بە دەستی خۆی بوایە، ئەو تەمەنەی فڕێ دەداو نەیدەویست.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٣٢):

### (تەمەنی لاو)

مەخابن، لاوێک نەتوانێ، ساتێ، شادانە، ڕابرێ[١]
لەبەر کۆست و گرفت و کێشەکانی
تەمەن، بە دەستی خۆی بایا[٢] تووڕی دەدا[٣]
لە دوای مەرگی هاوەڵ و ئازیزەکانی

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٣٣):

خۆشە مرۆڤ تەمەن درێژ بێ، بەڵام درێژایی و پانتایی ئەو تەمەنی هەمووی چاکەخوازی و شادمانی بێ، بەڵام کۆست و گرفتی وا هەیە مرۆڤ پیر دەکات، یان سیمای پیربوونی تێدا دەردەخات، لەوانەش کۆچی لەناکاوی ئازیز و خۆشەویستان، ئەو کەسەی ئارامگر بێ لەسەر کۆچی ئازیزانی وەکو ئەوە وایە کە تەمەنی خۆی لە (زریێ)یەکدا پاراستبێ، ئەگەر وا نەبێ مانای وایە ئاواتی دوژمنانی هێناوەتە دی.

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص١١.

(٢) بایا: بوایا.

(٣) تووڕی دەدا: هەڵی دەدا، فڕێی دەدا.

دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٣٣):

## (ئارامگرتن لەسەر کۆچی خۆشەویستان)

کــــــێ تـــەمـــــــای، تەمـــــەنی هەیـــــە[1]
خـــــۆڕاگـــــــــری بـــــــــە زیێ کـــــا
کـــــێ تەمـــــــەنی خـــــــۆی درێــــــژکــــــا
دێنێتـــــــــــە دی، ئـــــــــاواتی نەیارەکانـــــــــی

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٣٤)

شافیعی دەفەرموێ بە چوار شتی قورس و گران ئێمەی مرۆڤ تاقی کراونەتەوە، ئەم چوار شتەش بەردەوام لە دژایەتی کردنمدان، کە بریتین لە (شەیتان، دنیا، دەروون، حەزی بەدکاریی) دەبێ وریا بی، ئەگینا، ناتوانی لەنێو ئەم هەموو ناحەزانەدا ڕێی سەرکەوتن و زاڵبوون بدۆزیتەوە.

دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٣٤):

## (بە چوار شت تاقی کراومەتەوە)

بـــــــە چـــــوار شــــــت، تـــاقــــــی کـــــراوم[2]
کــــــە لــــــــە کـــــاردان بــــــۆ دژواریــــــــم
شەیــــــتان، دنیـــــا، دەرون و حــــــەزی بــــەدکاریم
چـــــۆنــــــــــی بتــــــــوانم ڕێ دەرکـــــــــــەم
گشــــــــــت کەوتونــەتــــــــــە دژواریــــــــم؟

(١) دیوان/ مخفار فوزي ص١١.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص١٢.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٣٥)

حەکیم و پزیشك، تا ڕادەیەك دەتوانن داو و دەرمان بدەن بە نەخۆشەکان، بەڵام کە بڕیاری خوایی ئەوە بێ کە دەبێ نەخۆشەکە بمرێ، ئەوا ئەو داوو دەرمانانە هیچ سودیان نابێ، حەکیم و پزیشك و نەخۆش و دەرمانکڕ و دەرمان فرۆش و دەرمانهێن و بازرگانەکانی هەموویان دەبێ بمرن، کەواتە قەزاو قەدەری خوایی زاڵە بەسەر هەموو شتێکا.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٣٥):

### (پەدەری خوایی زاڵە)

حەکیم، بە حەکیمی خۆی و دەرمانەکانی[1]
ناتوانێ، بەرگری بکا، لە قەدەرێکی یەزدانی
حەکیم نامرێ بەو دەرمانەی
چەند نەخۆشی پێ لادا بێ لە نەمانی
کەچی مردن، بەدوای یەکا، چی دەرمانساز و نەخۆشە
هەم کڕیار و فرۆشیار و ئەوەش دەرمانی دەهانی

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٣٦):

ئاینی ئیسلام، ئاینێکی جیهانی فراوانە و جێگەی جۆرەها بۆچوون و بیروڕای تێدا دەبێتەوە، بەڵام ئاینە کۆنەکانی پێشوو تا ڕادەیەك لە هەندێ ڕوکارەوە کاریگەری بەجێماوی هەبووە لەسەر ئیسلام، بۆ نموونە تەرکە دنیاری و سۆفیەتی و دەروێشی و شێخایەتی تا ماوەیەکی زۆر لەناو موسوڵمانانداباوی هەبووە و بگرە تاکو ئێستاش هەندێ لەوانە ماون، بەڵام لەناو ئەوانەشدا کەسی وا هەیە کە بەهۆی نەزانیی خۆیەوە و بەهۆی شارەزا نەبوونی لە پانتایی گشتی ئیسلام کەوتوونەتە

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص١٣.

هەڵەوە و تەنها یەك لایەنی ڕووکەشانەی ئیسلامی لە خۆیدا زەق کردووەتەوە، بۆ نموونە (دانانی ڕیش)ێکی ئەوتۆ کە زانست و زانیاری لەو دیوەوە نەبێ، یان پۆشینی هەندێ بەرگ بۆ ژن و پیاو کە گوایە ئەمە نیشانەی پابەندیە بە سەلەفی سالیحەوە، بەڵام شافیعی خ.ل زۆرچاك لەو جۆرە کەسانە تێگەیشتووەو فەرموویەتی گەورەیی و دینداریی و پیاوماقوڵی بە ڕیشی درێژ و شێخایەتی نیە، ڕاستە دانانی ڕیش و هەبوونی شێخی ڕابەر گرنگە بۆ موسوڵمانان، بە مەرجێ هەموو ئیسلامەتی لەوانەدا کۆنەکرێتەوەو زێدەڕەوی هەڵەی تێدا نەکرێت، وە مرۆڤ توشی دوڕویی و منەتکردن و ڕیابازی نەکات، مرۆڤ نزیکترین کەسە لە خوداوە بۆ خۆی دەتوانێ لەگەڵ خودای خۆیدا بکەوێتە موناجات و لە ڕێی تەقواوە خۆی لێ نزیك بکاتەوەو لەڕێی زانستیشەوە چاکتر لەم ئاینە تێبگات...

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٣٦):

## (پیاوماقوڵی بە ڕیشی درێژ نیە)

گەلی وا هەن، پێیان وایە[1]
پیاوماقوڵی لە ڕیشی درێژیانایە
نەزانستی دینیان پێیە
نە تەقوای خوایان تێدایە
بە منداڵی وا فێرکران
بە هەوانتە، تور دراونەتە ناو کایە[2]
بە نەزانی و بەو نەریتە گوش کراون
لە خزمەتی شێخەکەیان، هەموو کرداریان ڕیایە
هەر جەنابی شێخ دەزانێ
سووکە، یان گرانبەهایە...!

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص١٣.

(٢) کایە: مەیدان، ناو کۆمەڵگە.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٣٧):

شافیعی لە بنەچەوە دەچێتە سەر (فاطمە)ی کچی پێغەمبەر د.خ، کە هاوسەری (علی کوڕی ابی طالب) بووە، بۆیە لێرەدا شانازی بەو بنەچە پیرۆزەیەوە دەکات کە ئایەتی (اهل أتی) لەبەر باری ئەو دابەزیوە؟

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٣٧):

## (پیاهەڵدان و شانازی)

ژانی دایکایەتی، تاکەی[1]
سزا بخۆم، لە خۆشەویستی ئەولاوە؟
هاوسەری کەسی تر بووە (فاطمە گیان)؟
ئایا ئایەتی (هل أتی)جگە لەو گەنجە تەواوە
بۆچی کەسیدابەزیوە، لەلای خواوە..؟

پرسیار کرا دەربارەی علی کوڕی ئەبو طالب، لە شافیعی خ.ل ئەویش لە وەڵامدا فەمووی:

ئەو لاوەم خۆش دەوێ، هەتا هەتا
کە لەبارەی دابەزیوە (هل أتی)
بۆچی کپ کەم، ئەو خۆشەویستە پاکەی؟
ئاخر تاکەی؟ بۆچی؟ تاکەی؟

(١) دیوان/ مختار فوزي ص١٤.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٣٨):

ئەم هۆنراوەیە، هاوشێوەی هۆنراوەی ژمارە (٢٤)ە کە لە دیوانەکەی (الـزعبی) دایە، بەڵام ئەمەیان بە چەشنێکی ترەو چەند دێڕێکی زیاتریشە.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٣٨):

### (ڕەوشتە بەرزەکانم خۆش دەوێن)

هەرکـــەس ڕێـــزی لـــە خـــەڵکی گـــرت، ڕێـــزی بـگـــرن[1]
کەســێکیش خـــەڵکی لا ســـووکە، ســـوکەو قـــەدری لێ مـــەرگن
ئـــــەوەی لای خـەڵـکـــــی مـافـــــی بـــــۆ پـــــارێزراوە
ئـــــەو، وانیــــــە، ئـــــەوا ڕاستـــــی نەپێـکــــــاوە
بـــەدترینی کـــەس، ئەوانـــەن، کـــە خواســـتیان جنێوپێدانـــە
بـــە ئارامیـــت، لێبوردەبـــە، لـــــە بەرانبـــەر ئـــەو خەڵکانـــە
گەشـــە ڕووی، ئـــەو کـــەسەی ســـڵ لـــە وەڵام دەکاتـــەوە
لـــە مـــاڵمـــــدا کەســـانێ هـــەن، بـــەڕاستی وەڵامداتـــەوە
خـــۆشـــــم دەوێــــــن، تـــــا لـــــە ڕەوشتــــی بەرزابــــن
ڕقـــم لێ یـــە، نەنـــگی گـــرتن، ئەگەرچـــی کـــە لەوانیشـــابن[2]

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٣٩)

شافیعی خ.ل وەك مرۆڤێك، وەك باوەڕدار و موسوڵمانێك شانازی بـە پێغەمبـەر و خانەوادەکەیـەوە دەکـات و دەشـفەرموێت، ئەگـەر خـەڵکی ئـەم کـارەی مـن کـە خۆشەویستی ئەوانە، بە تاوان لە قەڵەم دەدەن ئـەوا بـەڵێ.. مـن ئـەو تاوانبـارەم و لەو کارەشم پەشیمان نیم.

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص١٦.

(٢)

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٣٩):

## (ئەو تاوانەی لێی پەشیمان نابمەوە)

چـــــزەی دێ، نــــاخی دڵـــم، دەروونم، گـــەڵێ بێـــزارە[١]

خـــــەوم دەزڕێ، ســــەرسامیشم، لـەو تـیرە تیـژ و، بـەدکارە

ئــەو لــە (حوســەین)ەوە، ئــەو پەیامــەی بــۆ هێنــاوم

کێ، دەگـا بـەو، گەرچـی قورسـەو، نەفــس و دڵم پێـی بێـزارە

قــوربــانییەکی بــێ تاوانــە، کــە دەڵێــی کراســی بــەری

بــە بــۆیاخی ئەرخــەوانی، ئــاوا بــە خــوێنی ڕەنــــگدارە

شمشـێریش خــواریی تێدایــە، دەشــێ (ڕم)یـش لاری هـــەبێ

ئەسـپیش گەرچـی حیلـەی هەیـە، شـیاوی گریـان و هـــاوارە

لـەرایــەوە، ئــەم دنیایــە، بــۆ بــەرزی ئــالی موحەممــەد

زۆری نــەمـــا، بتوێتـــەوە، لەبـــەر پێیـــا چـــی کۆســـارە

ئەســـتێرەکان، هــــەڵهاتن و داچــــڵەکین هەســــارەکانی

پــــەردەکانی بــــۆ دادڕان و داتلیشــــان چـــی دیـــوارە

ســـەلاواتە، هەڵـــدەڕژێ، بەســـــەر ئــــالی هاشمیـــــدا

غــەزا دەکــەن، کــوڕانی ئــەو، چ کــارێکی ســـەرسامکارە

گــەر، گونــاهم، خۆشەویســتی ئــەو ئــالی موحەممــەدە بــێ

ئــەو گوناهــەمن کردومــە، پەشــیمان نـیم لــە ئــەو کـــارە

ئەوانــــە، تکاکـــارن بــــۆم، لــــە ڕاوەستـــانی پەســـلانم

لــــەو ڕۆژەدا بـــــەختەوەرن، ئـــەوانی[٢] لــــەوەوە دیــــارە

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص١٦.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص١٩.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٤٠)

دنیا، جۆرەها کەسی تێدایە، بەڵام زۆرینەیان ئەوانەن کە کاڵفام و گێل و گەمژەن، لەبەرئەوە کە بە زۆری ئەو جۆرە کەسانەت لەم دنیایەدا بینی خەم داتنەگریَ، شتێك کە بە دەستی خۆت کردوتە، کە خراپە، ئیتر بۆچی گلەیی لە کەسانی تر دەکەیت؟

خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسی دا بە یەکێك لە پێغەمبەران دەفەرموێت: (دنیا وەکو کەلاکی مردارەبوو وایە)، جا کە تۆ بە خواستی خۆت دنیا خۆریت دەویَ، ئیدی بۆچی پێت ناخۆشە کە خەڵکی خراپ و سەگەل دەورت بدەن؟ سروشتی سەگەلیش دەورەدانی کەلاکی تۆپیوە..!

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٤٠):

### (گەمژەیی دنیا خەمبارت نەکات)

دنیـــــا، وایـــــە، دڵتەنــــگ مەبــــە، خــــەم داتنــــەگریَ[1]

گەوجـــی لـــە خـــەڵکی دنیـــادا، بـــە نـــەنگی لەقەڵـــەم نـــادریَ

خـــــۆت داوای کـــەلاکـــــت کـــــردووە، بــــۆ خواردنـــــت

کەچــــی ســــووری، گەلەســــەش، دەورت لیَ نــــەگریَ؟

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٤١):

کەسێکی ژیر، کە کەوتە ناو کۆڕی نەزان و گەوجانەوە، ئەوان جۆرەها قسەی سوکی پیَ دەڵێن، بەڵام گەورەترین هەڵوێست ئەوەیە کە ئەو وەڵامیان نەداتەوەو خۆی بێدەنگ بکات، هەروەکو چۆن (شێر)ی ئازاو براوە گویَ ناداتە سەگوەڕ.

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص١٩.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٤١):

### (بێدەنگی وەڵامە)

هەرچیت هەیە، هەڵی ڕێژە، لە جنێودان بە ناموسم[1]
(بێدەنگی) وەڵامی منە، لە بۆ ئەتۆی زمان لووسم
لە بن وەڵامیشم نیە، کە وەستام زمانبەستە
کوا وەڵامدانەوەی سەگەل، لەلای شێرەکان مەبەستە؟

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٤٢):

خوای گەورە، تاقیمان دەکاتەوە، دەرگاکانمان بەڕوودا دادەخات و پاشان دەرگای چاکترمان بۆ دەکاتەوە، نەخۆشی و شادی و نەخەم و پەژارە تاسەر نابن، لە ڕووداوەکان زۆر دەترسین تا ڕوو دەدەن، کەچی کە ڕوویاندا دەبینین ترسەکەمان زێدەڕەوی تێدا بوو، ڕووداوەکە بایی ئەو هەموو ترسە نەدەبوو، هەرچی ڕوودەدات، دوای ماوەیەك دەبێتە ڕابردوو، هیچ ڕابردوویەکیش بە خەم بۆ خواردن چارەسەر ناکرێ.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٤٢):

### (خەم بۆ ڕابردوو مەخۆ)

دەرگایەك دەکرێتەوە، کە دەرگایەك داخرێ[2]
تەنگانە بەری کورتە، هەر بۆ خۆی ڕادەبرێ
فراوانی و ڕوونـاهی، دیسان دەتگرێتەوە
هەر لە دوای تەنگەبەریی، ڕێی تەسك دەبڕێتەوە
لە دوای خەم و پەژارە، شادیەك دێتە پێشێ

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٢١.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٢٠ ص٢١.

نه دڵته‌نگی هه‌میشه، نه خه‌میش زۆر ده‌کێشێ
چه‌نده‌ها جار، بینیوته، ڕێت له‌به‌ر پێ چه‌ند ته‌نگ بوو
که‌چی (قه‌ده‌ر) به قه‌ده‌ر ئه‌و ترسه، ترسی نه‌بوو
چه‌نده‌ها جار که ته‌رزه، له په‌تۆی هه‌وره‌کانا
هاتن، چوون، ڕه‌وینه‌وه، نه‌بووه ترسه بارانه
ماندوو نه‌بوی، ڕۆژیت بۆ هات، به‌پێ بۆ ڕۆژی نه‌هاتی
له کاتێکا شه‌که‌ت نه‌بووی به خه‌وزڕان و ماندوێتی
له کاروان و کۆچی دوری و نامۆییدا ده‌تلایته‌وه
ده‌رفه‌تێکی وات بۆ ڕه‌خسا به‌بێ ترس گه‌ڕایته‌وه
کاتێ شه‌پۆل هه‌ڵاوسا بوو، به گوژمی فووی
تۆ له ده‌ریا ده‌ترسای و ڕزگاریش بووی
ده‌مێ که‌سێ، نه‌یبێ که‌سێ بۆ ڕزگاری
به هانای دێ بیسه‌رو په‌روه‌ردگاری
به‌هۆی هانای بۆ لای خودای تاک و ته‌نهای
دێته‌وه ڕێی وه‌ڵامی داواو سکاڵای
خه‌مبار مه‌به بۆ شتێک له‌ده‌ستت داوه
ڕه‌زامه‌ندی و پاداشتی خوات بۆ دانراوه
چی له ده‌فته‌ری قه‌ده‌را بۆت نوسرا بێ، ده‌بێ وابێ
جا یا ده‌تپێکێ ئه‌و تیره، یا ڕاده‌برێ و زیانی نابێ
نابێ شتێ به‌سه‌رتا بێ، له ده‌فته‌رتا نه‌نوسرا بێ
ده‌بێ ڕوودا، چی نوسرا بێ، هیچ کۆسپێ ڕێگری نابێ
گه‌ر حه‌زت سه‌رکوت نه‌کرا بێ، هه‌روا له ناختدا مابێ
ئه‌وا هه‌ر شوێنی ده‌که‌وی تاوه‌کو (خوو) تیاتدا ڕووابێ

ڕێشــت کەوتۆتــە جێگەیــەک، کــەوا جێگــــەی تیـربـارانـــە
کەچــی لــەوێش دەربــازت بــوو نــەپێکرای بـــە ئـــەو تیرانــە
دە لـــەم چــاخە وردبـــەرەوە کـــە ئێستـــا وا تێـــیدا دەژی
کـــە بۆتـــە کــوێرەوەری بــۆت خــەم و ئــازاری دەچــێژی
ڕەخنـــە مەگـــرە لـــە زەمانــە، ئــەو کــارەت بــۆ ناڕەوایــە
چۆنـــی کەســێ ڕەخنــە دەگــرێ، کــەوا شایســتەی ســزایە؟
خــەڵکی بــۆچـــی لەبەرچــاوا، ئــاوا هــەموویان یەکســان بــوو
چـــونکە خـــۆیان ســـەگەلیان لەلاچــاکتر و شـــکۆدار بـــوو
ڕوپــامـــا کــار، بـــە مـــژدەوە کـــە جاروبـــارێ دێنـــە لات
دڵنـــەرمیت و لـــە پێشـا لــەوە دەبـوری خــراپترین جنێــودەدات
تـــا دەتــوانـــی چـــاکەکاربە، کــە چــاکەکار نابــێ کەســێ
تـــا لـــە بــەدکـــاری لانـــەداو لـــە بـــەدکارانیش نەترســـێ
گــەر خــوا بیـــدا ســەرکەوتوو بــێ مرۆڤــی بــاش و چــاکەکار
وەگـــەر نـــا ئـــەوا شکســتی ئــەو بەڵایــە کــە، سەرســامکار
کـــە تێـدامـــای بـــۆ بڕیـــاردان لـــەنێوانی دوو مەبەســـتا
نەتــدەزانی لــەو دوانــەدا کامیـــان چـــــەوت و کـامـــە ڕاســـتە
واز لـــەو دانــەیـــان بهێنـــە کـــە ئـــارەزووی بــەد دەیــەوێ
چــونکە دەرونـی ســەرکەشت هــەر کــەمی و ســوکی تــۆی دەوێ
دابڕێـــژە چــی دەبێـــژی، لـــەپێش ئـــەوەی بیهــاوێـــژی
گشت پرسـیارێ، وەڵامێکی شیاوی هەیـە کـە پێویسـتە دایبڕێـژی
دەشـــێ قســـــەش ناوکێـــش کـــرێ بـــــە وتـــەی جـــوان
وە یـــا پـــڕ بـــێ لــە ســوعبەت و لــە نەســتەقی شـیرین زمـان

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٤٣):

خواپەرستی دەبێ زانست و ڕۆشنبیری لەگەڵدا بێ، ئەو کەسە نەفام و نەزانانە بە کەڵکی ئیسلام نایەن کە بە وردی لەم ئاینە تێنەگەیشتوون، ئەوانە وەکو جانتایەك وان، کە هیچ کتێبێکی تێدا نەبێ، واتە کلۆریی کەللەیان بەتاڵەو زانیستی تێدا نیە.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٤٣):

### (خواپەرستی نەفامان)

خواپەرســـــتی نــــەفامان، زانســـــتی لەگـــــەڵ نـــــەبێ[1]

وەکـــــو جانتایـــــەك وایـــــە، کتێبـــــی تێـــــدا نـــــەبێ

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٤٤):

جگە لەوەی چاکەکاری، پاداشتی گەورەی دواڕۆژ بەدەست دەخات، هاوکات چاکە بکە، چاکەش دێتەوە ڕێت، کەواتە چاکەکاریی دەستاوە، هەرگیز ڕێگر مەبە لە بەردەمی ئەو کەسانەی چاکە دەکەن، تۆش کە شتێکت هەبێ، خەڵکی ڕووت لێ دەنێن و داوات لێ دەکەن، ناوبانگ و ڕەوشتی جوان هەر دەمێنێ گەرچی کەسەکان خۆشیان نەمێنن.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٤٤):

### (یارمەتیدان دەستاوە)

هـــــەتاکو ژیـــــان هـــــەبێ، چـــــاکەش وەکـــــو دەســـــتاوە[2]

یـــــارمـــــــەتیدان، خەڵاتـــــە، نۆرەیـــــە، ناویـــــەناوە

باشترینـــــــــی کـــــــــەسانێ ئـــــەو مرۆڤانـــــەن کـــــەوا

لـــــە ســـــایەیانا، خـــــەڵکی، پێداویســـــتیان تـــــەواوە

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٢٠.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٢٥.

دەسا ڕێگری مەکەن، لە کاری چاکەکاریی
لە کاتێکا دەزانین خوا ئەوەی بەوان داوە
چونکە یارمەتیش نۆرەی خۆی هەیە
سوپاسی خوا بکە، چی بە تۆ داوە
داوای یارمەتی لە تۆ دەکرێت و
خەڵکیش هانایان بۆ تۆ هێناوە
گەل و هۆز هەبوون، ئێستا نەماون
بەڵام ڕەوشتی جوانیان هەر ماوە
گەلی واش هەبوون، ڕاستە ژیاون
بەڵام مردون و(زیندوو)یان ناوە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٤٥)

ئارامگرتن، هۆکارێکی گرنگە، بۆ ئەوەی بتگەیەنێتە خواشتی خۆت و سەرکەوتن، هەر کەسێ پشت بە خوا ببەستێ و یادی بکات، جا هەر کەسێ لەگەڵ خوای خۆی ڕاست بکات، با بەڕاستی تکاو داوای خۆی لەو بکات.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٤٥):

### (ئەوەی لە سەرکەوتن نزیکت دەکاتەوە)

ئارامگرتنە، کە سەرت دەخات[١]
کێ خوای لەبیر بێ، ڕزگاری دەکات
هەرکەس ڕاستگۆیە، لەگەڵ خوای خۆیا
با تکای لێ کا، چی داوا دەکات

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٣٠.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٤٦):

متمانەت بە خۆت هەبێ، بەڵام لەخۆت بایی نەبی، چونکە هەمیشە بڕیاری خودا باڵایەو زاڵە، هەرچی ڕوودەدات لای خوا نوسراوە، ڕۆزی و بەشی خۆت هی خۆتە، بەڵام دەبێ هۆکارەکان بگریتە بەر و جموجوڵێك بکەیت بۆ پەیدا کردنی بەشە ڕۆزی خۆت.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٤٦):

### (قەزا باڵادەستە)

متمانـــــــــە بـــــەرزیـــــــــی، شـــــــــــکوداریتە(1)
بـــــــەڵام قـــــــەزای خـــــــوا، هەمیشـــــــە زاڵـــــــــە
ڕوویـــــــدا، هـــــــەر شــــــتێ لای خـــــوا نوســـــرا بـــــوو
قـــەڵـەمـــــــــــی خوایـــــــــــە، بڕیــــــــاری بــــــــاڵا
چــــــاوەڕێی، ڕۆزی خـــــــۆت بـــــــکە، بــــــــەڵام
هــــــــۆکارەکانیش بکـــــــــە بــــــــــە کـــــــــاڵا
بـــــــێ هیـــــــوا مـــــــەبە، لــــــــە ڕۆزی بەشـــــــت
چـــــی بەشـــــی تۆیـــــــە، هــــــەر بــــــۆ تــــــۆ ماڵــــــە

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٣٢.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٤٧)

لەم هۆنراوەیەدا شافیعی خ.ل لەخوا دەپاڕێتەوەو یادی خوا دەکات، چەندین ناوی بەرزی خودا و سیفەتی پیرۆزی باس دەکات.[1]

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٤٧):

### (نزاو پاڕانەوە)

ئەی ئەو کەسەی بە یادی تۆ، گرێی هەموو گرفتەکان دەکرێتەوە
ئەی ئەو کەسەی داوای هەموو داواکارن بۆ لای تۆ دەگەڕێتەوە
ئەی نەمر، ڕاگیر و وەستاو، کە بێگەردی لە هاوتایی
تۆ چاودێری بەندەکانی، تۆ پادشای بێ هاوەڵی لە تەنهایی
هەر تۆ زانای بەوەی چۆن تاقی کەیتەوە بەندەکانت
هەر بە تەنها خۆت شایەتی بەسەر بڕیار و فەرمانت
تۆی شکۆ بە کەسێك دەدەی کە گوێڕایەڵی فەرمانە
هەر خۆشت زەلیلی دەکەی ئەوەی ئینکار و نەزانە
ئەتۆ پاکیت، داهێنەری گشت بەدیهێنراوەکانی
لە باوانی و منداڵداری بەدوری گشت جوتەکانی
من هانام بۆ تۆ هێناوە، خەم دایگرتووم
دڵم هەر بۆ تۆ لێدەدا، نەفس پەرتەوازەی کردووم
تۆ گەورەییت ڕزگارم کە، لە خەم کە دڵم بەسۆیە
کە سەرچاوەی گشت چاکەیەك لەلای تۆیە
تەنها کەمێ لە لوتفی تۆ، سارێژی هەموو دەردانە
بێدەنگ دەکا هەر بەڵایەك هەڵی بڕێژێ زەمانە

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٣٣. ئەم هۆنراوەیە بۆ سرود گونجاوە.

تـــۆ ڕاییکـــار و ئاسانکـــــار، یاریـــدەدەری هەموانــــی
ئاســـان بـــکە ڕزگاریمـــــان، هــەر تــۆی خـــاوەنی گشــتمانی
بەزەییـــت بـــێ بــــە منێـــکا کـــە بـــێ کـــەس و تـکــاکارە
نائومێـــدم لـــە هاوکـــاری لــــە بێگانــــەو کـــەس و کـــــارا

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٤٨)

کاتێ ئیمامی شافیعی خ.ل کوڕەکەی کۆچی دوای کرد بەم هۆنراوەیە بۆ خۆی دڵنەوایی خۆی دەکرد:

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٤٨):

ئـــــــارام بــــــگرە، ئـاوایـــــــــە دەردی زەمـانــــــــە[١]
یــــان هــــــەژاری و نەداریــــە، یـــــا دووری خۆشەویســـــتانە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٤٩)

مرۆڤ چی هەبێ، ئـەوەش لەدەست دەدات و خـوداش بـەوە تـاقی دەکاتـەوە، بەڵام تۆ کە پارەدار نیت پوڵ و پارەت لەکیس ناچێ تـا خـەمی بخۆی، مناڵت نیـە تاکو بمرێت قۆناغەکانی ڕابردووی تەمەنت تێپەڕاند، ئێستا کەسێکی ژیـر و خـاوەن ئـەزموونیت، ئـیتر باشـترین کـار کـە لـەم سـات و تەمەنەتـدا بیکـەیت بریتیـە لـە خواپەرسـتی ڕاسـتەقینە هەرچـەندە دەبـێ لـە قۆناغـەکانی ڕابردووشـدا کـاری سەرەکیت خواپەرستی بوو بێ، بەڵام لـەم تەمەنـەدا پێویسـتە بەتایبـەتی بـۆ ئـەوە دابڕێیت.

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٢٢.

دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٤٩):

هــــــەژارێکی، نــــــە منــالّـــــــت هەیـــــە، بمرێـــــت[١]
نــە خــەم دەخــۆی، بــۆ شتـــــێ لــە دەســتت چــووبێت
ڕووخۆشێــــــــکی بــــــێ خێـــــزان و کـــــەس و کـــاری
دووری لـــەوەی، لـــە بەشـــی خـــۆت بەشـــت بخورێـــت
منـــــالّی و گەمـــــەت تێپەڕانـــــــد، پێـــــــگەیشتووی
ئێستـــــا زانستـــــە ســـــەرمایە، کـــــەوا هـــــەتبێت
ئـــــەزانی کـــام ئەرکـــە باشـــە ئێـــستا بیـــکەیت؟
بــــە ئارامـــــی، کـــــارت بـــا خواپەرســـتی بێـــت

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٥٠)

شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا شانازی بەوەوە دەکات کە هەوڵی داوە ببێتە یاوەری ئالی ڕەسول، وە بە هۆکار و تکاکاریان دەزانێ، تاکو لە دواڕۆژدا تکای بۆ بکەن و نامەی کردەوەکانی بە دەستی ڕاستی وەربگرێ لە قیامەتدا لە سایەی تکای ئەواندا.

دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٥٠):

(ئالی پێغەمبەر هۆکارمن)

ئـــــــالی ڕەســـــــول، بـــــــۆم یـــــــاوەرن[٢]
ئەویـــــــــشە بـــــــــۆتە هۆکـــــــــارم
لـــــــــە ئەوانـــــــــیش تکـــاکـــــــــارم
بــــە دەســــتی ڕاســــت وەری گــــرم نامـــــەی کـــــارم

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٢٦.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٢٩.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٥١)

نیازو نیەت و باوەڕی دامەزراو، کەسێك سەرکەوتوو دەکات گەر بیەوێ چاکە بکات لەگەڵ مرۆڤەکاندا بە گشتی.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٥١):

### (ڕووی پاك)

سـوێندم بـە خـوا، کـە زۆر دامـەزراوە نیـازم[1]
گـەر سـوێراویش بـە ئـاوی خـواردن بخـوازم
دەبـێ چـاکەم لەگـەڵ مـرۆڤ بـەردەوام بـێ
دەبـێ پرسـم، لای ڕووپاکـان بکـا ڕازم

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٥٢)

مرۆڤ کە خۆی خەم و پەژارەی هەبێ، وا دەزانێ هەر ئەو وایەو خەڵکانی تر دڵخۆشن، بەڵام لە ڕاستیدا ئاهو خەم و پەژارە، یەخە بە هەموو کەسێ دەگرێ، لە هەموو بارەکانیشدا هەر خوا خۆی فریامان دەکەوێ، بەتایبەتی ئەو گەنجە داماوەی کە بەهۆی دڵپاکی خۆیەوە نازانێ چۆن فرت و فێڵ لە زەمانە بکات، ئەوا خوای گەورە لەجیاتی ئەوە شادی و دڵخۆشی پێ دەبەخشێ.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٥٢):

### (خەمی مرۆڤ دڵتەنگی یە)

وا دەبینم کە ئاهو خەم، یەخە بە هەموو کەس دەگرێ[2]
گـەر خـوا فریامـان نەکـەوێ و دەسـتمان نـەگـرێ
لاوێـك، لـە کـەتنی زەمانـە، فێڵـی ڕزگـاربوون نەزانـێ
لەبەرانبـەری بـێ بـەختی، دڵشـادی بـۆ ئـەژمار دەکـرێ

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٣٢.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٣٣.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٥٣)

ئێرەیی بردن و حەسوودی سیفەتێکی دزیوە لە مرۆڤدا، ئەو کەسانەی حەسوودی دەبەن و چاویان لەسەر شتی خەڵکیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەیان زیاد دەکات، جا ئەگەر کەسێك ئێرەیی بە ماڵ و سامان و پایەو جوانی و زانستی کەسێك برد، ئەوا دڵنیابێ کە ئەویش سەلامەت دەرناچێ و کەسانێکی تر هەن کە ئێرەیی بەو دەبەنەوە.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٥٣):

### (ئێرەیی بردن)

گەشەم کردووە، ئەوانەی ئێرەیی دەبەن، هیچ کەم ناکەن[1]

کەڵەکە بوون، نۆربوون و بە ئاسمانا چوون، ڕۆژانە هەر زیاتر ئەکەن

ئەگەر ئێرەییم پێ بەرن، لە شتێ کەوا من هەمە و، وان، نیانە

دڵنیابن، هاوشێوەی من، چاوێکی تر لەسەریانە

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٥٤)

پۆزشت هێنانەوە و داوای لێبوردن، چەند لە کات و شوێنی گونجاودا جوانە، ئەوەندەش ناجوانە ئەگەر کات و شوێنی گونجاو نەبوو، بەتایبەتیش ئەو جۆرە داوای لێبوردنەی کە ترش و خوێی خۆی پێوە دەکرێت، کەسێك بەو جۆرە بێ خزمەکانی لەپێش بێگانەوە چاکتر دەیناسن و لە دەوری دووردەکەونەوە، بە دەستی خۆت بینای متمانەی خۆت ڕوخاند، وا بینای تری بێ متمانەیت دروست کرد و خەریکە تەواوی دەکەیت.

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٣٤.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٥٤):

پۆزشێکی تۆم پێ گەیشت، هیچ لە شوێنی خۆیا نەبوو[١]

وات نیشان دا هیچ کەس وەکو تۆ گوێڕایەڵی بەندە نەبوو

زمانێکی وا فشەڵت لە قسەتا خستبووە کار

نازانم بۆ سوێندت هێنا، کە زمان وا بڕندە بوو؟

کە خزمانت هەموو ڕایانکرد لە دەورەت

چیە بیسترا بانگەوازت لای ئەوانەی بێگانە بوو؟

خزمانت بڵاوەیان کرد، بە پەیسەری کاری خۆیان

بە تەنها مای، شایستەتە، هەر ئەوە بە تۆ ڕەوا بوو

لەنێوان لۆمەو سوپاسا بە مۆلەقی ڕاوەستاوی

دەسا شیعرم خۆزگە وابا، کە بە خواستی دڵت دەبوو

ئەگەر دەڵێی منیش شیعرو بەستەم هەیە

دێرینەکانت شایەتن کە ڕاستی لەلای تۆ هەبوو

تۆ ڕاست دەکەی، بەڵام بەدەستی ئەنقەس خۆت

کاولت کرد بیناکەیان، وا بینای تازە دروست بوو

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٣٥.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٥٥)

هەریەکە لە مرۆڤەکان شتێك دەخوازن، بەڵام مەرج نیە ویستی خوداش وەکو ویستی مرۆڤەکان بێ، خودا هەرچی بوێ گەر بیەوێ، ئەوە دێتە دی، ئەگەر کەسێکیش سور بێ لەسەر ئەوەی دەیەوێ، سووربوونەکەی هەوڵە بۆ گەیشتن، ئەگینا سوور بوون مەرج نیە بتگەیەنێتە ئاواتەکەت، باش وایە بەو بەشە ڕازی بیت کە خودا دەتداتێ، چونکە ڕەزامەندی خودا گەورەترە لە داواکەی تۆ.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٥٥):

### (ویستی خودا دێتەدی[1])

خـــــوا، هەرچـــــــی دەوێ، دێتـــــــە دی
کـــــە خـــــۆی ئـــــەوە تـــــەما دەکـــــا
ئـــــەوەی ســـــــوورە لەســـــــەر کـــــارێ
ســـــــووربوونەکەی زیـــــــادی ناکـــــــا
ڕازی بـــــــە، بـــــــەوەی دەیـــــــەوێ
چـــــــیت لێ دەوێ ڕازیـــــــت دەکـــــــا

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٥٦) :

لـــــە هـــــەموو شـــــتێکدا بەڵگـــــەی هەیـــــە
چەنـــــــد ســـــــەیرە لام! چـــــۆن نکولکـــــار[2]
بـــــە ئاشـــــکرا دەدوێ، دژی پـــــەروەردگار
لـــــە کاتێکـــــا، هـــــەموو جـــــوڵاو و وەســـــتاوێ

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٣٦.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٣٦. ئەو هۆنراوانەی ڕوون دەروازەم بۆ نەکرد.

شایەتێــــــــکە بـــــۆ گـــــــەورەیی پـــــــەروەردگار

هەمـــــــــوو شــــــــتێ بەڵگەیەکـــــــە، نیشــــــانەیە

دەریدەخـــــــــا، کـــــــە تەنیایـــــــە پـــــــەروەردگار

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٥٧) :

## (شاخەکانیش لەگەڵ هەقدان)

کە بە ناهەق، ڕەخـــنە دەگری، هەقیشت، وەك ناهـەق دەبێ[1]

بـا هەقیشـت گـرتبێتە بـەر، شـاخیش لەگـەڵ هەقـدا دەبـێ

کـــە لـــە دەرگـاوە نەچـوویتە نـاو ژووری هەرچـی دەتـەوێ

گومـــڕا دەبـــی، گەرچـی بـە دڵ، نیـازت بـەلای دەرگـاوە بـێ

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٥٨) :

## (دەوڵەمەندی لە ئارامگریی دایە)

ئەگـــەر ویســـتت، قـــەرز بکـــەی، لـــە ســـەردەمی هـــەژاریتا[2]

بـەڵام بـە گـوێی حـەزت بکـەی، نـەکو ئـەوەی کـە پێویسـتە

جـارێ لـە دەرون بپرسـە، ئـاخۆ لـە کیسـەی خۆگـری

چـەندە خـەرجی تێـدا مـاوەو هـەتاکو کـەی بەرگـە ئـەگری؟

ئەوسـا کـە تـۆ دەوڵەمەنـدی، کـە توانیـت ئارامـت بگـری

ئەگـەر ئەوەشـت بـۆ نـەکرا، خـۆ ڕێ زۆرن بیـانوو بـگری

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٣٦.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٤٩.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٥٩) :

### (هاوڕێ و دوژمن)

بـــوونی هـــەزاران هـــاوڕێ، بـــۆ یـــەك كەســـێ زۆر نیـــە
بـــــەڵام تـــــەنها دوژمنێـــــك گـــــەلێ زۆرە، كـــــەم نیـــــە[1]

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٦٠) :

### (فەرمانی خوا لەسەرووی فەرمانی منەوەیە)

بـــیر لـــە نیـــازو، ئـــارامگری و، تێڕابینـــی خـــۆم دەكـــەم[2]
سەرزەنشـــتی زەمانـــەو، سوپاســـی توانـــاییم دەكـــەم
كەمتەرخـــەم نـــیم، لـــە كۆششـــێ، لـــە قـــوڵایی ناخمدایـــە
بـــەڵام، لـــە ســـەرووی فـــەرمانم، فرمـــانی خـــوا لـــە كارایـــە

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٦١) :

### (پرسیار لەو كەسە بكە كە دەزانێت)

پرسا[3] نەبی، لەو كەسانەی، كە دەزانن، لەسەر شتێ، كە نایزانی[4]
ئـیتر چیتـە كـە نـەزانی؟ ئـەی چـۆن وابـی، كـە بیزانـــی؟
گـەر بزانـــی، تـــۆ ئەتزانـــی، كـــە جیـــاوازی لەگـــەڵ كەســـێ
كـــە زانـــایە، بـــە زانستـــی (نـازانـــم) و تـــۆش نـــەزانی

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٤٩.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٥٠.

(٣) پرسا: ئەو كەسەی زۆر پرسیار ئەكات و بەدوای فێربووندا دەگەڕێ.

(٤) دیوان/ مختار فوزي ص٥٠.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٦٢) :

### (سڵاو، پەیوەندیمان نەما)

ئـارام دەگـرم، ئـارام بگـرە، نەئەتناسـم، نـە ئەمناسـی[1]
باسـم مەکـە، لـە خـوای گـەورە، داوا بکـە، بکـا باسـم
لەگـەڵ تـۆدا ماوەیـێ، ژیـام، منـت بـە باشـی نەناسـی
منـیش وابـووم، کـە نەمتوانـی، تـۆ بناسـم
سـڵاو لـە هـەردوولامان و لـە پچـڕانی پەیوەندیمـان
کـە هـەتا ڕۆژی پەسـڵانێ، یـەك نـابینین، نەکـەی باسـم

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٦٣) :

### (بەختەوەریت ئەگەر ڕاستگۆیەك بدۆزیتەوە)

پشـووت داوەتـە دەروونـت، کـە بـۆ کـاری هـەق ئامـادەی[2]
ئـەو ڕۆژە لەشـت بـەبارە، کـە بـە ئەنقـەس خـۆی لێ لادەی
بـەختەوەریـت، کـەسێ وەدۆزی ڕاسـتگۆ بێـت
کـاتێکیش دەڵێـی (نـازانم) گـەورەییتە، مـل بانـەدەی
بپـارێزی مـافی هـاوسێ و ئامـۆزا و هـاوەڵی نزیـك
گـەورە ئـەژی، لەسـەر زاریـان بـە (نـاوی مـەزن) ئامـادەی
چـاکەیەك نەشتـکردبێ، دەیدەنـە پـاڵ تـۆ بـە عەمـدەن
گەرچـی خۆشـت لـەو جـۆرە چاکەیـە لادەی

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٣٨.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٦٤) :

## (بەخشندەیی لە دەستیەوە پەخشانە)

بەدەستم، دەستم دا لەناو دەستی، بە نیازی دەوڵەمەندی[1]
نەمدەزانی بەخشندەیی لە دەستی ئەودا هاتە دی
ئەوە من نیم سوود لە دەوڵەمەندی بکەم
سوودم کردبێ، دڕ کراوم، لە دەستمدا هەرچیم کەدی

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٦٥)

هەرکەسێ بیەوێ بخوێنێ، فێری زانست و زانیاری بێ، مەبەستی ئەوە بێ لە ڕۆژی دوایی پاداشت وەربگرێتەوە، ئەوا خوای گەورە کار ئاسانی بۆ دەکات، لەلایەکەوە بێزار نابێ لە کۆشش و خوێندن، لەلایەکی تریشەوە ڕێنمایی و بەرچاوڕوونی بۆ دێت، قوتابی و مامۆستاکانیشی نزای چاکی بۆ دەکەن، دەبێتە هاوبەشی خێر و پاداشتی هەموو مرۆڤەکان، چونکە زانستی پێشکەش کردووە بە هەموو مرۆڤەکان.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٦٥):

## (زانستخواز سەردەکەوێ)

هەرکەس دەیەوێ بخوێنێ، بۆ ڕۆژی دوایی و پەسلانی[2]
بە ڕەنجی خۆی، ڕێنمایی، ڕابەرانی
چاکەی بۆ دێ، لە قوتابی و فێرخوازانی
بەهۆی بەزەیی خودایی و چاکەی هەموو بەندەکانی

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٣٨.
(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٣٩.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٦٦) :

### (نەهامەتیەکانی ڕۆژگار)

زۆرن نەهامــــەتی زەمــــان، بەزویـــــی، بـــە کۆتـــا نایـــا[1]
شادیەکانیشـــــی وەك جـــەژن، جاروبـــــاریٚ لــــە ڕێتایــــە
کــــــیٚ زۆر گـــــەورەو پایـــــەدار و پادشـــــا بــــــوو
ئێســــتا وەکـــو کۆیلەیەکـــە لـــە بەردەســــتی گەوجانایـــە

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٦٧) :

### (شەرابی گفتوگۆ)

ڕێـــزی کــوڕە گـــەنجێك بگـــرە، کـــە بـــۆن و بەرامـــەی لاوی[2]
ڕژاوەتـــە کـــوپ و کاســـەی، حـــەزی دڵ، سینــــــەی هـــەناوی
خواردنـــــەوەیان وتووێـــــژە، لـــەناو پیـــــاڵەی ژێـــر تـــەواوی

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٦٨) :

### (بانێردراوەکانت دینار بیٚ)

دینارەکـــان، بـــۆ خـــەرجین، رامەوەســـتە لــــــە بەخشـــینی[3]
کـــە یـــاوەری تـــۆ دینـــار بـــیٚ، لـــە خـــەرجا ســـودیان دەبینـــی

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٤١.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٤١.

(٣) دیوان/ مختار فوزي ص٤٣.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٦٩) :

### (نەزان مەبە)

فێربە، هەتاکو ئەتوانی، ئیتر بەوە تۆ (میــــر) ئەبی[1]
نەزان مەبە، هەتا مابی، چونکە هەتا سەر دیل ئەبی
هەموو ڕۆژێ تەنها پیتێ فێربی لە زانستی سەردەم
نەزان هەموو گەوج دەبن، لە چاوی تۆدا بەسەرجەم

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٧٠) :

### (برا زۆرکە)

برا زۆرکە، تا دەتوانی، گەرچی هەیە، هەر گەدەیە[2]
بەڵام کەسی واشیان هەیە، پشتە بۆت و ژێری هەیە
ژێر هەزار دۆستیشی هەبێ، کوانێ زۆرە؟
دانا (یەك) دوژمنی هەبێ، هەر خەمخۆرە

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٧١) :

### (ڕۆژگاری شەڕ بەردەوام نابێ)

چارەنووسی بەدکاریی، لە کارەکە خۆی دەچێ[3]
ڕۆژگاری شەڕیش کورتە، بەزوویی بەسەر دەچێ
شادی، یا خەمی دنیا، تا سەر بەردەوام نابن
شەو تێپەڕێ، ڕۆژ هەڵێ[1] خەمیشت لەناو دەچێ

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٤٤.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٤٥.

(٣) دیوان/ مختار فوزي ص٤٥.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٧٢) :

### (لێقەومان)

بـــــەخوا، لێقـــــەومان، مــــــاڵ ڕمــــــان نیـــــە[٢]

مــــــــەرگی وشــــــتر و مەڕیشـــــــــت نیـــــــە

بـــــەڵکو لێقـــــەومان، کەســــــێکە بمــــــــرێ

کـــــە بــــە مــــــەرگی ئــــەو، زۆر خــــەڵك بمــــرێ

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٧٣) :

### (تەماشا کردنی ڕەوا)

پــێم دەڵــێن: دە، مەڕوانـــە، چـــونکە ڕوانـــین بەڵایـــە[٣]

ئـــەی هــــەر کەســـێ بینایـــە، بـــۆ دووچـــاو لەســـەریایە

کــــل ڕێـــژکردنی چــــاوان، لــــە سنــــووری خۆیــــدا بــــێ

دور لـــــە بــــەدبینی و گومـــــان، لـــــە ویـــــژدانا ڕەوایـــــە

---

(١) هەڵبێت:

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٤٧.

(٣) دیوان/ مختار فوزي ص٤٥.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٧٤) :

### (ئەشکەنجەی دڵ)

کۆتـــایی (دینـــار)، (نـــار)ە، کـــەهی (درهم)یـــش (هَـــم)ە[١]

یـەکـــــەمیان ســـــوتێنەر و دووەمیـــان دەرد و خەمـــــە

مـــرۆڤ لـــەو نێـوانـــــەدا، ئەگـــەر لـــە خـــوا نەترســـێ

دڵـــــی لـــــە ئەشـــــکەنجەداو، ناخیشـــــی خـــەم و تەمـــــە

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٧٥) :

### (کەس لە دەست زمانی خەڵکی سەلامەت نابێ)

کـــــەس، لـــــە بـــــەد زمـــــان، ســـــەلامەت نـابـــــێ[٢]

گـــــەر، پێغەمبـــــەری، پـــــاکی خـــــودا بـــــێ

ئەگـــــەر بـــــێ دەنگـــــە، پێـــــی دەڵێـــــن: لاڵـــــە

قســـــەش کـــــا، دەڵـــــێن: زۆر بڵـــــێ و تاڵـــــە

بـــــە ڕۆژوی ڕۆژ و، شـــــەو هـــــەر نوێـــــژ بکـــــا

دەڵێـــــــن: ڕووکـەشـــــــە، ڕیـــــایی دەکـــــا

تـــــۆش گـــــوێ مـــــەدەرە، قســـــەو باســـــی کـــــەس

بتـــــرسە، لـــــە خـــــوا، ئـــــەو گەورەیـــــەو بـــــەس

---

(١) ديوان/ مختار فوزي ص٥٠.

(٢) ديوان/ مختار فوزي ص٤٩.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٧٦) :

### (هۆیەکانی دەست بەتاڵیی)

دەڵـێن: کـەوا دەسـتبەتاڵی، هۆکارەکـەی، تـەنها سـیانە[1]
وا دەبیـنم، وازهێنـان لـە دەسـت بـەتاڵی چوارەمیانـە
وتویانـە، کـە دارایـی و ئاسـایش و لـەش ساخیـن
نـەیانزانی بـەجێهێنیش، بـە تـەنها خـودی لاوانـە

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٧٧) :

### (زێدەپۆزشت)

بانگـێ لـە دەروونمـەوە هـات، وتم: جـارێ ئـارام بگـرە[2]
کوانـێ مـردن لـە هـەزاری شیریـن تـرە؟
سەرجـەم تـەمـەنی گـەنجێتیم خـەرج دەکـەم
تـا بـە پاداشـتێکی نایـاب، یـان بـە پلـەی بـەرز دەگـەم
بـەدوای زانسـتا دەگـەڕێم، یـاخۆ دەمـرم لـە شـارێکدا
تـاوی فـرمێسک بڕێـژن خەڵکەکـەی بەسـەر گۆڕمـدا
ئـەی دەرونم دڵنیابـە کـە زانسـت میراتـێ نیـە بـۆت بێتـەوە
یـا لـە بـاوان و خـەزوران، بـۆ ئێـمە بگوازرێـتەوە
گـەنجی کەسـێك گەنجینەیـە کـە هـاتوو تەمەنـی هێنـا
لەگـەڵ فێربـوونی زانسـتا مانـدوو بـوو بەدەسـتی هێنـا
جـا ئەگـەر بـەوە گەیشـتبێ لـەناو خەڵکیـدا بـەڕێـزە

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٤٦.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٤٨.

لەو پێناوەدا بشمرێ، خەڵك بیانوی بۆی بەهێزە
کاتێ خەڵکی هەموو خەوتون، پەندەکانم چرۆ دەگرێ
ئەو ساتانە کاروانی شیعرەکانی من دەکەونە ڕێ
ئەی ڕەنجەڕۆیی نیە بۆم، بەرانبەری خۆم بێ خێر بم؟
شەو لە تەمەنم ئەژمار بێ و نەتوانم تیایدا فێریم؟

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٧٨) :

### (کۆچی پیاوانی پێشەنگ)

نەمان کەسانێ کە پێشەوا بوون[1]
بە کرداری جوان لە پێشمانا بوون
خراپەکاریش لە هەموو شوێنێ
هەر کاری بەدە خۆی پێ بنوێنێ
لەدوای ئەوانە، کەسانێ ماون
لەگەڵ یەکترا بەگژ وەستاون
چەرخ سوێندی خوارد هاوشێوەی ئەوان
بهێنێتەوە بۆ سەر ڕووی جیهان
سوێندەکەت شکا، چەرخی زەمانە
بڕۆ باجەکەی بدە ئازانە[2]

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٤٩.

(٢) ئازانە: ئازایانە.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٧٩) :

شافیعی ئەم هۆنراوەیەی بۆ خۆشەویستی پێغەمبەر د.خ دەربڕیوە:

### (ئەی چاو بەکل)

ئـــەی چـــاو بـــە کـــل، لـــەدوای خـــەوی تێـــری شـــەوت[1]
کـــە کـــل نـــەبـــوو بـــە پێناســـەیەك بـــۆ چـــاوت
ئـــەی زەمـــانە ئەگـــەر چـــاوم لـــە بـــالآتی هـــەڵ ئـــەڕوانی
دەمـــردم و تێـــر نـــەدەبووم، ئـــەمن لـــە تەماشـــای جـــوانی
نـــەخۆش بـــوو، زەمانەیـــەك، بـــاش زەمـــانم دانـــەنابوو
خەتـــای لێدابـــڕانم ســـەفەری پـــڕ لـــە بـــەلا بـــوو
ناردەیـــەکی بـــێ کەرەســـە کـــە بـــەرەو ڕووی مـــن هاتبـــێ
هـــەروەکو هەورێکـــە ئێستـــا کـــە بـــارانی تێـــدا نـــەبێ
لێگـــەڕێ بـــا پـــڕ بـــە چـــاوم تێـــر تەماشـــای ڕوخســـارت کـــەم
بـــە ڕونـــاکی ڕوخســـاری تـــۆ نـــەما تـــاریکی چـــاوەکەم

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٨٠) :

### (سزای کەسێ مەدە کە داوای لێبوردنی لێ کردویت)

ئەگـــەر هاوڕێکـــەت ڕۆژێ پۆزشـــتی هێنایـــەوە[2]
لـــە بەرانبـــەر هەڵەیـــەك کـــە ئێســـتا پەشیمانـــە
تۆڵـــەی لێ مەکـــەرەوە، لـــە هەڵـــەی گەڕایـــەوە
پێویســـتە لێـــی ببـــوری، کـــە ئـــەوە خـــووی ژیرانـــە

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٤٨.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٥١.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٨١) :

### (ئارامگرتن لەسەر تاڵ و شیرینەکانی قەدەر)

کـێ هەیـە تـوانبێتی، کـە تـەواو سرەوتبـێ[1]
لـەناخی دەروونـی خـۆی لـە تەنگانـەو خۆشیـدا؟
لەوانەیـە دەوڵەمەنـد، لەبـەر بوونـی سامـانی
چـەندەهاجار لـە هـەزار زیـاتر بـێ بەسەریـدا
هەژارەکـە، خـەمبارە، لەبـەر کـەمی دەرامـەت
دەوڵەمەنـدیش ماندویـە، لەدەسـت دەوڵەمەنیـدا
ئاوایـە بـەلاّ و هەرکـەس بـەشی خـۆی
ڕۆژانـە بـۆی دێ، یـان لـە مـانگێکدا
(پـەری)ش وەك مـرۆڤ هـەر حوکمـی قـەدەر
تـاڵ یـا شـیرینی دێـت بـەسەریـانـدا
ئەگـەر بیـەوێ گـوێیـەکیش هـەڵخا
لـە ئاسمانـەوە تیشکـێ لـێ ی ئـەدا
هەواڵبەریـشیـان ڕاستـکا، درۆیـە
قسـەی هـەر پوچـە، لەگـەڵ جـادوودا
خـواپەرستانـی بـەرەی پەریـەکان
تـاوانبـار دەکـرێـن لـەناو خۆیانـدا
مـوفتـی ئـەوانیـش لـە کێشـەدایە
لەنـاو ئـەو کـۆڕەی کـە ئـەوی تێـدا
دامـاو دەمێـنـێ هـەڵـەیـەك بـکا

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٥١.

کەسێ دانی خێر ناهێنێ پێیدا
دەسەڵاتداریان سەرسام دەمێنێ
لەو دڵڕەقیەی لە بریکاریدا
دیندارەکانیش لە دۆخ بێزارن
بە ئاواتەوەن شادبن لە گۆڕدا
زانیت پادشای پەریەکان چی کرد
لە پای بڵندی لە (سولەیمان) دا
کەبە هەواڵێك شادی پێ بەخشی
هەواڵی کۆشکیش خەمباری پێدا
بازرگانیشیان ترس دایدەگرێ
لەوەی کە نرخ زیانێکی لێدا
خێزانداریشیان خەمخۆری ماڵە
نەزۆکیان خەمیان زۆرە لە دڵدا
هاوەڵەکانیان ئێرەیی خوازن
چاوچنۆکیە وا لەناویاندا
کەسێ بیەوێ، تۆزێ بخەوێ
خەونێك دەبینێ خەوی تێکدەدا
کۆرپە، لە دایکی کە دێتە دنیا
لە شیر دادەبڕێ، هەنگاو هەڵدەدا
منیش ئێرەییم بە باڵندەیە
هێشتا بە یانەو خواش ڕۆزی دەدا
درندەی کێویش نامرن لە برسا
نەهەنگی دەریاش هەر خوا پێی دەدا

دورنیە کەمتیار بێنە سەر گۆڕێ
بیخۆن ئەو تەرمەی وا لەناویدا
برام ئیتر کوا چێژی ئەم ژینە
کە زاڵە ترس بەسەر هەموودا
بەخوا ئەگەر لاو هەزار ساڵ بژی
لەدەست خۆیدا بێ چی دێ بەسەردا
هەرچی بیەوێ چێژی لێ بکا
هەموو تەمەنی شادی بەرنەدا
وا باسی بکرێ لە ڕۆژگاری خۆی
کەسێ نەتوانێ بدوێ لە ڕوویدا
لەسەر هیچ شتێ پەکی نەکەوێ
خەم و پەژارەی نەیا بەسەردا
ئەمانە هەمووی نابن بە هاوتای
تەنها مانەوەی یەك شەو لە گۆڕدا
ئەی چۆن ڕزگار بی تۆ لەو خەمانە
ئارامت هەبێ لە تاڵ، شیریندا
ئەمانە هەردوك لە قەزادایە
کە خوا داناوە لە ڕێی ژینتدا

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٨٢)

ئەگەر دوو هاوسەر لە یەك خێزاندا بەخشندە بوون ئەوا ئەوماڵە لە دوو شوێنەوە خێرو بێری بەسەردا دەبارێ، بەتایبەتی کە ئەوان کەسێکی بەسۆز و دڵنەرم بن، چونکە سۆز هەموو تەنگەبەرانیەکی پێ پان دەبێ، هەمان ماڵ ئەگەر بۆ هەشت ئەندام یان هەشت میوان تەنگەبەر بێ، ئەوا بەهۆی سۆزەوە نۆیەمین کەسیش بە فراوانی جێی دەبێتەوە.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٨٢):

### (سۆز بۆ نزیکخستنەوەی دوور)

لەنێوان دوو بەخشندەدا، ماڵ، گەلێ فراوان دەبێ[1]

شتێکە سۆز، تەنگەبەری پێ پان دەبێ

ماڵێ، ئەگەر بۆ هەشت کەس، تەنگەبەرە

ئەوا سۆزیش، جێگەیەکە، کە بۆ نۆهەمین کەس دەبێ

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٨٣) :

### (نهێنی جەستە لە گیاندایە)

جەستە بنێرە ژێر زەوی، کە بێ سوودە و دەبڕێتەوە[2]

نهێنی گەورە گیانێتی، تێیدا بوو، دەشگەڕێتەوە

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٦١.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٦٢.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٨٤)

هەشت جۆرە کەس، کەسانی بێ نمودن، ئەگەر باسیشیان بکەیت، کەس ڕقت لێ هەڵناگرێ، چونکە ئەو کەسانە سووك و بێ نرخن، یەکەم کەس ئەو کەسەیە کە کەسانی گەورە و سەردار و سەرکردە لەگەڵی دەدوێ، بەبێ ئەدەبی و سووك و کەمیەوە وەڵامی دەداتەوەو بە چاوی کەم تەماشای دەکات.

دووەم ئەو کەسەی دەبێت بە ئەرك بەسەر خەڵکەوەو بەشداری ئەرکی خێزان ناکات، هەر دەخوات و داواکاری هەیەو جارێگ سوپاسی خوا ناکا و نزایەکی خێر بۆ خاوەن ماڵ و سفرە ناکات.

سێهەم: ئەو کەسەی کە قسە بە تەواوی نابیستێ و خۆی شتی تری پێوە دەنێ و بەم و بەوی دەگەیەنێ، چوارەم: ئەو کەسەیە دەچێتە کۆڕ و کۆمەڵێکەوە کە لە ئاستی ئەودا نیەو لێی تێ ناگات و نەسوود بەو کۆڕە دەبەخشێ و نە خۆشی سودیان لێ وەردەگرێ.

پێنجەم: ئەو کەسەیە بە حسابی خۆی سەرقاڵە بە ئەنجامدانی کارو ئەرکێکی خۆیەوە، بەڵام جۆرایەتی کارکردنەکەی نابەجێ و نەشیاوە، چونکە چەندە کارکردن هونەرە، ئەوەندەش شێوازی کارکردنەکەی هونەرە.

شەشەم: ئەو کەسەیە بەبێ پرس و ڕاو مۆڵەت و داواکاری خۆی دەکوتێتە ناو ئەو باس و خواسەی کە لەنێوان دوو کەسدایە، حەوتەم: ئەو کەسە نەجیب و کەسێتی بەرزەی کە داوای یارمەتی لە کەسێکی نامەرد و هەرچی و پەرچی دەکات، هەشتەم: کەس ئەو کەسەیە کە بەڕاوبۆچوونی دوژمنەکەی هەڵسوکەوت دەکات و سەرکەوتنی خۆی دەداتە دەست دوژمنەکەی.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٨٤):

### (کەسانی بێ نمود)

هەشـــت کـــەس، لـــە دنیـــا، ناویشـــیان بـــەری[1]
کـــــەس بـــــاست نـــــاکا، بــــە ڕقەبــــەری
کەســـێ کـــە لەگـــەڵ پادشـــــاو ســــەردار
ســـووك ســـەیری بکا،کـــە دێتـــە وتـــــار
ئـــەوەی لـــە مـــــالا مشـــەخـــۆرێکـــــە
هــــەر لێـــــی دەخـــــوات و نزایـــەك ناكـــا
ئـــەو کەســـەی بـــە گـــوێی خـــۆی نەبیســـتبێ
واش قســــــە بـــــەرێ، وەك مەبەســـــتی بــــێ
کەســـێك لـــە کـــۆڕێـــــك کــــــە دانیشـــتبێ
ئاســـتی کۆڕەکـــە لـــەو بـــەرزتـــــر بــــێ
کەســـــێك مشـــــووری کـــاری خــــــۆی هـــەبێ
بـــەڵام بـــە چەشـــنێ، لـــە جێـــی خـــۆی نـــەبێ

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٨٥) :

### (جواناوی خۆت)

شـــۆربای بـــڕوێش، بەنـانـــی جـــۆوە بخــــۆ[2]
بـــە پشـــتی ولاخـەکـــەت، بــــەرەو ئــــازادی بـــڕۆ
بـــەرێ کـــەوە، بـــە بیابـــانی ترســـدا، نزیـــك و دور

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٦٢.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٥٤.

بـــــەردەوام بــــە، هەتاكــــو دەگــەیتــــــە دەردوور[1]
ڕوخســـاری خـــۆت بپارێـــــزە، بـــە زەلیـــل مەیـــەرە كایـــە
ڕووبكـــــەرە ئــــەو خودایـــــەی، كــــەوا پـــاك و بەئاگایـــە

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٨٦) :

## (زەلیلی لە تێكەڵاوبوونی خەڵكانی نەشیاودایە)

پـــــــەی پێنابــــــەم، چـــێژی ســــــەلامەتی ژیـــــانم[2]
هـەتـــــا نەچمــــــە نــــــاو كــــــۆڕی كتێبــــــەكانم
زەلیلـــــی لــــــە تێكـــــەڵاوی خـــــەڵكانێكی نەشـــــیاوایە
دووربـــــە، لێیـــــان، بەشـــــت یـــــا (مـــیر) یـــا (پاشــــا)یە

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٨٧) :

## (ئازاد و كۆیلە)

قەناعــەت، ئەگــەر بــوونی بــێ، ئــەوا كۆیلــەش هــەر ئــازادە[3]
كەســێ كــە چــاوی تێــر نابــێ، ئــازادیش بــێ هــەر كۆیلەیــە
خـــــــۆت چـاوبرســـــــی ڕامــــــەهێنە لـــــــەم ژینــــــەدا
بەڕاســـتی ئـــەو ڕەوشـــتەیە، كـــە خوویـــەكی زۆر بـــەربادە

---

(١) دەردور، الدردور: دەرووبەكی سەر دەریای عەمانە كەشتی و بەلەم پەنای بۆ دەبەن لەكاتی نائارامی دەریادا.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٥٥.

(٣) دیوان/ مختار فوزي ص٦١.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٨٨) :

### (زەکاتی پلەو پایە)

لەسەرمە، کە زەکات بدەم، لەوەی لە بەردەستمدایە[١]
چاودێری و تکاخوازیمە، زەکاتم لە پلەوپایە[٢]
کە پرسا بووی[٣] بەڕاستی بەدوایدا برۆ
وەگەر نا باشتر تێکۆشە، تا سوود دێنێتەوە مایە

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٨٩) :

### (تکاکارم لەتۆ خوایە..!)

نازانم، چیم پێ ڕەوایە، بەڵام ئێستا تکاکارم
لە پایەی بڵندی خۆتا، پێم ببەخشی شکۆی کارم
کەسێ بیەوێ کە سوودێك بە هاوەڵەکەی ببەخشێ
ئەو دەزانێ دەبێ چی بکا، چۆنیش ڕەنجی بۆ بکێشێ

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٦٢.

(٢) واتە زەکاتی پلەوپایەت دوو شتە، چاودێری ئەرکەکانت و تکا و داوای لێبوردنی خودایی بۆ خۆت و ئەوانەی لەبەردەستی تۆدان.

(٣) پرسا: داواکار و شوێنکەوتەی ئاوات و خواستێك.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٩٠) :

### (هەموو بەتەمەنێك هەر دەبێ بمرێت)

لەبـــەر هێرشـــی مەرگـــدا، خـــۆڕاگریی ســــوودی نیـــە[١]

خـــۆ بەدەســـتەوە نـــەدانیش، ڕێگـــەی ڕزگاریـــوونت نیـــە

وا دەبیـــنم هـــەموو کەســـێ، گەرچـــی درێـــژ بـــێ تەمـــەنی

تـــاڵاوی مـــەرگ دەچـــێژێ، درەنـــگ و زوویـــە، چـــارنیە

چـــی زینـــدوویە، دەبـــێ بـــادەی مـــەرگی نـــۆشکا

ســـاتێـــك هەیـــە کـــە زەلیلـــە و هێـــزی نـــیە

ئـــادەمیـــزاد، ئـــەوا بـــۆ خـــوا مـــن پـــێم گـــوتی

مـــردن فێڵـــی لێ نـــاکرێ، فـــێڵ لـــە خـــۆکردن فـــێڵ نیـــە

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٩١) :

### (وازهێنان لە شەڕ خێرە)

هـــــەرجارێ، کـــــە دێتـــــە بـــــیرم

دائەچـــڵەکێم کاتـــێ ئـــەو قســـە دەبیســـتم[٢]

بـــە ڕووخۆشـــی خـــۆم دەنـــوێنم

تـــۆش پێـــت وایـــە ، شـــادم ئـــەوەت لێ دەبیســـتم؟

ئـــــەوە لەسەرســـــامیم نیـــــە

لادان لەشـــەڕ، خێـــری هێنایـــە بەردەســـتم

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٦٣.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٦٣.

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٩٢) :

### (ناوی ئێرەییبەرم نابەم)

کاتێ دیار نیم، ئێرەییبەر، ناوم بە خراپ دەهێنێ[1]
سوپاسی چاکەیشم دەکا، کە ڕووبەڕوو دەمدوێنێ
خۆم لە خراپە لادەدەم، پشت ملە، ناوی ناهێنم
خۆی لە خراپە لانادا، بە خراپە ناوم دێنێ

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٩٣) :

### (ڕای خۆت، بە کەسێ مەڵێ کە لێتی وەرناگرێ)

ڕای خۆت، بە کەسێ مەڵێ، کە لێتی وەرناگرێ[2]
بەوە، نە سوپاس ئەکرێی، نە ڕاکەت جێیەك ئەگرێ

## دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٩٤) :

### (ڕوناکی خۆر بۆ نابینا)

نوسراو، چ سوودی نیە، ئەگەر نەکرێتە بیستراو[3]
بیستراویش هەر بێ سوودە، ئەگەر نەکرێتە نوسراو
هەروەکو چۆن ڕوناکی بۆ کەسێکی نابینا
وەك خۆرەتاو، بێ سودە، کاتێ نابینا بێ چاو

---

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٦٤.

(٢) دیوان/ مختار فوزي ص٦٤.

(٣) دیوان/ مختار فوزي ص٦٤.

## دەروازەی هۆنراوەی ژمارە (١٩٥)

شافیعی خ.ل لەم هۆنراوەیەدا بەکوڵ لە خودای گەورە دەپاڕێتـەوە، موناجـات دەکات، داوای لێبوردن دەکات، پێم وایە ئەم هۆنراوەیە، شیاوە بـۆ ئـەوەی بکرێتـە سرودێکی ڕۆح پەروەریی.

### دەقی هۆنراوەی ژمارە (١٩٥):

### (ئەی ئەو کەسەی کە سکاڵا بۆ لای تۆیە)

ئەی ئەو کەسەی لە ویژدانا دەبینرێی و هەموو بیستراوێکیش لاتە[1]
هـەر تـــۆی کـە ئامـادەی دەکـەی هەرچـی ڕووداو و پێشـهاتە
ئـــەی ئـەو کەســەی تکـای هــەموو تکاکارێـك بـۆ لای تۆیـە
سکـــــاڵاو هـــاواری هــەمووان هــەر لای تۆیـان پـێ نەجاتــە
ئـەی ئـەو کەسـەی گەنجینـەی هـەموو ڕۆزییـەك لـە (بوون)تایـە
بمپارێـــــزە، هـــــــــەرچی کە خێر و خۆشـی بێ گشتی لاتـە
مـــــن جــگە لـــە کەم دەستیم و لـە هـەژاریم چـی شك نابـەم
هـــــەر نـــــەبوونی و کەمیەکەمـە لای تـۆ بـۆم جێگـەی نەجاتـە
جـــگە لـــەوەی کە لە دەروازەی تـۆ بـدەم چ دەرگایـێ تـرم نیـە
تـــۆش دەرمـــــکەی، ئیتـــر کـام دەرگایـە هەیـە جێی ئاواتـە؟
بـــە زەلیلـــــــی هـاتـــــوومە دەروازەی بڵـــــندی تـــــــۆ
چـاك دەزانم کـە زەلیلـیم لەبــەر دەرگاتـــــا سـەروەتــــــە
هەمـــــوو پشتیــــوانێـــــکم تـــۆی، بۆیـە دەسـتی پاڕانـەوەم
بـــــەرەو بــــارەگـــــای بەرزی تـۆ هێنـدە لـەرزۆك و شەکەتە
داوا لــــــە کێـــی تـــر کـەم ئیدی؟ نـاوی چ کەسێ تـر بێنم؟
کـــــە ڕێــــــز و گـەورەیی تۆیـە کەڵەکـە بـووی سـەر بەندەتـە

(١) دیوان/ مختار فوزي ص٦٧.

لـە گەورەیـــــی تـــــۆ نـــاوەشێ، کـە یـاخی نائومێـد بکـەی
شکـــــۆی تـــــۆ شـــــایستەتر و بەخشــینەکەت پێناســـەتە
دەسا تـۆ هـەقی ئـــەو کەسـەی خۆشـت دەوێ و پەیامبـەرە
تکـای دەگـری کەسـێ کـە تکاکارەکـەی محمـدی پێغەمبـەرە
لـــــە هـــــەمـــــوو تەنگانەیەکـدا دەرگـای ڕزگاریمـان دەرێ
لــوتـــفـــێ بـــە ئێمـە بفـەرموو، چـاوگی هـەموو شـتێ لاتـە
ئـــەوجـــا ســـــەڵاوات بفـەرموو لەسـەر سـەروەر و یـارانی
کــــــە چـاکتـــــرین تـــــکاخـــــواز و باشـترین تکاکارانتـە
* * *
پـــــەروەردگـــــارا، مـــن بەسمـــە، کـــەوا تـــۆ حــاڵم دەبینـــی
بـە گـــەورەییت قەدەغـــەی کـــە، شـــتێك بـــەخێر بـــۆم نـــابینی
پـــــەروەردگـــــارا بـــەڵای تـــۆ هـــات و ڕزگاریشـــت کـــردم
خراپـــــتر بـــووم بـــارودۆخم، هـــەر تـــۆی بەنـــدەت دەهـــەژێنی
پـــــــەروەردگارا هـــــەر ئـــەتۆی فەرمووتـــە بـــە بەنـــدەکانت
لێـــــم وەپـــــاڕێـــــــن، پـــــاڕامەوە، چـــاوەڕوانم وەمبـــوژێنی
پـــــەروەردگـــــارا بـــــــەلای تـــــــۆ ئاســـایە ڕۆژ نەکەیتـــەوە
تـــــــــۆ دەتـــوانی کـــات ڕاگـــری و ڕونـــاکی خـــۆر بوەســـتێنی
پـــــەروەردگـــــارا بـــەزەییت هـــەرگیز بـــە بـــەرم تـــەنگ نابـــێ
کاتـــێ پانتـــایی ڕەحمـــەتت لـــە هـــەموو شـــتێ زیـــاد دەنوێنـــێ
هـــــــەر تـــــــۆ زانـــای، منـــیش متمانـــەم بەتۆیـــە، ئـــیتر بۆیـــە
حـــاڵی خـــــۆم دەســـپێرم بـــە تـــۆ، کـــە بـــەرگریم بـــۆ دەهێنـــی
پـــــەروەردگـــــارا زەمـــــــانە، بـــە کەڵبـــەکانی گـــازی گـــرت
دەســـــــا لامـــــــــدە لـــە ڕووداوێـــك کـــە منـــی پـــێ دەترســـێنی

